مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان

وەحیی و واقیع دا

- کتێبی دووەم -

- تەوەری دووەم -

# هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری موسڵمانان

نووسینی

عەلی باپیر

## پێشکەش بێ

بە هەرکەسێك، کە بە شێوەیەکی شایستە عەقڵی خۆی لە بواری بیرکردنەوەدا بەکاردێنێ و، بە زەینێکی هۆشیارو دڵێکی بێدارەوە:

لە هەردووك کتێبی خوێندراوو بینراو (مَقروء و منظور)ی خوای پەروەردگارەوە ڕادەمێنێ و، سەرەنجام زانیاریی و شارەزاییەکی بەئامانج گەیەنەریان لێ وەدەست دێنێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ ..... ٤٦﴾ سبأ.

# پێشەکیی

## پێناسەو بەسەرهاتی پەیدابوونی ئەم مەوسووعەیە

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْيِ هَديُ مُحَمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ فِي النّار.

## خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم مەوسووعەیەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) کۆی ئەو چل و نۆ (٤٩) دەرسەیە کەبەندە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١) تاکو (٢٠١٧/٥/٥)دا، پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لە براو خوشکانم کردوون، لەخولێکدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوەو سەرجەم دەرسەکانیش لە کەناڵی تایبەتی بەندە لە یوتیوب:

www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwuuTQtJAAu-) (WqXQoCnKQqX2X دانراون[1].

شایانی باسیشە کە کۆی ئەو چل و نۆ دەرسە، لەلایەن برای دڵسۆزم کاك (قاسم سەلام)ەوە هێنراونە سەرکاغەزو تایپ کراون و، پاش چاو پێداگێڕانەوەی وردی خۆم، دووبارە هەڵەچن کراونەتەوە، تاکو بەم ئاکامە گەیشتوون کە دەیبینی، بۆیە بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینمی عەرز بکەم و، لەخوای بەخشەریش داواکارم بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

هەڵبەتە لەمێژیشە گەیشتوومەتە ئەوقەناعەت و بڕوایە، کە کێشەی گەورەی مسوڵمان و هۆکاری بنەڕەتیی دواکەوتوویی و پەرێشانییان لەم ڕۆژگارەدا، بریتیە لە کەمتەرخەمیی و کرچ و کاڵیی و پاشان بەجێماوییان لەبواری هزرو بیرکردنەوەداو، سەرەنجام بەهەڵە تێگەیشتن، بگرە زۆر جار سەرەوبن تێگەیشتنیان، لەزۆر بابەت و مەسەلەی دین و ژین!

بۆیەش بەپێویستم زانی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەوبارەوە بکەم، کە سەرەنجام ئەو بابەتەی لێ هاتەدی، کە هیوام وایە کەلێنێکی باش لەوبوارەدا بگرێ و، هۆکاری بەرچاو ڕوونبوونەوەیەکی باشی مسوڵمانان بێ لەوبارەوە.

---

(١) ناوونیشانی ئەوبابەتەی داوام لێکرابوو ئامادەی بکەم، بریتی بوو لە: (هزری ئیسلامیی) بەڵام بەو شێوەیەم گۆڕی، کە کراوەتە ناوونیشانی ئەم مەوسووعەیە، دواتریش حیکمەت و هۆکارەکەی دەخەینە ڕوو...

ئنجا بەمەبەستی ئاسانتر بەهرە لێوەرگیرانی ئەم مەوسووعەیە، هەرچەندە هەرپێنج تەوەرەکەی پێکەوە پەیوەستن، بەڵام بەباشم زانی هەمووی بەپێنج کتێب چاپ و بڵاوبکەینەوە، هەرتەوەرەی لەکتێبێکی سەربەخۆدا.

لەخوای بە بەزەیی و بەخشندەش داواکارم پیت و پێزێکی شایستە بخاتە ئەم مەوسووعەیەوە، بەهەر پێنج کتێب و تەوەرەکەیەوەو، ئەوئامانجەی بۆی لەبەرچاو گیراوە، بەباشترین بیهێنێتەدی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٠/ی ڕەجەب/١٤٣٩ك

٢٠١٨/٣/٢٧ز

هەولێر

## ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگارو واقیعێکدا، کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و بەزیندوویێتی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: لێك دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان، لە تێوەڕامانی وەحیی و چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەبینین.

ئەم واقیعەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، بەرهەمی ئەوەیە کە مسوڵمانان - بە شێوەیەکی گشتی- باش نەیانتوانیوە عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە کار، لە تێوەڕامانی وەحیی و لە سەرنجدانی واقیعدا، بۆیە من وەك هەوڵ و هەنگاوێك لەم بوارەدا، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە (٤٩) ئاڵقەدا پێشکەش بکەم، لەژێر ناوونیشانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا}و، سەرجەم ئەم بابەتەش دەکەین بە پێنج تەوەرە:

**تەوەری یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە چوار بەشی سەرەکیی پێك دێ:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەکی دیکەی نیزیکی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیرکردنەوە (تفكّر) لە ئیسلامدا.

**تەوەری دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.**

ئەم تەوەرەش لە سێ بەشی سەرەکیی و (٥١) کورتە باس پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** تایبەتمەندییە گشتییەکان، (٢٠) تایبەتمەندیی.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە عەقیدەییەکان، (١٧) تایبەتمەندیی.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ڕەوشتییەکان، (١٤) تایبەتمەندیی.

**تەوەری سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان.**

که سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمی جۆراو جۆرمان لێ هەڵبژاردوون و، لەبیست بەشدا خستوومانەنە ڕوو.

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەدەرییە.

٥- جەهمییە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەکان.

١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چواردە (١٤) گرووپیشمان لە باطینییەکان باسکردووە.

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفییەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

**تەوەری چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە پێنج بەشی بنەڕەتیی پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** بوونناسیی (علم الوجود- ontologu).

**بەشی دووەم:** ئیمان و عەقیدە.

**بەشی سێیەم:** تێڕوانینەکان (التصورات).

**بەشی چوارەم:** بەهایەکان (القیم).

**بەشی پێنجەم:** پێوەرەکان (الموازین).

**تەوەری پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراو جۆر.**

ئەم تەوەرەش لە دە (١٠) بابەت پێکهاتوە، کە هەرکامیان لەبەشێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی: فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینی (مشروعية التعددية الفكرية والسياسية والدينية).

**بەشی چوارەم:** هاووڵاتێتیی نامسوڵمانان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستەوەبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شورى)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** بنەما گرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنچینە سەرەکییەکانی دینداریيەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

# پێشەكی ئەم كتێبە

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەم كتێبی دووەمە لەمەوسووعەی: {بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا} تەوەری دووەمی بابەتی فراوانی {بیركردنەوەی ئیسلامیی...} دەگرێتە خۆی كە بریتیە لە:

{هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان} (الخطوط العامة لمنهج جمهرة المسلمين).

شایانی باسیشە ئەم كتێبە وێڕای {دەستپێكێكی گشتی} لە سێ بەشی سەرەكیی و، پەنجاو یەك (٥١) باس (مبحث) پێك دێ، بەم جۆرەی خوارێ:

**بەشی یەكەم:** تایبەتمەندییە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان (الخصائص العامة لمنهج جمهرة المسلمين) كە سەرجەم بیست (٢٠) تایبەتمەندیی گشتییمان هێناون، لە ژێر ناوونیشانی بیست باس (مبحث)دا.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە ئیمانیی و عەقیدەییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان (الخصائص الإيمانية والعقدية لمنهج جمهرة المسلمين)، كە لە ژێر ناوونیشانی حەڤدە (١٧) باس (مبحث)دا، حەڤدە تایبەتمەندیی ئیمانیی و عەقیدەیی بەرنامەو ڕێبازی جەماوەرو زۆرینەی ڕەهای مسوڵمانانمان خستوونە ڕوو.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ئاكارییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان (الخصائص الخلقية لمنهج جمهرة المسلمين)، لەم بەشەشدا لەژێر ناوونیشانی

(١٤) باس (مبحث)دا چواردە ئاکارو ڕەوشتی گرنگ و بنەڕەتیی جەماوەری مسوڵمانانمان خستوونە ڕوو.

کەواتە: بە تێکڕا (٢٠+١٧+١٤=٥١) پەنجاو یەك تایبەتمەندیی و نیشانەی جیاکەرەوەی ڕێبازو بەرنامەی زۆرینەو جەماوەری مسوڵمانان، لە هەموو بوارەکانی: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدەو، خواپەرستیی و پارێزکاریی و، ڕەوشت و ئاکارو، کۆمەڵایەتیی و، حوکم و سیاسەت و .... هتددا، لەم کتێبەدا خراونە ڕووو، تیشکی وەحیی و عەقڵ، یان شەریعەت و حیکمەتیان خراونەتە سەر.

بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە هەموو ئەو تایبەتمەندییە فیکریی و ئیمانیی و عەقیدەیی و ڕەوشتیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییانەی لەم تەوەری دووەمەی بابەتی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع) دا، خستوومانتە ڕوو، مەرج نیە یەك یەکیان تەنیا لە زۆرینەو جەماوەری مسوڵمانان (جمهرە المسلمین)دا بوونیان بووبێ و هەبێ و، تاقم و گرووپە داهێنەرو لادەرەکان بەگشتیی، لێیان بێبەش بن! بەڵکو بەگشتیی کەم و زۆر لە تێکڕای مسوڵمانانی ئەهلی قیبلەدا بوون و هەن، بەڵام تێکڕایان و بەشێوەیەکی شایستەو پێویست، تەنیا لەو زۆرینەو جەماوەرەی مسوڵماناندا بوون و هەن، کە شوێنکەوتووی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلی اللە علیە وسلم) و، هاوەڵە دڵسۆزو بەڕێزەکانی بە گشتیی و، چوار جێنشینە ڕاشیدەکانی (أبو بکرو عمرو عثمان و علی )و، بنەماڵەو خزمانی ڕاست و ساغیی، بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

بە دڵنیاییش ئێمەی مسوڵمان لەم ڕۆژگارەدا، لە هەموو کاتێك زیاتر حەوجێی ئەوەین کە هەرچی زیاتر ئەو ڕاستە شەقام و ڕێبازو بەرنامە تێرو تەواوەی پێغەمبەری خوا (محمد) (صلی اللە علیە وسلم) و پێشینی چاك (السلف الصالح)مان، لە هاوەڵان و خزمانی دڵسۆزو بەڕێزو ڕاست و ساغ و شوێنکەوتووانی ڕەسەنیان، لەسەری بوون و، بەپێی وی بەڕێوە چوون، لەبەر

چاومان ڕوون و درەوشاوەو ئاچووغ و ئاشکرا بێ، چونکە ئیسلام و مسوڵمانان - لەم ڕۆژگارەدا - وێڕای پیلان و نەخشەی جۆراو جۆری ناحەزانی دەرەکیی، لەگەڵ چەندان بیرۆکەو بۆچوونی لادەرانەو نامۆو ڕیزپەڕی نێوخۆییشدا دەستەو یەخەن.

خوا بە لوتف و بەزەیی و بەخششی بێ سنووری خۆی، سەرپەرشتییمان بکات و ئاگادارمان بێت و، لەلادان و خلیسکان لە ڕاستە شەقامی پێغەمبەرەکەی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) هاوەڵان و خزمانی بەڕێزو دڵسۆزی بەگشتیی و، بەتایبەت خەلیفە ڕاشیدەکانی و، خۆ بەدەستەوەدانمان بۆ ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکان و، بیرۆکەو بۆچوونەکانیان، بمانپارێزێ.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

١١ رجب ١٤٣٨ك

٢٠١٨/٣/٢٨

# دەستپێکێکی گشتیی

**خوێنەری بەڕێز!**

لەم تەوەری دووەمەدا دێینە سەر خستنە ڕووی هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان و، تایبەتمەندییەکانیان.

ئێمە لەتەوەری یەکەم لە بەشی دووەمدا لەژێر ناوونیشانی: {سەرنجدانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع}دا، گوتمان: دوای ئەوەی کۆمەڵێك هۆکار پەیدا بوون و، کۆمەڵێك گۆڕانکاریی و کارەسات و پێشهات لەنێوان مسوڵماناندا ڕوویاندا، لەسەردەتای تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامییدا و، ئەگەر بە وردیی بڵێین: لە ماوەی نیوەی دووەمی حوکمڕانیی خەلیفەی سێیەم (عوسمان)دا، خوا لێی ڕازی بێ، لەو کاتەوە ژمارەیەك گرووپ و تەوژمی فیکریی سەریان هەڵدا، بەڵێ لەو کاتەوە کە جیاوازیی و ناکۆکیی لەنێوان مسوڵماناندا پەیدا بوو، کۆمەڵێ بیرۆکەو تەوژمی فیکریی و سیاسیی سەریان هەڵدا، ئنجا ئێمە بەر لەوەی بێینە سەر سەرژمێری ئەو تەوژمە فیکرییانە، بەباشمان زانی باسی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان بکەین، کە هەر لەژێر ناوونیشانی {مسوڵمانان}دا خۆیان بینیوەتەوە، کە دیارە ئەوانی دیکەش یانی: ئەو تەوژمە فیکرییانەی کە ئەو گرووپانە هەڵیان گرتوون، هەر لە بازنەی مسوڵمانان دان، بەڵام بەزۆریی وایە ناوێکیشیان هەیە، پێی ناسراون، بۆ وێنە: خەواریج بە خەواریج ناسراون، شیعە بە شیعە ناسراوون، هەروەها موعتەزیلەو تا کۆتایی...، بەڵام {زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان} تەنیا یەك ناویان هەبووە پێی بناسرێن، ئەویش بریتی بووە لە {مسوڵمانان}[1].

---

(١) دوایی بۆتان باس دەکەم، ئەوە چی لەسەر هەڵدەچنرێ!

ئێستاش لەم دەستپێکە گشتییەدا، دەمەوێ بۆتان باسی سەرهەڵدانی زانستە ئیسلامییەکان بکەم، چونکە لە ئەنجامی ئەو زانستە ئیسلامییانەداو، جۆری تێگەیشتنی مسوڵمانان بۆ: قورئان و سوننەت و، عەقیدەو فیکرو، لایەنی ئەخلاق و تەزکییەو، لایەنی سیاسەتی شەرعیی و ...هتد، لەئەنجامی ئەوەدا، تەوژمە فیکرییەکان پەیدا بوون.

## ١)- تەفسیر کردنی قورئان و زانستەکانی قورئان:

یەکەم زانستێك کە مسوڵمانان لەسەرەتاوە هەوڵیان بۆی دەدا، بریتی بوو لە تێگەیشتنی قورئان، تەفسیر کردنی قورئان و زانستەکانی قورئان، ئنجا لەنێو زانستەکانی قورئاندا: خوێندنەوەکانی قورئان (قراءات) و، چاك خوێندنی قورئان (تجويد) کە دیارە هەر لەنێو بازنەی زانستەکانی قورئاندان.

یەکەمین زاناش کە بەشێوەیەکی بەرنامەیی و ڕێك و پێکتر لەوانەی پێش خۆی، دەست و پەنجەی نەرم کردبێ لەگەڵ هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی قورئان، (أبو جعفر الطبري) بوو، کە لە (٣١٠ك/ ٩٢٣ز) وەفاتی کردوەو، تەفسیرێکی داناوە بەناوی (جامع البيان)، هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە (أبو جعفر الطبري) بە پێشەوای تەفسیرکەران (إمام المفسرين) ناوی دەرکردوە، هەروەك پێشەوای مێژووزانان (إمام المؤرخين)یشە بەڕاستیی، بەڵێ (إبن إسحاق) و (إبن هشام) وەك دوایی باسی دەکەین، سیرەی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) نووسیوەتەوە، هەڵبەتە پێش (الطبري)ش کەسانی دیکەش هەبوون مێژوویان نووسیوەتەوە، وەك (إبن قتيبة)و کەسانی دیکەش، هەروەها تەفسیری قورئانیش هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە بەردەوام هەبووە، بەڵام (طبري) هەموو هەوڵەکانی پێش خۆی کۆکردۆتەوە، هەم لە تەفسیرو هەم لە مێژوودا، جگە لەوەش (طبري) یەکێك بووە لە سەرمەزهەبەکانیش، بەڵام دوایی شوێنکەوتووانی و ئەوانەی کە

لایەنگری بۆچوونەکانی ئەو بوون، وەك شوێنکەوتووانی ئیمامەکانی دیکە، ڕاو بۆچوونەکانیان کۆ نەکردۆتەوەو وەك مەزهەبێك نەماوەتەوە، ئەگەرنا پێشیّ لە شاری بەغدادا، مەزهەبێکی بەناوی هەبووە.

## ٢)- کۆکردنەوەی دەقەکانی سوننەت:

زانستی دووەم بریتی بووە لە کۆکردنەوەی دەقەکانی سوننەت، پێشتر باسمان کرد کە زانایان لە سەدەی یەکەمی کۆچیی بەملاوە، بەوردیی لەسەردەمی (عمر بن عبدالعزیز)دا، کە ئەویش لە کۆتایی سەد ساڵی یەکەمی کۆچییدا وەفاتی کردووە، لەسەردەمی خۆیدا فەرمانی کرد کە دەقەکانی سوننەت کۆ بکرێنەوە، کە پێشتر هەم لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هەم لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدییەکاندا، بۆ ئەوەی لەگەڵ قورئان تێکەڵ نەبیّ، ڕێگریی لیّ کرابوو، بەڵام دوایی کە زانییان تازە قورئان جێی خۆی گرتووە لەگەڵ سوننەتدا تێکەڵ نابیّ، (عمر بن عبدالعزیز) دوای (إستخارة) و ڕاوێژکردن (إستشارة) فەرمانی کرد بە کۆکردنەوەی دەقەکانی سوننەت، کە وەك پێشتر —لەتەوەری یەکەمدا- باسمان کرد، دوا ئاڵقە بۆ کۆکردنەوەی سوننەت، لەسەر دەستی خاوەنانی شەش کتێبەکان (أصحاب الكتب الستة) بوو، بەر لەوانیش پێشەوا (مالك) و کتێبەکەی (الموطأ)، بەڵام دیارە کتێبەکەی (مالك) تەنها دەقەکانی سوننەت نەبووو فیقهیشی تێدایە.

ئنجا (إبن شهاب محمد الزهري) یەکەمین کەس بووە کەفەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی، یان دەقەکانی سوننەتی کۆ کردۆتەوە، بە فەرمانی (عمر بن عبدالعزیز) خوا لێیان خۆشبیّ.

### ٣)- ڕوونکردنەوەی دەقەکانی سوننەت:

ئنجا زاستێکی دیکە سەری هەڵدا کە بریتیی بوو لە: (ڕوون کردنەوەی دەقەکانی سوننەت)، (شروح السنّة) هەروەها زانستەکانی فەرموودەناسیی (علوم الحديث)، کە بە بۆچوونی بەندە: دوا هەوڵی زانایان بۆ ڕوونکردنەوەی دەقەکانی سوننەت و، ئەو یاسایانەی لێیان هەڵدەهێنجرێن و، چۆنیەتی بەیەکەوە گونجاندنی دەقەکانی سوننەت و لەگەڵ قورئاندا، دوا هەوڵ، بە نسبەت (صحيح البخاري)ەوە، لەسەر دەستی (إبن حجر العسقلاني) کتێبەکەی (فتح الباري) بوو، کە شەرحی (صحيح البخاري)ە، کتێبێکی قەبارە گەورەیە، دەریایەکی پڕ گەوهەر و مرواریی یە، هەروەها شەرحی (صحيح مسلم)ی (النووي)یش لەو بارەوە سەرچاوەیەکی مەزن و نایابە، هەڵبەتە کتێبەکانی دیکەش هەموویان ڕوونکردنەوەیان بۆ کراوە، بەڵام ئەم دوو زانایە (النووي) بۆ شەرحی (صحيح مسلم) و (إبن حجر العسقلاني) بۆ شەرحی (صحيح البخاري) کاری زۆریان کردوە، بۆ وێنە: (إبن حجر) کاتێ فەرموودەکانی (صحيح البخاري) ڕوون دەکاتەوە، فەرموودەکانی دیکەی پەیوەست بە بابەتەکەوەش دەهێنێ، لە کتێبەکانی دیکەی سوننەت، هەروەها (النووي)یش بەهەمان شێوە.

ئنجا لە بواری زانستەکانی فەرموودە ناسییدا، پێم وایە (إبن صلاح الشهرزوري) کە خەڵکی شارەزووری خۆمان بووە، بەدامەزرێنەری زانستی فەرموودە ناسیی دادەنرێ، کتێبێکی هەیە بەناوی: (مقدمة في معرفة أنواع الحديث) و کتێبێکی دیکەشی هەیە بەناوی (أدب المفتي والمستفتي)، کە ئەمەیان زیاتر لەبواری فیقهیی دایە.

٤)- زانیاریی زمان:

زانیارییەکی دیکە کە زۆر بڵاوە[1]، بریتیە لە زانیاریی زمان، چ لە ڕووی مانای وشەکانی زمانی عەرەبیی، چ زانستی ڕێزمانی عەرەبیی (قواعد)، چ ڕەوانبێژیی (البلاغة)، لەو بوارەشدا، زانایان و شارەزایان سەدان کتێبیان بەرهەم هێناوە، یەکەمین کتێبێك بۆ شیکردنەوەی مانای وشەکانی زمانی عەرەبیی نووسرابێ (کتاب العین)ە، کە هی (خلیل بن أحمد الفراهیدي) یە، کە لە ساڵی (٧٨٦ز)دا وەفاتی کردوە، هەروەها لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە یەکەمین کتابێك نووسرابێ (الکتاب)ی (سیبویه)یە، کە ناوی (أبو بِشر عمر بن عثمان)ەو لە ساڵی (٧٩٦)ز دا وەفاتی کردوە.

٥)- زانیاریی (فقه) و (أصول الفقه):

فقه: بریتیە لەوەی ئەو ئایەتە، یان ئەو دەقەی سوننەت، چی لێ وەردەگیرێ، لە ڕووی یاسا کردەییەکانەوە؟ (فقه) جیاوازیی چییە لەگەڵ (علم التوحید) یان (علم التزکیة)دا؟ (فقه) زیاتر باسی کردەوە ڕواڵەتییەکانی خەڵك دەکات، ئنجا (أصول الفقه) بنچینەکانی فقه، ئەویش باسی ئەوە دەکات: ئەو یاسا شەرعییانە، چۆن و بە چ بەڵگەیەك هەڵدەهێنجرێن و، بەڵگەمان چییە کە ئەو دەقە، ئەو یاسا شەرعییەی لێ وەردەگیرێ؟

زانایان دەڵێن: (محمد بن إدریس الشافعي) کە لە ساڵی (١٥٠ك)دا لە دایك بووەو لە (٢٠٤ك)دا وەفاتی کردوە، بە دامەزرێنەری زانیاری (أصول

---

(١) ئەو زانستانە مەرج نیە هەر لەسەدەی یەکەم و دووەمەوە، دەستیان پێ کردبێ، بەڵکو وردە وردە چەکەرەیان داوەو گەشەیان کردوە.

الفقه) دادەنرێ، کتێبێکی هەیە بە ناوی (الرسالة)[1]، بەنسبەت فیقهیشەوە، وەك زانایان دەڵێن: (أبو حنیفة) کە لە ساڵی (١٥٠ك)دا وەفاتی کردوە، یەکەم کەس بووە کە فیقهی دابەش کرد بۆ بابەتەکان (أبواب)و بەشەکان (أقسام) و پۆلێنی کرد.

### ٦)- زانیاریی ئیمان و عەقیدە:

ئەویش وردە وردە سەری هەڵداو گەشەی کرد، یەکەم کتێبێك لەبواری عەقیدەدا نووسرابێ کتێبەکەی (أبو حنیفة)یە بەناوی (الفقه الأکبر)، ئنجا بۆ زانیارییتان: هەندێ کەس وا دەزانن وشەی فیقە، تەنها ئەو زانیارییە دەگرێتەوە کە باسی یاسا کردەییەکان دەکات، بەڵام لە بەکارهێنان و قورئان و لەبەکارهێنانی سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و، زانایانیش ئەم وشەیان بەکار هێناوە، بۆ تێگەیشتنی کۆی قورئان و سوننەت، لە هەموو ڕووەکانەوە، چ لە ڕووی یاسا کردەییەکان، چ لەڕووی یاسا عەقیدەییەکان، چ لە ڕووی تەزکیەو ئەخلاق و، چ لە هەر ڕووێکەوە، وشەی (فقه) یان بەکار هێناوە، بەڵام دوایی وردە وردە ئەم وشەیە کرا بە ناوونیشان، بۆ ئەو حوکمانەی کە پەیوەستن بە لایەنی کردەیی مرۆڤـەوە.

دواتر زانیاریی ئیمان و عەقیدە خرایە ژێر چەند ناوونیشانێك، وەك: (أصول الدین، التوحید، العقیدة، علم الکلام).

---

(١) جێی سەرنج ئەوەیە کە (شافعي) لە (الرسالة)دا، باسی وشەی (أصول الفقه)ی نەکردوە، بەڵام کتێبەکەی هەمووی دەربارەی (أصول الفقه)ەو کتێبێکی زۆر گرنگە.

٧)- زانیاریی تەزکیەو ئەخلاق:

ئەم زانستەش پەیوەندیی بە دیوی پەنهانی مرۆڤەوە هەیە، ئەگەر (فیقە) پەیوەندیی بە لایەنی کردەییەوە هەیەو، زانستی خوا بەیەکگرتن (علم التوحيد)، پەیوەندیی بە لایەنی عەقیدەییەوە هەیە، زانیاریی تەزکیەو ئەخلاق، پەیوەندیی بە لایەنی مەعنەویی مرۆڤەوە هەیە، لەو لایەنە دەکۆڵێتەوە.

ئەو زانستەش هەر لەسەردەمی هاوەڵانەوە وردەوردە گەشەی کردوە، چونکە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە پەرستشەکانەوە، بۆ وێنە: نوێژ دەکەی، چۆن چۆنی بیکەی؟ قورئان دەخوێنی، چۆنی بخوێنی؟ ڕۆژوو دەگری، چۆن چۆنی بیگری؟ ڕەنگە یەکەمین کەسێ کە لەو بارەوە شتی نووسیبێ (الحارث بن أسد المحاسبي: ٢٤٣ك/٨٥٧ز) بووبێ و، هەر وشەی (المحاسبي) کە نازناوی بووە، لەبەر ئەوە بووە کە زۆر سەرکۆنەی نەفسی خۆی کردوەو، چەند کتێبێکی هەن لەو بارەوە وەك: (التفكّر والإعتبار، الرعاية، شرح المعرفة) ئنجا هەرچەندە زانایەکی بەرز بووە، بەڵام پێشەوا ئەحمەد بە حوکمی سروشتەکەی خۆی، کە زیاتر (دەقگەرا) بووە، دانووی لەگەڵ (محاسبي)دا نەکوڵیوەو بە خەڵکی گوتوە: لێی وریا بن! چونکە باسی هەندێ شت دەکات، سەلەفی صالح باسیان نەکردوە! کە من تێبینییم هەیە لەسەر ئەوەو دوایی ڕەنگە باسی بکەم، چونکە مسوڵمانان کە تێکەڵ بوون لەگەڵ میللەتانی دیکەدا، لەگەڵ ڕۆم و فارس و چیندا، ناچار بوون هەم لەڕووی ئیمان و عەقیدەوە قسەی تازە بکەن، هەم لەڕووی فیقهەوە، هەم لەڕووی سیاسەتی شەرعییەوە، هەم لە ڕووی تەزکیەوە ئەخلاقەوە، لە هەموو ڕووەکانەوە...، ناچار بوون هەندێ شت باس بکەن کە پێشووەکان باسیان نەکردوە، لەبەر چی؟ چونکە ئاسانە تۆ لە ماڵی خۆت دابنیشی و دەربەست نەبی داخۆ کێ بە ئیسلامەوە پابەند دەبێ و، ئیسلامی قبووڵەو، کێ قبووڵی نیە؟ وەك هەندێ خەڵکی {سەلەفیی ناو} کە ئاوا بیر دەکەنەوەو ڕەفتار دەکەن، بەڵام تۆ بتەوێ دین بهێنیەوە نێو ژین، دەبێ بەپێی عەقڵی خەڵك قسان بکەی و،

هەوڵ بدەی تێیان بگەیەنی و، وەڵامی ئیشکالەکانیان بدەیەوە، ئنجا زانایان کە کۆمەڵێ کتێبیان نووسیون لە ڕووی ئەخلاقەوە، لەڕووی سیاسەتی شەرعییەوە، لە ڕووی عەقیدەوە، لەخۆوە وایان نەکردوەو واقیعەکەیان پاڵی پێوەناون، بۆیە هەندێ لە زانایان کە جۆرێ لە داخرابییان هەبووە، ویستوویانە ئەوەی کە هەیە پارێزگاریی لێ بکەن و، هیچی دیکەی بۆ زیاد نەکەن، کە دانوویان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا نەکولاوە، بەبۆچوونی من نەیانپێکاوە.

ئنجا پێم وایە فراوانترین و باشترین کتێبێك لەو بارەوە نووسرابێ کتێبی: (إحياء علوم الدين)ی (أبو حامد الغزالي)یە کە لە ساڵی (٥٠٥ك)دا وەفاتی کردوە، کە بێگومان تێبینییش لەسەر ئەو کتێبە هەن، بەڵام ئەو هەوڵی داوە هەرچی لەپێش ویدا گوتراوە، هەمووی بێنێ، هەڵبەتە لە بێژینگیشی داوە، بەڵام بەتەئکید سەرکوێژرو شتی خراپیشی ڕەگەڵ کەوتوە، بەتایبەتی کۆمەڵێك دەقی سوننەتی هێناون، کە هێندێکیان هەڵبەستراون و هەندێکیان بێهێزن، بەڵام ئینکاریی ناکرێت کە ئەو کتێبە کتێبێکی زۆر گەورەیە، سەرچاوەیەکی زۆر پڕ گەوهەرو مرواری زانستی تەزکیەیە، کە بە زانستی تەصەووفیش ناوی دەرکردوە[1].

## ٨)- زانیاریی سیرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و مێژووی مسوڵمانان:

یەکەمین کەس کە لەو بارەوە نووسینەکەیمان کەوتۆتە بەردەست (إبن إسحاق)ە، کە ناوی (أبو بكر محمد)ەو لە (١٥١ك/ ٧٦٨ز)دا وەفاتی کردوە، خاوەنی (السيرة النبوية)یە، ئنجا دوای ئەو (إبن هشام) هاتوە کە ناوی (عبدالملك) بووەو لە (٢١٣ك/ ٨٢٨ز)دا وەفاتی کردوە، ئەویش کتێبێکی هەیە بەناوی: (السيرة النبوية لابن هشام)، کە کتێبەکەی (إبن إسحاق)ی هێناوەو بۆخۆشی

---

(١) هەڵبەتە ئێمە دوایی بەتەفصیل لەو بارەوە قسە دەکەین.

هەندێ شتی خستۆتە سەرێ، ئەوە یەکەمین کتێبێك بووە لەبارەی ژیاننامەی پێغەمبەردوە (صلى الله عليه وسلم).

دوایی (أبو جعفر الطبري) لەبارەی مێژووەوە (تأريخ الأمم والملوك)ی نووسی، هەروەها (إبن كثير) (٧٠١-٧٧٥)ك (١٣٠٠- ١٣٧٢)ز، خاوەنی کتێبی (البداية والنهاية) و (إبن الأثير) (عزالدين علي: ١١٦٠- ١٢٣٨ز) خاوەنی (الكامل في التأريخ)، ئنجا دوایی دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوو (عبدالرحمن بن خلدون) (١٣٣٢-١٤٠٦ز)، خاوەنی کتێبی (المقدمة)، کە مێژونووسان دەڵێن: (إبن خلدون) بە دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوو دادەنرێ.

### ٩)- زانیاریی سیاسەتی شەرعیی و حوکمڕانیی:

لەو بارەوەش زانایان بەرهەمیان زۆرن، کە پێم وایە ئەمانە سەرەکییەکانیانن و، هەوڵیش دەدەم بەپێی ڕیزبەندیی کاتی نووسرانیان، ڕیزیان بکەم:

١) (الخراج)ی (أبو يوسف) کە لە ساڵی (١٨٢ك)دا وەفاتی کردوە، ئەم کتێبەشی بۆ یەکێك لە حوکمڕانەکانی دەوڵەتی عەبباسیی، کە ناوی (أبو جعفر المنصور) بووە، نووسیوە.

٢) (الأموال)ی (أبو عبيد القاسم بن سلام) کە لە ساڵی (٢٢٤ك)دا وەفاتی کردوە.

٣) هەروەها کتێبی (السِّيَرُ الكبير)ی (محمد بن حسن الشيباني) کە لە ساڵی (١٨٩ك)دا وەفاتی کردوەو، دوایی (السَّرَخْسي) ئەو کتێبەی بە کتێبی (المبسوط) شەرح کردوە.

٤) (الإمامة والسياسة)ی (إبن قُتَيْبة الدينوري) کە لە ساڵی (٢٧٦ك)دا وەفاتی کردوە، هەرچەندە هەندێك تۆمەتباری دەکەن بە شیعەگەرێتیی.

٥) (الأحكام السلطانية)ی (الماوردي) کە لە ساڵی (٤٥٠ك)دا وەفاتی کردوە، هەڵبەتە (أبو يعلى)ش هەیە کە زانایەکی حەنبەلییە، ئەویش کتێبێکی هەیە هەر بەم ناوەوە (الأحكام السلطانية) هاوچەرخیش بووە لەگەڵ (الماوردي)دا.

٦) (إمام الحرمين الجويني) کە لە ساڵی (٤٧٨ك)دا وەفاتی کردوەو کتێبەکەی بەناوی (غياث الأمم في التياث الظلم)ە، ئەو کتێبە زۆر بیرو بۆچوونی تازەی تێدان و، بەکەڵکی ئەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەش دێ.

٧) (أبو حامد الغزالي) کە لە ساڵی (٥٠٥)ك وەفاتی کردوەو کتێبی (التبر المسبوك في نصيحة الملوك)ی نووسیوە.

دواتر زۆر لە زانای دیکە لەو بارەوە کتێبیان نووسیون وەك:

٨) (سراج الملوك)ی (الطرطوشي) کە لە ساڵی (٥٢٠ك)دا وەفاتی کردوە.

٩) (الشفاء في مواعظ الملوك والخلفاء)ی (إبن الجوزي) کە لە ساڵی (٥٩٧ك) دا وەفاتی کردوە.

١٠) (السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية)ی (إبن تيمية) کە لە ساڵی (٧٢٨ك)دا وەفاتی کردوە.

١١) (تحرير الأحكام في تدبير أهل الإسلام)ی (بدرالدين بن جماعة: ٧٣٣ك).

١٢) (الطرق الحُكْميه في السياسة الشرعية)ی (إبن قيم الجوزية: ٧٥١ك).

١٣) (المقدمة)ی (عبدالرحمن بن خلدون: ٨٠٨ك).

١٤) (مآثر الإنافة في معالم الخلافة)ی (القلقشندي: ٨٢١ك).

١٥) (بدائع السلك في طبائع الملك)ی (إبن الأزرق: ٨٩٦ك).

بەڵام ئەوانە زۆربەیان بەپێی ئەو واقیعەی کە خۆیان تێیدا ژیاون، دواون و، زانیاریی سیاسەتی شەرعیی زۆر کارتێکراو بووە بەو واقیعە سیاسییەی کە ئەو

زانایە تێیدا ژیاوە، بۆ وێنە: ئەو کتێبانە هەموویان کە دێنە سەر ئەوەی حوکمڕان چۆن حوکم بەدەستەوە بگرێ؟ مسوڵمانان چۆنی دیاریی دەکەن؟ دەڵێن: سێ ڕێگا هەن:

١- ڕاوێژ (شورى).

٢- ڕاسپاردن (ولاية العهد).

٣- حوکمڕانی زاڵیەتیی (ولاية المتغلِّب).

یانی هەرکەسێ دەسەڵاتی هەبوو دەبێ بە قسەی بکرێ، (من اشتدَّتْ وطأَتهُ وَجَبَت طاعَتُه)!

بەڵام لە ڕاستییدا وەك لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە، ڕێی بوونە حوکمڕان و بوونە بەرپرس، هەر یەك ڕێیە:

﴿ .. وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى.

بەڵام هەردووك ڕێی دووەم و سێیەم، کە هەموو کتێبەکان هێناویانن، زیاتر ڕەنگدانەوەی واقیعی ئەوکات بوون، هەر لەسەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە، کە بەیعەتی بەزۆر بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، حوکمی میراتیی (ولاية العهد) لەوێوە هات، ئنجا هەرچەندە موعاویە خوا لێی خۆشبێ، بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە کە ئەبو بەکر عومەری خوا لێیان ڕازی بێ، ڕاسپاردوە، بەڵام وەك (إبن تيمية) دەڵێ: (ئەوەی ئەبو بەکر تەنها پێشنیار کردن بووەو، ئەگەر خەڵك بەیعەتیان بە عومەر نەدابووایە، بەوە کە ئەبو بەکر پێشنیاری کردوە، نەدەبوو بە خەلیفە، چونکە خەڵك ئەبو بەکریان هەڵبژاردوە، بەڵام نەیانکردوە بە وەکیل کە خەلیفەی دوای خۆیشی بۆ وان هەڵبژێرێ)[1]، کەواتە: ڕاسپاردنەکەی ئەبو بەکر تەنها پێشنیار بووەو، دواتریش خەڵکەکە پێشنیارەکەیان پێ باش بووە.

---

(١) منهاج السنة النبوية، في نقض كلام الشيعة القدرية، ج١ ص٥٣١.

ئەوەی دیکەشیان کە هەرکەسێ دەسەڵاتی هەبوو، دەبێ بە قسەی بکرێ! ئەوە هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیە، ئنجا سەیر ئەوەیە (أبو عباس السفاح) و (أبو جعفر المنصور)ی برای کە شۆڕشیان کردو سەرکەوتن، ئەو جۆرە زانایانە گوتیان: ڕەوایەتییان هەیە، بەڵام (حسین بن علي) کە لە کەربەلا شەهید کرا، هەروەها (زید بن علي بن الحسین بن علي بن أبي طالب) و (عبدالرحمن بن الأشعث) کە ڕاپەڕیون، لەبەر ئەوەی کە سەرکەوتوو نەبوون، بەشێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوان بەهەڵەدا چوون، بەڵێ هەندێکیان گوتوویانە: کۆششێکیان کردووەو پاداشتێکیان هەر هەیە، بەتایبەت بۆ حوسەین خوا لێی ڕازی بێ!! کە لەڕاستییدا ئەوە جۆرێکە لە پراگماتیزیی و میکیاڤیلیەت، کە هەرکەسێ سەرکەوت بڵێی: ڕەوایەتیی هەیەو، ئەوەی سەرنەکەوت، بڵێی: ڕەوایەتیی نیە!.

ئەمانە سەرەکییترین ئەو زانستانە بوون، کە زانایانی ئیسلام بەرهەمیان هێنان، کە بێگومان دەگونجێ باسی گەلێك جۆرە زانستی دیکەش بکەین، بەڵام ئەمانە سەرەکییەکانیانن.

## گرنگترین تەوژمە فیکرییەکان

ئەو تەوژمە فیکرییانەی لە مێژووی مسوڵماناندا پەیدا بوون، جگە لە زۆربەو جەماوەری مسوڵمانان، ئێمە بیست (٢٠)مان لێ سەرژمێر کردوون، کە سەرەکییەکانیان[1].

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەددەرییە.

٥- جەهمییە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەکان.

---

(١) وەك دوایی باسی دەکەم: لەدواییدا هەندێکیان ناوی (أهل السنة)یان بۆ بەکار هێناوە، یان ناوی (أهل السنة والجماعة)یان بەکار هێناوە، کە لە ڕاستییدا ئەو ناوانە کاردانەوەی (أهل البدع) بووە، ئەگەرنا ناوی جەماوەری مسوڵمانان، تەنیا (مسوڵمانان) بووە، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چواردە (١٤) گرووپیشمان لە باطینییەکان باسکردوون:

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفیەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

ئنجا ئێمە تەوەری سێیەم تەرخان دەکەین بۆ قسەکردن لەبارەی ئەو بیست (٢٠) تەوژمە فیکرییەی جیا لە جەماوەری مسوڵمانان، بۆیە لێرە - لەم تەوەری دووەمەدا- تەنیا قسە لەبارەی زۆربەو جەماوەری مسوڵمانان (جمهور المسلمين)ەوە، دەکەین:

## جەماوەری مسوڵمانان

## ( جمهور المسلمين )

هەر لە سەرەتاوە زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، لەژێر ناوی {مسوڵمانان} دا کۆبوونەتەوەو[1]، هەر ئەو نازناوەشیان بۆخۆیان بەکار هێناوە (أهل الإسلام) یاخود {کۆمەڵی مسوڵمانان}، حەزیان نەکردوە هیچ ناوێکی دیکە بەکاربێ، خۆشیان پاڵ نەداوەتە لای غەیری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام دوایی کە ئەو گرووپانەی دیکە پەیدا بوون، زۆربەی مسوڵمانان بە نازناوی: کۆمەڵ (الجماعة)، یاخود پەیڕەوانی ڕێباز (أهل السنة) یانی: ئەوانە کە ڕێبازی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) گرتوە، ناسران، دواتریش بە: (أهل السنة والجماعة)، کە بێگومان ئەو ناوانە هیچیان هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەت نین، واتە: نە خوا سبحانه و تعالى ئەو ناوەی لە مسوڵمانان ناوە، ئەو مسوڵمانانەی کە شوێنی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەکەون، نە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، بەڵکو مسوڵمانان بۆخۆیان ئەو ناوەیان بەکار هێناوە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ ..هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا ..﴿٧٨﴾ ﴾ الحج

---

(١) بۆیە ئەوەتان بۆ باس دەکەم، چونکە (أهل السنّة) ئەو ناوە نیە کە خوای پەروەردگار، یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مسوڵمانانی نابێ، بەڵکو بەکارهێنانی ئەو ناوە، کاردانەوەیەك بووە بەرامبەر بەوانەی لایانداوە، ئەو گرووپ و تاقمانەی بە هۆکاری جۆراو جۆر، خۆیان جیا کردەوەو ناوونیشانی جیاجیایان بەکارهێنان.

واتە: خوا ناوی لە ئێوە ناوە مسوڵمانان، لەوەو پێش (واتە: لە کتێبە پێشووەکاندا)و لەمەشدا (واتە: قورئان).

ئنجا زۆر گرنگە بزانین: ئێمە تاکە ناوێك کە شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خواو ئەهلی ئیسلامیان پێ دەناسینەوە، بریتیە لە: {مسوڵمانان}، چونکە ئەوە دوایی زۆر شتی لەسەر بینا دەکرێ، با لەو بارەوە تەماشای قسەی هەندێ لە زانایان بکەین:

١- {عن ابن عباس: قال لي معاوية رحمة الله عليه: أنت على مِلّة عَلي رحمة الله عليه؟ قُلت: لا، ولا عَلى مِلّة عُثمان، أنا على ملّة رسول الله صلى الله عليه وسلم}(١). واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: موعاویە پێی گوتم: تۆ لەسەر ڕێبازی عەلی؟ گوتم: نەخێر، هەروەها لەسەر ڕێبازی عوسمانیش نیم، من لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم).

٢- {قالَ مَيمون بن مهران: إيّاكُم وكُلَّ اسْمٍ يسمّى بِغير الإِسلام}(٢)، واتە: خۆتان بپارێزن لە هەر ناوێك جگە لە ناوی ئیسلام.

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا گوتوویەتی: {إيّاكم وكُلَّ هَوىً يسمّى بِغير الإِسلام}(٣). واتە: هەر ئارەزوویەك غەیری ناوی ئیسلامی لەسەر بێ، خۆتانی لێ بپارێزن.

٣- {قالَ الإمام مالِك: أَهل السُنّة الّذينَ لَيس لَهم لَقَب يُعْرَفونَ بِه، لاجَهَميٌّ وَلا قَدَريٌّ وَلا رَافِضيٌّ}(٤). واتە: ئیمام مالیك گوتوویەتی: ئەهلی سوننەت، (واتە: ئەوانەی بەدوای ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەون) هیچ نازناوێکیان نیە پێی بناسرێن، نەناوی جەهمیی، نە قەدەریی، نە ڕافیزیی.

---

(١) الإبانة الكبرى، لابن بطة ج١-ص ٣٥٥، شرح أصول اعتقاد أهل السنة، اللالكائي ج١ ص٩٤.

(٢) الإبانة الصغرى، لابن بطة ص ١٣٧، والإبانة الكبرى ج١ ص ٣٤٢، ٣٥٤- قال الجديع: إسناده حسن في {أضواء على حديث افتراق الأمة}، ص٧١.

(٣) الإبانة لابن بطة ص ٢٨٢.

(٤) الإنتقاء في فضائل الثلاثة الأئمة الفقهاء، لابن عبدالبر، ص ٣٥.- وترتيب المدارك، لقاضي عياض ج١ ص١٧٢.

هەڵبەتە ئەو ناوانە لەسەردەمی ئەودا مەشهوور بوون، ئەگەرنا ئەگەر وەك ئێستا بووایە: مەدخەلیی و سەلەفیی و وەهابیی و صۆفیی و چی و چی و هتد، ئەوانەشی بەکار دەهێنان.

٤- قال ابن تيمية: {وَالْوَاجِبُ عَلَى الْمُسْلِمِ إِذَا سُئِلَ عَنْ ذَلِكَ أَنْ يَقُولَ: لَا أَنَا شُكَيلي وَلَا قرفندي، بَلْ أَنَا مُسْلِمٌ مُتَّبِعٌ لِكِتَابِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ، وَاَللَّهُ تَعَالَى قَدْ سَمَّانَا فِي الْقُرْآنِ: الْمُسْلِمِينَ الْمُؤْمِنِينَ عِبَادَ اللَّهِ، فَلَا نَعْدِلُ عَنْ الْأَسْمَاءِ الَّتِي سَمَّانَا اللَّهُ بِهَا إلَى أَسْمَاءٍ أَحْدَثَهَا قَوْمٌ - وَسَمَّوْهَا هُمْ وَآبَاؤُهُمْ - مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ}[1].

واتە: (إبن تيمية) گوتوویەتی: لەسەر مسوڵمان پێویستە ئەگەر لەو بارەوە پرسیاری لێکرا {پێشتر هێناویەتی دەڵێ: کۆمەڵێك هەن دەڵێن: ئێمە قەرفەندیین[2]، هەندێکی دیکە دەڵێن: ئێمە شوکەیلیین، لێیان پرسیوە: ئەگەر پێمان بگوترێ: ئێوە قەرفەندیین، یان شوکەیلیین؟ ئێمە چی بڵێین؟} دەبێ بڵێی: نە شوکەیلیم و نە قەرفەندییم، من مسوڵمانێکم شوێن قورئان و سوننەت دەکەوم، خواش لە قورئاندا ناوی لە ئێمە ناوە {مسوڵمانان}، {ئیمانداران}، {بەندەکانی خوا}، ئەو ناوانەی خوا بۆی داناوین، ئێمە لێیان لانادەین بۆ هەندێ ناوی دیکە کە: خەڵکێك ئەو ناوانەیان بەکار هێناون، خۆیان و باب و باپیرانیان و، خوای پەروەردگار هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردوون.

لەو بەینەی پێشوودا شێخی ئەزهەر چووبوو بۆ یەکێ لەو وڵاتانەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، لەوێ باسی ئەشعەریی کرابوو، گوتبووی: من هەر لەسەر عەقیدەی ئەشعەرییم، چونکە ئەوان وەك جەماوەری مسوڵمانانن.

وەك دوایی باسی دەکەم، کاتی خۆی (أبو حسن الأشعري) بە پارێزەری عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ناسراوە، بەڵام ئایا تۆ مولزەمی بڵێی: ئەشعەرییم، یان ماتۆریدییم، یان وەهابییم، یان سەلەفیم، یان مەدخەلییم؟ لێرەدا

---

(١) مجموع الفتاوى ج٣ ص٤١٥.

(٢) دیارە زانایەك بووە بەناوی قەرفەند، کۆمەڵێکیش بەدوای کەوتوون و گوتوویانە: ئێمە قەرفەندیین.

یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی کۆمەڵی ئیسلامیی، یەکگرتووی ئیسلامیی، حیزبی نووری سەلەفیی {لە میسر}، جەماعەتی ئیسلامیی {لە پاکستان}، ئەو ناوانە چین؟

دەڵێین: بۆ کارو چالاکی سیاسیی، دەگونجێ لافیتەیەك ناوونیشانێك لەسەر خۆت بەرز بکەیەوە، بەڵام نەیکەی بە پێوەرو سەنگی مەحەك بۆ مسوڵمانەتیی، ئەوەی کە ئێستا دەڵێ: من سەلەفییم، مەبەستی پێ چییە؟ مەبەستی ئەوەیە کە بەس من بەدوای پێشینی چاك دەکەوم، کە ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیەو، ڕەنگە زۆریشی لادابێ لە پێشینی چاك، ئەدی ئەگەر بڵێی: کۆمەڵی ئیسلامیی؟ دەڵێین: {کۆمەڵی ئیسلامیی} کۆمەڵە خەڵکێکین دەمانەوێ ئەو واقیعەی ئێستا چاك بکەین و، ئەو خەڵکەی بە ئیسلام نامۆبۆتەوەو لێی دوورکەوتۆتەوە، بۆ لای ئیسلامی بێنینەوە، هەروەها ئەو واقیعە بگۆڕین بەپێی ئەو بیرو بۆچوونانەی پێمان ڕاستن، ئەوە جیایە، بۆ وێنە: ئێستا حیزبی {نووری سەلەفیی} هەیە لە میسر، سەلەفیین، بەڵام حیزبیین، چ ئیشکالێکی تێدایە؟ ئەوانی دیکەش ئەگەر بێن وەك حیزبێکی سیاسیی خۆیان ڕابگەیەنن، ئەوە ئاسایییە، بەڵام کەسێك بێنێ خەڵك وا هەڵخەڵەتێنێ، کە تەنیا ئەو بەدوای پێشینی چاك دەکەوێ:

١)- ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیە، چونکە شوێنی پێشینی چاك کەوتن، کردەوەو ئاکارێکە هەر کەسێك لە خۆی دا بیهێنێتە دی، ئەگەر ئیددیعاشی نەکات زیانی نیەو، بگرە ئیددیعا کردنی پێچەوانەی خۆیەتی.

٢)- ئنجا {بەدوای پێشینی چاك کەوتن} زانایان گوتوویانە: دروست نیە بکرێتە ناو، چونکە تەزکیەی خۆ کردن و مەدحی خۆ کردنە.

٣)- پاشان ئەو ناوە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتوە.

وەك گوتم: وەك مامەڵە کردن لەگەڵ واقیعدا، دەگونجێ حیزبێك پێك بهێنی و بڵێی من حیزبی سەلەفییم، ئەوە دەگونجێ، بەڵام بڵێی: نەخێر من حیزبیش نیم، بەڵام بۆیە ئەو ناوەم لەخۆم ناوە، چونکە خۆم و ئەوانەی پێکەوەین، هەر

ئێمە بەدوای سەلەفی صاڵح کەوتووین! وەك باسم کرد لە چەند ڕوویێکەوە هەڵەیە، ئنجا زانایان گوتوویانە: ئەگەر کەسێك پرسیارت لێ بکات: ئایا تۆ ئیمانداری؟ واباشە بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ بڕوادارم (أنا مؤمنٌ إنشاءالله)، بەڵام ئەگەر بگوترێ: ئایا تۆ مسوڵمانی؟ دەبێ بڵێی: بەڵێ، چونکە ئەگەر گوتت: (أنا مؤمنٌ) یانی: من بەهەشتییم، خوای زانا فەرموویەتی:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ﴾ المؤمنون.

ئنجا تۆ هەر لەڕێوە بەهەشت بۆخۆت دابنێی، ئەوە دەکاتە خۆ تەزکیە کردن، خوای پەروەردگاریش نەهی لەوە کردوە، ئەدی بۆچی دروستە بڵێی: مسوڵمانم؟ چونکە مسوڵمانەتیی، ڕواڵەت و ئاشکرایە، مادام شایەتمانت هێنا، نوێژەکانت کردن، ڕۆژووی ڕەمەزان و زەکات و حەجت، هەبوو، دەتوانی بڵێی: مسوڵمانم واتە: ئەو شتانەم جێبەجێ کردوون، بەڵام ئایا لەلای خوا قبووڵن و، تۆ بەهۆی ئەو کردەوانەوەو، پێشتریش بەهۆی ئیمانەوە، بەهەشتت بۆخۆت مسۆگەر کردوە؟ دەڵێی: ئینشائەڵڵا.

ئنجا {شوێنکەوتنی پێشینی چاك} خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، وەك چۆن هەموو مسوڵمانان دەبێ بەشیان هەبێ لە ئیمان و عەقیدەدا، دەبێ ئیمان و عەقیدەیان بەو شێوەیە بێ کە خوا دەیەوێ و، بەشیان هەبێ لە تەزکییەی نەفسدا، دەبێ بەشیشیان هەبێ لە شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵحدا، ئەوە خاڵی هاوبەشەو هیچ کەس بۆی نیە ئەو ناوو نیشانە بۆخۆی قۆرخ بکات و، خەڵکی دیکەی لێ بێبەش بکات، هەر بە بانگەشەو ئیددیعا!

ئێستاش دوای ئەم دەستپێکە گشتییە، کاتی ئەوەیە دەست بکەین بە خستنە ڕووی هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان، لە سێ بەشی سەرەکەیی و پەنجاو یەك (٥١) باسدا:

## بـــەرایی

**خوێنەری سەنگین!**

ئەم بەشی یەکەمە: (تایبەتمەندییە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان) سەرەکییترین و گەورەترین بەشی ئەم تەوەرەیە، چ لە ڕووی نێوەڕۆك و چ لەڕووی قەبارەشەوە.

مەبەستیشمان لە تایبەتمەندییە گشتییەکان (الخصائص العامّة) ئەو بنەما مەزن و گرنگانەن، کە سیماو چوار چێوەی تایبەتیی جەماوەری مسوڵمانان و ڕێبازو بەرنامەی دینداریی و ئیسلامەتییان پێك دێنن، ئنجا چ پەیوەست بن بەبواری بووناسیی، چ ئیمان و عەقیدە، چ فیکرو تێڕوانین، چ پەرستن و پارێزکاریی، چ کۆمەڵایەتیی، چ سیاسییەوە.

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان: مەرج نیە ئەو بنەمایانە تێکڕاو یەك یەکیان، تەنیا لە جەماوەری مسوڵمانان (جمهور المسلمین)ی پەیڕەوانی پێغەمبەری خوا (محمد) (صلی الله علیه وسلم)و، هاوەڵانی دڵسۆزو بەڕێزی و خزمانی ساغ و سەر ڕاستیی بە گشتی و، چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی بەتایبەتدا، بووبن، بەڵکو کەم و زۆر لە مسوڵماناندا بە گشتیی - بە گرووپ و تاقمە لادەرەکانیشەوە- هەبوون و هەن، بەڵام هەموویان تەنیا لە {جەماوەری مسوڵمانان}دا کۆبوونەتەوە.

هەروەها بە نسبەت تایبەتمەندییە ئیمانیی و عەقیدەییەکان و، تایبەتمەندییە ئاکارییەکانیشەوە، کە لە بەشەکانی دووەم و سێیەم دا دەخرێنە ڕوو، بەهەمان شێوە.

**تایبەتمەندییە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانان:**

١- کۆبوونەوەو پەرتەوازە نەبوون.

٢- پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە.

٣- شوێنکەوتنی پێشینی چاك.

٤- تەنیا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەڵە پارێزراو (معصوم)ە، بۆیە بەس ئەویش پەیڕەویی لێکراوی ڕەهایە.

٥- بەشێوەیەکی فراوان و گشتگیر بە ئیسلامەوە پابەند بوون.

٦- میانجێتیی و هاوسەنگیی (التوسط والإعتدال).

٧- ڕاجیایی مسوڵمانان نابێتە هۆی تێکچوونی تەبایی و دۆستایەتییان.

٨- گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و جێنشینە ڕێی ڕاست گرتووەکان.

٩- پەیدا کردن لە دینداریدا قەدەغەیەو، داهێنان لە دنیاداریی دا پێویستە.

١٠- بە عەقڵی فراوان و دڵسۆزیی و پەرۆش و ڕەوشتی بەرزەوە، هەوڵدان بۆ لێك نزیك کردنەوەی مسوڵمانان، لەسەر بنەمای خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان.

١١- کۆشش کردن (إجتهاد)، بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان لە قورئان و سوننەتدا، بە گشتیی فەرزی کیفایەیە، کەسێکیش توانای نەبێ، لەسەری پێویستە لە زانایان بپرسێ و، بەرچاو ڕوونانە شوێنیان بکەوێ، نەك کوێرانە لاساییان بکاتەوە.

١٢- خۆ پاراستن لە بەکافر دانانی مسوڵمانانێك کە کوفر، یان شیرکیان لێ دەزانرێ، مەگەر دوای بەڵگە لەسەر تەواو کردن.

١٣- زانیاریی دەربارەی ئایین و، شارەزایی بە ژین.

١٤- جەنگ و فیداکاریی لە پێناوی خوادا بۆ پاراستنی: خەڵك و، خاك و، دین و، ژین.

١٥- بەرپا کردنی ئایین و ئەنجامدانی دروشمەکانی پێکەوەو بەهەرەوەزیی.

١٦- کرانەوەی هۆشیارانە، بەڕووی بیرۆکەو ئەزموونە جۆراو جۆرەکانی بەشەرەوە.

١٧- لێبوردەیی و سینگ فراوانیی، لە بواری تێڕوانین و مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵ و تەوژمە لادەرەکانی نێو ئۆممەت دا.

١٨- نواندنی هەڵوێستی هاوسەنگ، لەبەرانبەر حوکمڕانانی لادەرو ستەمکاردا.

١٩- باشترین مامەڵە لەگەڵ هاوولاتییانی نامسوڵماندا.

٢٠- هەوڵدان بۆ هێنانەدی بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دوارۆژ، بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی.

## بنەمای یەکەم

# کۆبوونەوەو پەرتەوازە نەبوون

یەکەم تایبەتمەندیی گشتیی جەماوەری مسوڵمانان، ئەوەیە کە هەوڵ دەدەن کۆبن و پەرتەوازە نەبن و، هەرکەسە بەڕێیەکدا نەڕوا، لەبەر ئەوەی خوای بەرزو مەزن لە چەندان ئایەتدا فەرمان بەوە دەکات، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتەکانی (١٠٢و١٠٣)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ.. ﴿١٠٣﴾ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لەخوا بکەن وەك بۆی شایستەیەو بە مسوڵمانەتیی نەبێ مەمرن و، دەست بە ڕێسمانی خوا بگرن بە تێکڕاو، پەرتەوازە مەبن.

٢- لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾ ﴾

واتە: وەك ئەوانە مەبن کە دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆهاتن، پەرتەوازە بوون و ناکۆك بوون، ئەوانە سزایەکی مەزنیان بۆ هەیە.

٣- لە سوورِەتی (الأنعام) ئایەتی (١٥٩)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ١٥٩ ﴾

واتە: بێگومان ئەوانەی ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کرد و بوونە تاقم تاقم، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە {ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)} بەڵکو ئەوانە کارو باریان بۆ لای خوا دەگێڕدرێتەوە، دوایی هەواڵیان پێدەدا بەوەی دەیانکرد.

٤- لە سوورِەتی (الأنعام) ئایەتی (١٥٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ١٥٣ ﴾

واتە: ئا ئەمەیە ڕاستە شەقامی من، شوێنی بکەون و دوای ڕێچکەکان مەکەون، ئەگەرنا لە ڕێبازی خوا دەترازێن، خوا ئەم ئامۆژگارییەی کردوون، بەڵکو پارێز بکەن.

هەروەها چەند دەقێکی سوننەتیش لەو بارەوە بە نموونە دەهێنینەوە:

٥- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطًّا، ثُمَّ قَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ)، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ ثُمَّ قَالَ: (هَذِهِ سُبُلٌ مُتَفَرِّقَةٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ) ثُمَّ قَرَأَ: {إِنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ} أخرجه أحمد برقم: ٤٤٣٧، والدارمي برقم: ٢٠٦، والنسائي في التفسير، قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن، وقال الجديع: إسناده جيد.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك {کە ویستوویەتی چەمکی ئەو ئایەتەیان بۆ ڕوون بکاتەوە} خەتێکی ڕاستی کێشا، فەرمووی: ئەوە ڕێبازی

خوایە، دوایی چەند وردە خەتێکی لەلای چەپ و ڕاستی کێشان، ئنجا فەرمووی: ئەمانەش ڕێچکەکانن، کوێرە ڕێیەکانن، لەسەر هەر کوێرە ڕێیەك شەیتانێکی لەسەرە، خەڵکی بۆ بانگ دەکات، دواییش ئەو ئایەتەی خوێندەوە: {ئەمە ڕاستە ڕێی منە شوێنی بکەون و، مەکەونە دوای ڕێچکان، ئەگەرنا لەو ڕاستە ڕێیە پەرتەوازە دەبن}.

٦- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ، وَهُوَ مِنْ الِاثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمْ الْجَمَاعَةَ} أخرجه الشافعي (٢٤٤/١) ، والطيالسي (ص ٧، رقم ٣١)، والحميدي برقم (٣٢)، وأحمد برقم (١١٤)، والترمذي برقم (٢١٦٥) وقال: حسن صحيح غريب، وأبو يعلى برقم (١٤١)، وابن حبان برقم (٧٢٥٤)، والدارقطني في العلل برقم (١١١)، والحاكم برقم (٣٨٧) وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي برقم (١٣٢٩٩). وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٩٢٢٥)، قال الألباني: صحيح، في السلسلة الصحيحة، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح، رجاله ثقات رجال الشيخين.

واتە: لەگەڵ کۆمەڵ و جەماوەری مسوڵمانان دابن و، خۆتان لە پەرتەوازەیی بپارێزن، چونکە شەیتان لەگەڵ کەسی تەنیا دایەو، لە دووان دوورترەو، هەر کەسێ دەیەوێ بچێتە نێوەڕاستی بەهەشتەوە، با لەگەڵ کۆمەڵ و زۆربەی مسوڵمانان دابێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: (فَلْيَلْزَمْ الْجَمَاعَةَ) (الْجَمَاعَةَ): یانی: کۆمەڵ، جەماوەری مسوڵمانان، ئنجا ئەوە مەبەست پێی کێیە؟

١- هەندێ گوتوویانە: مەبەست پێی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانانە.

٢- هەندێ گوتوویانە: مەبەست ئەو پێشەوایانەن کە ئیجتیهادیان کردووە یاسایەکانیان لە قورئان و سوننەت هەڵێنجاون.

٣- هەندێکی دیکە دەڵێن: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم).

٤- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی ئەهلی ئیسلامە بە گشتیی.

٥- هەندێکیان گوتوویانە: ئەو کۆمەڵی مسوڵمانانن کە لەسەر بەرپرسێك کۆدەبنەوە.

پێناسەی (سنة) و (جماعة):

لە کۆتاییدا دەمەوێ دووبارە تیشکێك بخەمەوە سەر ئەو دوو وشەیە:

١- (السنة).

٢- (الجماعة).

یەکـەم: (سـنّة):

أ- سوننەت لەڕووی زمانەوە (السنة في اللغة):

{هي الطريقة محمودة كانت أو مذمومةً، وهي مأخوذة من السَّنن وهي الطريقة}[١]. واتە: سوننەت لە زمانی عەرەبییدا بەمانای ڕێباز دێ، چاك بێ یان خراپ بێ و، لە (السَّنن)ەوە هاتوە، واتە: ڕێ.

ب- سوننەت لەڕووی زاراوەی شەرعەوە (السنة في الإصطلاح):

وشەی (سنّة) لەلای فەرمووودەناسان (مُحَدِّثين) واتایەکی هەیەو، لەلای زانایانی (أصول الفقه) واتایەکی هەیەو، لەلای شەرعزانان (فقهاء) واتایەکی هەیە:

١- لەلای فەرموودەناسان (عند المحدِّثين):

{ما أُثِر عَنِ النَّبـيِّ مِن قَولٍ أَو فعلٍ أَو تَقريرٍ، أَو صِفَةٍ خَلقيّةٍ أَو خُلُقيّة، أَو سيرة، سَواءً كانَ قَبل البعثة أَو بَعدَها}[٢]، واتە: هەرشتێك کە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەرگیرابێ، لە فەرموودەی، لە کردەوەی، لە دانپێداهێنانی، یاخود سیفەتێکی (خَلقيّ) {وەك ئەوەی بگوترێ: قەدو قیافەی وابووە، ڕەنگ

---

(١) لسان العرب، ج٦ ص٣٩٩، ٤٠٠.

(٢) السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي، للسباعي ص٤٧.

و ڕووی وابووە} یاخود سیفەتێکی (خُلُقيّ) {وەك ئەوەی بگوترێ: هەڵس و کەوتی وابووە} یاخود ژیاننامەی پێش پێغەمبەرایەتیی و دوای پێغەمبەرایەتیی.

٢- لەلای زانایانی ئوصوولی فیقە (عند الأصوليين):

{ما جاءَ مَنقولاً عَن النبـي عَلى الخصوص، مِمّا لَم يُنَصّ عَلَيه في الكِتاب العَزيز، بَل إنّما نُصَّ عَليه مِن جِهَته، وَكان بَياناً لِما في الكِتابِ أَوَّلاً}[١]، واتە: هەر شتێکە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هاتبێ و، لە قورئاندا دەقی لەسەر نەکرابێ، بەڵکو تەنیا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویێتی و، ڕوونکردنەوەبێ بۆ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوە.

٣- لەلای شەرعزانان (عند الفقهاء):

{ما ثَبَت عَنِ النّبـى مِن غَير افتراض ولا وُجوب}[٢]، واتە: بریتیە لەوەی لە پێغەمبەرەوە بە سەلمێنراویی هاتبێ، کە بەرانبەر واجب و فەرزدایە، واتە: ئەگەر بیکەی خێرت دەگا، ئەگەر نەیکەی گوناهت ناگا، بە پێچەوانەی فەرزو واجبەوە.

کەواتە: کە دەگوترێ سوننەت، دەبێ بگوترێ: لەلای کێ؟ لەلای فەرموودەناسان، لەلای ئوصوڵییەکان، یان لەلای شەرعناسان؟

ئنجا من پێم وایە کە وشەی (سنة) قورئانیش دەگرێتە خۆی، وەك پێشتریش لەتەوەری یەکەمی ئەم بابەتەدا بەدرێژیی باسمان کردوە، لێرە دووبارەی ناکەینەوەو پوختەکەی ئەوەیە کە: سوننەت بە گشتیی پراکتیزە (تطبيق) کردنی قورئانە لەسەر ئەرزی واقیع.

---

(١) الموافقات للشاطبي، ج٤ ص٤٧.

(٢) هەمان سەرچاوە ج٤ ص٤.

دووەم: (الجَمــاعَـة):

١- (إبن تيمية) دەڵێ: {الجَمَاعَة: هِيَ الإِجْتِمَاعُ وَضِدُّهَا الْفُرْقَةُ، وَإِنْ كَانَ لَفْظُ الْجَمَاعَةِ قَدْ صَارَ اسْمًا لِنَفْسِ الْقَوْمِ الْمُجْتَمِعِينَ}(١)، واتە: (جماعة) بریتیە لە کۆبوونەوەو پێچەوانەکەی پەرتەوازەییە، هەرچەندە بێژەی (الْجَمَاعَة) بەکاردێ بۆ خودی ئەو خەڵکەی کە کۆدەبنەوە.

٢- (أبو شامة) دەڵێ: {وَحَيث جاءَ الأَمْر بِلُزومِ الجماعة، فالمراد به لزوم الحق واتِّباعه، وان كان المتمسك بالحق قليلاً والمخالف كثيراً}(٢). واتە: هەرکات فەرمان کردن بە کۆمەڵ بوون بێ، مەبەست پێی گرتنی هەق و شوێنکەوتنیەتی، هەرچەندە دەستگرتوو بەهەقەوە کەمینە بن و نەیاری هەق زۆربن.

هەروەها وشەی (الجَمَاعَة) بەمانەی خوارەوەش گوتراوە وەك پێشتریش گوتمان:

١- هاوەڵان.

٢- ئەو پێشەوایانەی کە کۆشش (إجتهاد)یان کردوە.

٣- کۆی مسوڵمانان.

٤- زۆربەی مسوڵمانان.

٥- کۆمەڵی مسوڵمانان کە لەسەر حوکمڕانێك کۆدەبنەوە.

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٣، ص ١٥٧.

(٢) الباعث، لأبي شامة ص٢٢.

بنەمای
دووەم

# پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە

ئەمیش: دووەمین تایبەتمەندیی گشتیی هەرە گرنگی جەماوەری مسوڵمانانە، هەڵبەتە گرووپەکانی دیکەش هەر گوتوویانە: پاندین بە قورئان و سوننەتەوە، بەڵام ئەوەی لە واقیعدا بەرجەستەی کردوە کە پابەند بووە بە قورئان و سوننەتەوە، تەنیا زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانانن، کە وەك پێشتر گوتمان: هیچ نازناوێکیان نەبووە پێوەی بناسرێن، جگە لەناوی مسوڵمانان (مسلمین)، شیعە گوتوویانە: شیعەین، هەروەها هەر کام لە: مورجیئەو قەدەرییەو موعتەزیلە.. بەهەمان شێوە، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت تەنیا بەم ناوە ناسراون: {مسوڵمانان} ئنجا وشەی {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}، ئەو نازناوەش دواتر بەشێك لە زانایان وەك ناوونیشان بەکاریان هێناوە[1].

---

(١) من پێم باش نیە ئەو نازناوە بەکار بێ، نەك لەبەر شیعە، یان خەواریج، یان فلان و فلان، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە قورئانداو لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئێمە یەك ناومان هەیە پێی بناسرێین و لەسەری کۆبینەوە، کە بریتیە لە ناوی {مسوڵمانان}، چونکە وەك دواتر باسی دەکەم کاتێك گوتت: ئەهلی سوننەت، دەگوترێ: لەنێو ئەهلی سوننەتدا تۆ چی؟ سەلەفیی یان خەلەفیی، دەڵێی: سەلەفیی، دەگوترێ: مەدخەلیی یان فلانیی؟ ئیبن

هەڵبەتە پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە، ئایەت و فەرموودەی زۆری لەسەرن، بۆ وێنە:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٥٩)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ..(٥٩) ﴾،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن و، هی کاربەدەستان لە خۆتان.. واتە: پابەند بن بە قورئانەوەو بە سوننەتەوەو، بە فەرمانی کاربەدەستانێکەوە کە لە خۆتانن.

یانی: ئەوانیش ئەگەر بەپێی قورئان و سوننەت بووبنە کاربەدەستتان و، ڕەوایەتییان لە ئێوەوە وەرگرتبێ، کە بناغەی حوکمڕانیی ئیسلامیی ئەوەیە کە ڕەوایەتیی لە خەڵکەوە وەرگرتبێ، بێگومان ئەو فەرمانبەرییەش لە چوارچێوەی قورئان و سوننەتدا دەبێ.

٢- لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ ..(٣٦) ﴾

واتە: نابێ هیچ پیاوێکی بڕوادارو هیچ ئافرەتێکی بڕوادار دوای ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا بڕیارێك دەدەن، مافی سەرپشك بوون بەخۆیان بدەن {پابەند بین، یان پابەند نەبین؟}.

٣- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ} أخرجه الحاكم، والمالك، وصححه الألباني في المشكاة.

واتە: دوو شتم لەنێودا بەجێ هێشتوون، هەتا دەستتان پێیانەوە بێ، گومڕانابن، ئەوانیش کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم).

---

بازیی، یان ئەلبانیی؟ بەڵێ ناوی {مسوڵمانان} ئەو ناوەیە کە خوا ئێمەی پێ ناساندوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ الحج -٧٨-.

خوێنەرانی بەڕێز!

لێرەدا دەمەوێ شتێك بڵێم، زۆرم پێ گرنگە بۆیە دووبارەی دەکەمەوە:

سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)یانی ئەو بەرنامەو ڕێبازەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دینداریی خۆی لە بوارەکانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی تێدا بەرجەستە کردوە، هەڵبەتە ئەو کاتەش سوننەت ناکەوێتە بەرانبەر قورئان، بەڵکو سوننەت قورئانیش دەگرێتە نێوخۆی، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێبازەکەی جێبەجێ کردنی قورئان بوو، کەواتە: سوننەت بریتیە لە قورئان، بەڵام بەجێبەجێ کراویی، هەڵبەتە کە واش دەڵێین، مەبەستمان ئەوە نیە کە جگە لەوەی کە لە قورئاندا هاتوە، هیچ وەحیی دیکەمان نیە، بەڵکو لەنێو سوننەتدا - هەرچەندە کرۆکی سوننەت بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان - بەڵام وێڕای ئەوەش هەندێ یاسای تایبەت بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتوون، کە لە قورئاندا نین، با لەو بارەوە نموونەیەك بێنینەوە:

صەفوانی کوڕی ئومەییە یەکێ بووە لە هاوەڵان، دیارە هاوەڵێکی گەنج بووە، دەڵێ: ڕۆژێك لە مەجلیسێك بووم، پێم خۆش بوو ئەو کاتەی وەحیی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەهات ئاگام لێبووایە، عومەری کوڕی خەتتابیش لەوێ بووە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەژێر چادرێکدابوو هەڵیاندابوو بۆ سێبەر، کۆمەڵێ لە هاوەڵانیش لە خزمەتی دابوون و لەژێر ئەو چادرەدا دانیشتبوون، دەشتەکییەك هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من عومرەم کردوە، بەڵام بەم بەرگەوە کردوومە {بۆنی خۆشی لەخۆی دابوو، ئەو بۆنە خۆشەی کە ڕەنگیشی دیارە} ئنجا من چی بکەم؟

دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچی نەفەرموو، فەرمووی جارێ ڕاوەستە، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

تەماشای سەرێی کرد، زانیمان وەحیی بۆ دێ، عومەر بە صەفوانی کوڕی ئومەییەی گوت: وەرە تەماشابکە، منی بردە پێش چادرەکە گوتی: تەماشا بکە، بزانە چۆن وەحیی بۆ دێ؟ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەماشای سەرێی کرد، کەوتە حاڵەتێکی نائاسایی، ئێمەش دامانپۆشی، دیارە شتێکیان پێداداوە، وەك قوماشێك، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕەنگی سوور بووەوەو ئارەقی کردبوو، دوایی کە تەواو بوو، فەرمووی: ئەوە کێ بوو پرسیاری کرد، دەربارەی ئەوەی چۆن حەج بکا؟

بانگیان کردەوە {واتە کابرای دەشتەکیی} دیارە پێی چووە تاکو وەحییەکەی بۆ هاتوە، ئنجا کە هێنایان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەو پۆشاکەی لەبەرت بووە، عومرەت پێ کردوەو بۆنت لێداوە، بیشۆ، دوایی لەبەری بکەوە، ئنجا چۆنت عەمرە کردوە، ئاواش حەج بکە[١].

کەواتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێرەدا وەحییەکی تایبەتیی بۆ هاتوە، دەربارەی ئەوە کە ئەو پیاوە چی بکا! چونکە بابای ئیحرام بەستوو (مُحْرِم) دەبێ بۆنی خۆش لەخۆی نەدات، بەڵام ئەو کابرایە بۆنەکەی لەخۆی داوەو، هەر ئەو بەرگەشی پێ بووە، عومرەشی پێوە کردوە، ئەدی بۆ حەجێ چی بکا؟ ئەوە لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەشێوەیەکی تایبەت لەو بارەوە وەحیی بۆ هاتوە.

کەواتە: ئەوانەی پێیان وایە: وەحیی خوای زاناو توانا لە قورئاندا کورت هەڵهاتوەو هیچی دیکە نیە، بەهەڵەدا چوون و، چەندان بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی ئەو قسەیە وانیە، کە پێشتر لەو بارەوە باسمان کردوەو، پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە.

---

(١) صحیح البخاري: ١٧٨٩.

بنەمای
سێیەم

# شوێنکەوتنی پێشینی چاك

ئەمیش یەکی دیکەیە لە تایبەتمەندییە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانان و، لەو بارەوەش ئایەت و فەرموودە زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٠٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ..﴿١٠٠﴾﴾.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی باش شوێنییان کەوتوون، خوا لەوان ڕازییەو، ئەوانیش لەخوا ڕازیین....

کەواتە: خوا لێرەدا مەدحی پێشکەوتووە یەکەمەکانی کردوە، لە کۆچکەران و پشتیوانان، کە هاوەڵانن، هەروەها ئەوانەش کە بەچاکیی شوێنیان دەکەون، بەڵێ شوێنکەوتنی پێشینی چاك، مایەی ئەوەیە خوا لێت ڕازی بێ و، مایەی ئەوەیە ئینسان بچێتە ڕیزی هاوەڵانەوە، خوا لێیان ڕازی بێ.

٢- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١١٥)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥ ﴾.

واتە: هەرکەسێ سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکات، دوای ئەوەی ڕێنمایی بۆ ڕوون بۆتەوەو، بەدوای ڕێبازی جگە لە مسوڵمانان بکەوێ، حەواڵەی خۆی دەکەین و، دەیخەینە دۆزەخەوەو، خراپترین شوێنیش ئەوێیە.

کەواتە: دەبێ بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەوین و بەدوای ئەو ئیماندارانە بکەوین، کە لە خزمەت پێغەمبەردا بوون، کە بە پلەی یەکەم هاوەڵانن، ئنجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئنجا ئایا تاکو کوێ دەڕوا ئەو چینی سەلەفی صاڵحەو سنوورەکەی تاکو کوێیە؟ زۆربەی هەرەزۆری زانایان دەڵێن: {پێشینی چاك} سێ جیلن، ئنجا هەندێ گوتوویانە: سێ جیل، هەر جیلی (١٠٠) ساڵی بۆ دابنێ، دەکاتە: تاکو کۆتایی سەدەی سێیەم، بەڵام زۆربەیان ئەو ڕایەیان بەدڵ نیەو، بۆ هەر جیلەی حەفتا (٧٠) ساڵیان داناوە، کەواتە: دەکاتە ساڵی (٢١٠)ك، سنووری سەلەفی صاڵح لەوێ کۆتایی دێ[1]، هەڵبەتە مەسەلەی پێشینی چاك، شتێکی ڕێژەیی (نسبي)یەو، بۆ ئێمە هەموو ئەوانەی پێش خۆمان چاك بووبن، پێشینی چاکن، ئنجا بۆ دوای ئێمە، ئێمەش دەچینە ڕیزی پێشینی چاکەوە، ئەوەی لەسەر ڕێگای هەق بێ، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مەبەست پێی سێ جیلەکانن، کە ئەویش هەر جیلەی بە (٧٠) ساڵیان داناوە، دەکاتە کۆتایی ساڵی (٢١٠)ی کۆچیی.

٣- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە هاتوە، کە دەفەرموێ: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٢٤٠٧)، وأحمد برقم (٤١٣٠)، والبخاري برقم (٢٥٠٩)، ومسلم

---

(١) چونکە: ٧٠ + ٧٠ + ٧٠ = ٢١٠.

برقم (٢٥٣٣)، والترمذي برقم (٣٨٥٩) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٢٣٦٢)، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٦٠٣١)، وأبو يعلى برقم (٥١٠٣)، وابن حبان برقم (٧٢٢٢)، والبيهقي برقم (١٩٦٩٦)، والطبراني برقم (١٠٣٣٨).

واته: باشترینی خەڵك، ئەوانەی سەدەی منن، ئنجا ئەوانەی دوای وان، ئنجا ئەوانەی دوای وان.

کەواته: سێ جیل و وەك گوتم: ئەگەر هەر جیلەی بە حەفتا (٧٠) ساڵ دابنرێ، دەکاتە کۆتایی ساڵی (٢١٠)ك.

٤- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه الشافعي (٢٤٤/١)، والحميدي (١٩/١، رقم ٣٢)، وأحمد برقم (١١٤)، والترمذي برقم (٢١٦٥) وقال: حسن صحيح غريب، وأبو يعلى برقم (١٤١)، وابن حبان برقم (٧٢٥٤)، والدارقطني في العلل برقم (١١١)، والحاكم برقم (٣٨٧) وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي برقم (١٣٢٩٩)، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٩٢٢٥)، قال الألباني: صحيح في سنن الترمذي.

واته: ڕاتان دەسپێرم بە هاوەڵانم {کە شوێنیان بکەون}، دوایی ئەوانەی دوای ئەوان، ئنجا ئەوانی دوای ئەوان.

بۆیە هەموو زانایان دەڵێن: (پێشینی چاك) بە ڕەهایی، بریتیە لە: هاوەڵان (أصحاب)، دوایی شوێنکەوتووان (تابعين)، دوایی شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان (تابعي التابعين).

بەڵام لێرەدا پێویستە بپرسین: ئایا مەبەست لە شوێنکەوتنی پێشینی چاك، - وەك بەداخەوە زۆرکەس وا حاڵی بووە- ئەوەیە: کە ئەوان چییان کردوەو چییان گوتوە، ئێمەش وا بکەین و وا بڵێین؟!

بەتەئکید نەخێر، چونکە ئێمە تەماشا دەکەین: پێشەوایانی ئێمە نەهاتوون وەك تووتی قسەی ئەو زانایانەی پێش خۆیان دووبارە بکەنەوە، وایان نەکردوە، چونکە

ئەوان بۆ ڕۆژگاری خۆیان فەتوایان داوە، تەماشای قورئان و سوننەتیان کردووە، وەڵامی پرسیارەکانی کاتی خۆیانیان داوەتەوە، مەرج نیە وەڵامەکانیان بەکەڵکی ئێستا بێن، ئەدی مەبەست لە شوێنکەوتنی پێشینی چاك چییە؟

دەڵێین: واتە: شوێنکەوتنی ئەو بەرنامەو میتۆدەی، کە ئەوان مامەڵەیان پێ لەگەڵ قورئان و سوننەتدا کردوە، بۆ وێنە:

١)- وەحییان تەنیا لە قورئان و سوننەتدا بینیوە.

٢)- ئیسلامیان بە گشتگیری وەرگرتوە، نەك یەکێ تەنها خەریکی تەزکیە بێ و، یەکێ تەنها خەریکی فیقه بێ و، یەکێ تەنیا خەریکی جیهاد بێ، بەڵکو هەموویان وەرگرتوە.

٣)- بەپێی زمانی عەرەبییش هەر ئایەتەو هەر فەرمایشتە، چی لێ فامرابێتەوە، بەبێ بڕیاری و بیرۆکەی پێش وەختە، وەریان گرتوە.

٤)- ئەو شتانەی کە هەموویان لەسەریان کۆك بوون و یەکدەنگییان لەسەریان بووە، گوتوویانە: ئەوانە خەتی سوورن.

٥)- هەندێ شتیش هەبووە - وەك دوایی باسی دەکەم - دەرفەتی ڕاجیایی تێدا هەبووە، هەر لەسەردەمی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، یەکێکیان بۆچوونی وابووە، ئەوەی دیکەیان ڕایەکی دیکەی هەبووە.

کە ئێستا زۆربەی ئەوانەی ئێستا بانگەشەی شوێنکەوتنی سەلەفی صالح دەکەن، لەوەدا تێینەگەیشتوون و، پێیان وایە کە دەبێ فەتوایەکانی وان وەك تووتی بڵێیەوە، ئنجا پێشیان وایە ئەوان لەسەر هەموو شتێك یەکڕا بوون، کە ئەمەش وانیەو، هەم هاوەڵان و هەم شوێنکەوتووان، لەسەر زۆر شت تێك گیراون، بەتایبەت لەو شتانەدا کە زیاتر لە ڕایەك هەڵدەگرن.

# بنەمـای چـوارەم

## تەنیا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەهەڵە پارێزراو (معصوم)ە، بۆیە بەس ئەویش پەیڕەویی لێكراوی ڕەهایە

ئەم تایبەتمەندییە گشتییەش، یەكێ دیكەیە لە دروشم و نیشانە سەرەكییەكانی ڕێبازو بەرنامەی جەماوەری مسوڵمانان.

تەنیا كەسێك كە ئێمە لە هەموو شتێكدا پەیڕەویی لێ بكەین، لەوەدا كە وەك دین بە ئێمەی ڕاگەیاندوە، بەس پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) و ئەوانی دیكە، تەنانەت خەلیفە ڕاشیدەكانیش قسەكانیان پابەندكەر (مُلزِم) نیە وەك دین، وەك پێشەوا مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ لەنزیك گۆڕی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەستاوەو گوتوویەتی: (كلٌ يُؤْخَذ مِن قَوله وَيُرد، إلّا صاحِب هَذا القَبر صلى الله عليه وسلم).

لەو بارەوەش ئایەتی قورئان زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا باشترین سەرمەشق هەیە بۆ ئێوە.

واتە: لە هەموو ڕوویێکەوە دەبێ شوێنی وی بکەون، چونکە پارێزراو بووە لە هەڵە، ئەگەر هەڵەیەکی ئیجتیهادیشی بووبێ، دوایی خوا بۆی ڕاست کردۆتەوە، بۆ وێنە: مۆڵەتی دا بەوانەی داوای مۆڵەتیان لێ کرد کە نەچن بۆ جەنگی تەبوك، دوایی خوا بۆی ڕاست کردەوەو فەرمووی:

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ...﴿٤٣﴾ ﴾ التوبة.

واتە: خوا لێت ببوورێ بۆچی مۆڵەتت دان؟ یان دیلەکانی جەنگی بەدر، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو ڕایەی پێ پەسند بوو: بیانهێڵنەوە، بەدیلیان بگرن و دوایی پارەیان لەبەرانبەردا وەربگرن، دیل بە دیلیان پێ بکەن، بەڵام خوای پەروەردگار ڕەخنەی لێ گرت.

ئنجا با ئەوەش ڕاست بکەمەوە وەك لە تەفسیری سووڕەتی (الأنفال)دا هێناومە: زۆربەی خەڵکی وا دەزانن: خوا لەبەر ئەوە گلەیی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردوە، کە دیلەکانی نەکوشتوون! کە بۆ زانیارییتان دیل ناکوژرێ، بەڵام گلەییەکە بۆیە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرا، وەك لە ئایەتەکەدا هاتوە، کە دەفەرموێ:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ .. ﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە دیلان بگرێ، (نەك دیلان بهێڵێتەوە) یانی: خوا ڕەخنەی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەگرتوە لەسەر ئەوەی کە دیلەکانی نەکوشتوون، چونکە دیل نابێ بکوژرێ، بەڵکو لەسەر ئەوە ڕەخنەی لێگرتوە، کە بەتەماعی قەرەبوو (فدیة) لێوەرگرتن، بەدیلیان گرتوون، واتە: نەدەبوو بەدیلیان بگرن، بەڵکو دەبوو تاکو لەپەل و پۆتان دەخستن، زۆرتان لێ بکوشتبانایە، نەك بە تەماعی ئەوەی دوایی فیدیەیان لێ وەربگرن، ئێستا

بەدیلیان بگرن، ئەگەرنا دوای ئەوەی کە بەدیل گیران، نابێ بکوژرێن، چونکە لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: هەرکات بەرەنگاری کافرەکان بوونەوە لە گەردنیان بدەن، ئنجا کاتێك زۆرتان لێ کوشتن و لە پەل و پۆتان خستن، (بە دیلیان بگرن) و پەلبەستیان بکەن، دوایی یان منەتیان لەسەر بکەن، یان بە قەرەبوو، بەریان بدەن.

ئیدی ئایەتەکە شتێکی دیکەی سێیەم و چوارەمی تێدا نیە.

بەڵێ هەندێ لە شەرعزانان (فقهاء) گوتوویانە: حوکمڕانی مسوڵمانان سەرپشکە لەنێوان چوار شتاندا:

١- یان بەخۆڕایی بەریان دەدا.

٢- یان بە بەرانبەر.

٣- یان دەیانکوژێ.

٤- یاخود دەیانکاتە کۆیلە!!

بەڵام لەڕاستییدا کردنە کۆیلەو، کوشتن، لە قورئاندا نین، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هیچ دیلێکی نەکردۆتە کۆیلە لە پیاوان و، هیچ دیلێکیشی نەکوشتوە، مەگەر ئەوەی خیانەتی گەورەی کردبێ و خوێن قەرزدار بووبێ، ئەوە دیارە کە لە فەتحی مەککەدا بۆ چەند کەسێ فەرمووی: لە هەر شوێنێ بینیتانن، بیانکوژن، ئەوە جیا بووە، بەڵام بەگشتیی فەرموویەتی: بڕۆن ئازاد بن.

٢- هەروەها خوای کارزان لەبارەی فەرمانبەریی ڕەهای مسوڵمانانەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە دەبێتە مایەی ڕێنمایی کران و ڕاستە ڕێ بوون و ڕێی ڕاست گرتنیان بەگشتیی لە هەموو کاروبارێکدا، فەرموویەتی:

﴿ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور.

واتە: بڵێ: فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر ڕووتان وەربگێڕن، ئەو ئەرکی خۆی کە لەسەری پێویست کراوە، لەسەریەتی و، ئێوەش ئەو ئەرکەی لەسەرتان پێویست کراوە، لەسەرتانە، ئەگەر فەرمانبەرییشی بۆ بکەن ڕاستەڕێ دەبن و، پێغەمبەریش تەنیا گەیاندنی لەسەرە.

دەربارەی شوێنکەوتنی پێشینی چاك (إبن تيمية) دەڵێ: {فَإِنَّ أَهْلَ الْحَقِّ وَالسُّنَّةِ لَا يَكُونُ مَتْبُوعُهُمْ إلَّا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، الَّذِي لَا يَنْطِقُ عَنْ الْهَوَى إنْ هُوَ إلَّا وَحْيٌ يُوحَى، فَهُوَ الَّذِي يَجِبُ تَصْدِيقُهُ فِي كُلِّ مَا أَخْبَرَ، وَطَاعَتُهُ فِي كُلِّ مَا أَمَرَ، وَلَيْسَتْ هَذِهِ الْمَنْزِلَةُ لِغَيْرِهِ مِنْ الْأَئِمَّةِ}[1]، واتە: ئەهلی حەق و سوننەت پەیڕەوییی لێکراوەکەیان تەنها پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) کە هەر پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) هەر شتێ کە فەرموویەتی، دەبێ بەڕاست دابنرێ و، هەرچی فەرمانی پێ دەکا، دەبێ فەرمانبەریی بکرێ، ئەم پێگەو پلەیە تەنها بۆ پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)و کەسی دیکە وانیە لە پێشەوایان.



---

(١) مجموع الفتاوى ج٣ ص ٣٤٦.

بنەمای
پێنجەم

# بەشێوەیەکی فراوان و گشتگیر
# بە ئیسلامەوە پابەند بوون

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە تایبەتمەندییەکانی بەرنامەو ڕێبازی زۆربەی مسوڵمانان، کە بە گشتی پابەند دەبن بە ئیسلامەوە، نەك هەریەکەی بەلایەکدا بڕواو، هەرکامیان بەجیا خەریکی شتێك بێ، وەك ئێستا زۆربەی مسوڵمانان وایان لێهاتوە.

ئەمەش چەند ئایەتێك لەوبارەوە:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) ئایەتەی (٢٠٨)دا دەفەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٠٨ ﴾،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە تێکڕا بچنە نێو ملکەچییەوە {بۆ خوا}و بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکراو دیارە.

یانی: ملکەچ بن بۆ تێکڕای ئەوە کە خوا ناردوویەتی، نەك گوڵبژێری تێدا بکەن.

٢- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَـٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَـٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ..﴿١٤﴾ ﴾.

واتە: لەوانەی گوتیان: ئێمە نەصرانیین، پەیمانمان لێ وەرگرتن، بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون، لەبیریان چوو، ئێمەش دوژمنایەتیی و ڕق و قینمان لەنێوان پەیدا کردن، هەتا ڕۆژی قیامەت.

ئەمە خوا سبحانە و تعالی دەربارەی خاوەن کتێبەکان دەیفەرموێ، بەڵام ئێستا بەسەر واقیعی مسوڵمانانیشدا چەسپاوە، ئێستا کێشەی نێوان سەلەفیی و صۆفیی، یان شیعەو سوننە، ئەو گرووپ و ئەو گرووپە، ئنجا هۆکارە سەرەکییەکەشی ئەوەیە ئایین و بەرنامەی خوا کە لە خودی خۆیدا فراوان و گشتگیرە، ئەو گرووپ و تاقمانە، دیارە هەر کامیان بەشێکی یان چەند بەشێکی لێ گرتووە، بەشێکی یان چەند بەشێکی لێ فەرامۆش کردوە، دیارە هەرکات یەکێك گوتی: دین تەنیا ئەو شتەیە، تۆش گوتت: نەخێر فلان شتەیە، ئەوە تێك دەگیرێن، وەك ئیمام غەززالیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، نموونەیەکی جوان دەهێنێتەوە، دەڵێ: کۆمەڵێك کوێر لە شارێك دەبن، فیلێکیان بۆ دەهێنن، ئەو کۆمەڵە کوێرەش دەچن بزانن داخۆ فیل چییە؟ یەکیان دەست لە گوێی دەدا، یەکیان دەست لە لمۆزی دەدا، یەکیان دەست لە پشتی دەدا، یەکیان دەست لە لاقی دەدا، دوایی لێیان دەپرسن: فیل چییە؟ ئەوەی دەستی لە گوێی داوە، دەڵێ: فیل شتێکی زۆر پانە، وەك گەڵای دار، بەڵام گەورەترە، ئەوەی دەستی لە لمۆزی داوە، دەڵێ: نەخێر وانیە، بەڵکو فیل شتێکە وەك گۆچان وایەو، زۆر درێژە، ئەوەی دەستیشی لە پشتی داوە، دەڵێ: فیل شتێکە وەك تەختە دارێکی پان و درێژ، ئەوەش کە دەستی لەلاقی داوە، دەڵێ: فیل وەك کۆڵەگە وایە، ئنجا

دەڵێ: لە ڕاستییدا هەموویان ڕاست دەکەن، بەڵام بەنسبەت بەشێك لە حەقیقەتی فیل و، هەمووشیان ڕاست ناکەن، بە نسبەت کۆی حەقیقەتی فیل.

بەڵێ ئەگەر ئینسان ئەو دینەی بەش بەش کرد، هەر کەسێك و هەر لایەك بەشێکی لێگرت، لە ئەنجامدا ناکۆکیی و دووبەرەکیی پەیدا دەبێ، بەڵێ تۆ ناتوانی هەموو ئیسلام جێبەجێ بکەی، بەڵام دەتوانی دان بە هەموویدا بێنی، گرنگ ئەوەیە هەمووی بسەلمێنی.

٣- خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الروم) ئایەتەکانی: (٣١و٣٢)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾.

واتە: وەك هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەوانەی کە دینەکەی خۆیانیان بەش بەش کردو بوونە تاقم تاقم. هەر تاقمە بەوەی لە لایەتی، دڵخۆشە.

بەڵێ ئەگەر تۆ لایەکت گرت لە دین، دەبی بە تاقمێك، ئەوەی دیکەش لایەکی دیکە دەگرێ و، دەبێ بە تاقمێك.

(إبن تيمية) دەڵێ: {أَنَّ سَبَبَ الِاجْتِمَاعِ وَالْأُلْفَةِ، جَمْعُ الدِّينِ وَالْعَمَلُ بِهِ كُلِّهِ، وَهُوَ عِبَادَةُ اللَّهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، كَمَا أَمَرَ بِهِ بَاطِنًا، وَظَاهِرًا، وَسَبَبُ الْفُرْقَةِ : تَرْكُ حَظٍّ مِمَّا أُمِرَ الْعَبْدُ بِهِ، وَالْبَغْيُ بَيْنَهُمْ}[1] واتە: هۆی کۆبوونەوەو تەبایی لەنێو مسوڵماناندا، ئەوەیە کە دین هەمووی کۆ بکرێتەوەو کاریشی پێ بکرێ، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خواو، هاوەڵ بۆ دانەنانی، وەك فەرمانی پێ کردوون بە پەنهانیی و بەئاشکرا بەندایەتیی بۆ بکرێ و، هۆی ناکۆکیی و دووبەرەکیی، بریتیە لە وازهێنانی بەشێك لەوەی کە بەندە فەرمانی پێ کراوە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە دەستدرێژیی و سنوور بەزێنیی بکەن.

---

(١) مجموع الفتاوى ج١ ص ١٧.

بنەمای
شەشەم

# میانجێتیی و هاوسەنگیی
# (التوسط والإعتدال)

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گەورەو گرنگی بەرنامەو ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانانەو، لەو بارەوەش ئایەتە بە پێزەکانی قورئان زۆرن، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٤٣)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:
﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا .. ﴿١٤٣﴾ ﴾.

واتە: بەو جۆرەی باسکرا ئێوەمان کردوە بە کۆمەڵێکی میانجیی {نە تێدەپەڕێنن، نە کورتی دێنن}.

٢-هەروەها خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (هود) ئایەتی (١١٢)دا دەفەرموێ:
﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ ﴾.

واتە: وەك فەرمانت پێ کراوە، ڕێك بوەستە، هەروەها ئەوانەش کە لە گەڵتدا گەڕاونەتەوە، سنوور شکێنیی مەکەن.

**چەند مەسەلەیەك کە جەماوەری مسوڵمانان میانجێتیی و هاوسەنگییان تێدا ڕەچاو کردووون:**

کە ئێمە حەوت (٧) مەسەلە لێرەدا بە نموونە دێنینەوە:

**١- مەسەلەی ئیمـــان:**

لەمەسەلەی ئیماندا، جەماوەرو زۆربەی مسوڵمانان لەنێوان خەواریج و مورجیئەدان، خەواریج گوتوویانە: هەموو کردەوەکان ئیمانن، بۆیە هەرکەسێك یەك فەرز بچوێنێ، کافر دەبێ و، هەرکەسێ یەك گوناح بکات، پێی کافر دەبێ، کە دیارە خەواریج تێیان پەڕاندوە.

لەبەرامبەریشدا مورجیئە گوتوویانە: ئینسان مادام گوتی: مسوڵمانم و ئیمانم هەیە، ئەگەر هەرچی واجبە بیچوێنێ و، هەرچی قەدەغەیە بیشکێنێ، زەرەر بە ئیمانی ناگەیەنێ!

بەڵام زۆربەی مسوڵمانان گوتوویانە: هەموو کردەوەیەك ئیمان نیەو، مرۆڤیش بەهیچ گوناهێك کافر نابێ، بەڵام واش نیە کە ئینسان هەرچەندە گوناهان بکا، ئیمانەکەی زەرەر نەهێنێ، گوتوویانە: ئیمان زیاد دەکاو کەم دەکات، بە فەرمانبەریی (طاعة) زیاد دەکات، بە سەرپێچیی کردنیش کەم دەکات.

**٢- مەسەلەی ناوو سیفەتەکانی خوا:**

لەو بارەوەش لەنێوان پەکخستن (تعطیل) و وێچواندن (تشبیە)دان، (مُعطِّلَة) ئەوانەن کە سیفەتەکان لە خوا دادەڕنن، کە بەحیساب بەرگریی لە خوا بەیەکگرتن، دەکەن، (تشبیە)یش ئەوەیە سیفەتەکان بۆ خوا بڕیار بدەی، بەڵام بیچوێنی بە دروستکراوەکانیەوە، کە حەنبەلییەکان زۆر جار وابوون و زۆر تێیانپەڕاندوە لە جێگیر کردنی سیفەتەکان، بەتایبەتی سیفەتە خەبەرییەکاندا، هەم (إبن تیمیة)و هەم هەندێ لە زانایانی دیکەش دەڵێن: حەنبییەلییەکان هەندێ شتیان

گوتوە، کە خەڵك قسەی لەسەریان بێ، هەیانبووە گوتوویەتی: خوا سبحانە و تعالی چوار مەشقیی لەسەر عەرش دانیشتوە، وەك چۆن ئێمە لەسەر کورسی دانیشتووین! بەڵکو هەبووە گوتوویەتی: عەرشەکە ئەوەندەی زیادە، بەڵام جەماوەری مسوڵمانان گوتوویانە: نەخێر، ئێمە نە سیفەتەکان لە خوا دادەڕنین و نە دەشڵێین: سیفەتەکانی خوا وەك هی دروستکراوەکانن، بەڵکو سیفەتەکان بۆ خوا دەچەسپێنین، بەڵام ناشهێڵین خوا بچوێنرێ بە دروستکراوەکانی.

### ٣- مەسەلەی کردەوەکانی خوا:

قەدەرییەکان (کە بەشێکن لە موعتەزیلەکان) گوتوویانە: ئینسان بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، بەڵام جەبرییەکان گوتوویانە: ئینسان هەرچی دەیکا، وەك پەڕی مریشك وایەو بەس ئیرادەی خوا دەیجووڵێنێ و ئینسان هیچی بەدەست نیە.

بەڵام زۆربەی مسوڵمانان گوتوویانە: نەوایە کە ئینسان بۆخۆی کردەوەکانی خۆی بخوڵقێنێ، نە واشە کە خوا بۆی بخوڵقێنێ و ئینسان هیچ دەوری نەبێ، وەك دواتریش باسی دەکەین.

### ٤- مەسەلەی هاوەڵان و ئال و بەیت:

شیعەی (رافضة) ڕقیان لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)و (ناصبة)ش ڕقیان لە خزمەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، یەزیدی کوڕی موعاویەو هەندێ لە ئومەوییەکان ڕقیان لە بنەماڵەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، هەروەك شیعەی (رافضة)ش ڕقیان لە هاوەڵان بووە، ئەمما هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە کە هەم هاوەڵەکانی پێغەمبەرت (صلی الله علیه وسلم) خۆش بوێن، هەم خزمەکانیشی.

**٥- مەسەلەی خەون و فیڕاسەت:**

جەماوەری زۆربەی مسوڵمانان نە نکووڵییان لە ڕاستیی خەون و فیڕاسەت کردوە، وەك موعتەزیلە، نە ئەوەش بووە کە بیانکەن بەبەشێك لەدین، وەك هەندێ لە ئەهلی تەصەووف کردوویانە.

**٦- مەسەلەی فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگریی کردن لە خراپە:**

نە ئەوە بووە بڵێن: واقیعێك بگۆڕرێ یان نەگۆڕرێ، هەر دەبێ بەگژیدا بچیەوە، نە ئەوەش بووە بڵێن: دەبێ ملکەچ بی بۆ واقیع، جەماوەرو زۆربەی مسوڵمانان لەو بارەوەش هەڵوێستێکی نێوەندییان هەبووە.

**٧- مەسەلەی ژیانی دنیا:**

نەوەك هەندێ لە ئەهلی تەصەووف، ڕایان وابووە واز لە ژیانی دنیا بێنی، نەواش بووە کە هەندێ دەڵێن: دنیا لەباوەش بگری، بەڵکو گوتوویانە: دنیا قۆناغێکە دەبێ بە شێوەیەکی ئەرێنییانەی ڕاست و دروست بگوزەرێنرێ، بەڵام بە گوێڕایەڵیی خواوە.

بنەمای
حەوتەم

# ڕاجیایی مسوڵمانان نابێتە هۆی تێکچوونی تەبایی و دۆستایەتییان

ئەمیش بنەماو تایبەتمەندییەکی دیکەی گەورەو گرنگی جەماوەری مسوڵمانانەو، خوای کاربەجێ لەو بارەوە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٥٩) دا دەفەرموێ:

﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾.

واتە: .. ئنجا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە ناکۆکیی، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (کەواتە: دەگونجێ ئەهلی حەق، مسوڵمانانی ڕاست و ڕەسەن، بکەونە ناکۆکییەوەو ڕاجیاییان هەبێ).

(إبن تیمیة) دەڵێ: {وَكَانُوا يَتَنَاظَرُونَ فِي الْمَسْأَلَةِ مُنَاظَرَةَ مُشَاوَرَةٍ وَمُنَاصَحَةٍ، وَرُبَّمَا اخْتَلَفَ قَوْلُهُمْ فِي الْمَسْأَلَةِ الْعِلْمِيَّةِ وَالْعَمَلِيَّةِ مَعَ بَقَاءِ الْأُلْفَةِ وَالْعِصْمَةِ وَأُخُوَّةِ الدِّينِ،

وَأَمَّا الِاخْتِلَافُ فِي "الْأَحْكَامِ" فَأَكْثَرُ مِنْ أَنْ يَنْضَبِطَ وَلَوْ كَانَ كُلَّمَا اخْتَلَفَ مُسْلِمَانِ فِي شَيْءٍ تَهَاجَرَا، لَمْ يَبْقَ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عِصْمَةٌ وَلَا أُخُوَّةٌ...}[١]، واتە: {پێشینی چاك و زۆربەی مسوڵمانان} جاری وابووە لە ڕووی ڕاوێژ پێکەوە کردن و دڵسۆزیی پێکەوە نواندنەوە، لە مەسەلەیەکدا موناقەشەیان بووەو ڕاجیاییشیان بووە، جا چ لەمەسەلەیەکی زانستیی، چ لە مەسەلەیەکی کردەییدا[٢]، بەڵام تەبایی و خۆشەویستییان لەنێواندا هەر بووەو، برایەتیی دینییان پارێزراو بووە، ئنجا ڕاجیایی لە یاساکانی شەریعەتدا، زۆر لەوە زیاترە کە کۆنترۆڵ بکرێ و، ئەگەر هات و هەر دوو مسوڵمانێك لەسەر شتێك ڕایان جیا بووایە، پێکەوە ناکۆك بوونایەو لێك دوور بکەوتنایەوە، مسوڵمانان یەکڕیزیی و برایەتییان نەدەما.

چەند نموونەیەك:

**أ- لە بواری ئیمان و عەقیدەدا:**

**١-** دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: {مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى الْفِرْيَةَ} رواه البخاري: **٧٥٣١**، ومسلم: **٤٣٨**.

دایکمان عائیشە ڕای وا بووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە شەوی بەرز بوونەوەو شەو ڕۆدا، خوای پەروەردگاری نەبینیوەو، گوتوویەتی: هەرکەسێ پێی وابێ کە موحەممەد پەروەردگاری خۆی بینیوە، ئەوە بوختانێکی گەورەی بەخواوە کردوە.

کەچی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە شەوی میعڕاجدا خوای پەروەردگاری بینیوەو، زۆربەی ئوممەتیش پشتگیریی قسەکەی (إبن عباس) دەکەن.

---

(١) مجموع الفتاوی ج٣ ص١٧٠.

(٢) دوایی باسی دەکەم کە مەسەلەی عیلمیی مەبەست پێی عەقیدەیەو، مەسەلەی کردەیی، مەبەست پێی هەڵس و کەوتەکانە.

٢- زۆربەی مسوڵمانان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە لە دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبو بەکرو عومەر، خوا لێیان ڕازی بێ باشترینی ئۆممەتن، بەڵام دوایی کە نۆرە گەیشتۆتە سەر عوسمان و عەلی، هەندێکیان گوتوویانە: عەلی لەپێش عوسمانەوەیەو، هەندێکیان گوتوویانە: عوسمان، خوا لێیان ڕازی بێ.

٣- دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، ڕای وابووە کەمردوو دوای ئەوەی دەمرێ، گوێی لەهیچ نابێ، بەڵام زانایانی دیکە گوتوویانە: نەخێر گوێی لێ دەبێ و، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەهێنن، کە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا جەنازەکانی کافرانی لە جەنگی بەدردا فڕێ دایە نێو قەلیبێکەوە (چاڵێکی گەورەوە) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی کرد: فلان و، فلان، فلان، ئەوەی خوا بەڵێنی پێ دابووم، بۆی هێنامە دی، ئایا ئەوەی خوا بەڵێنی بەئێوەش دابوو، بۆی هێنانە دی؟ یەکێ لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ کۆمەڵە کەلاکێك دەدوێنی، کە بۆگەن بوون و ڕووحیان تێدا نەماوە، بۆچی دەیاندوێنی؟ پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: {مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ} أخرجه أحمد برقم (١٢٠٣٩)، والبخاري برقم (٣٧٥٧)، ومسلم برقم (٢٨٧٤)، والنسائي برقم (٢٠٧٥). واتە: ئێوە لەوان باشتر گوێتان لە قسەکەی من نیە.

بەڵام دایکمان عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: (ما أنتم بأسمع)، بەڵکو فەرموویەتی: (ما أنتم بأعلم)، واتە: نەیفەرمووە: ئێستا گوێیان لە قسەکەی منە، بەڵکو فەرموویەتی: ئێستا دەزانن، نەك دەبیستن، بەڵگەشی بە قورئان هێناوەتەوەو گوتوویەتی: خوای بیسەر دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ ٢٢﴾ فاطر.

واتە: ئەوانەی لە گۆڕەکاندان، تۆ ناتوانی پێیان ببیستی.

هاوەڵانیش گوتوویانە: ئەوە مەبەست پێی کافرانە، بەڵام ئەوە تێك ناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا ئینسان کە دەشمرێ، دوای مردنیشی کافر یان مسوڵمان بێ،

گوێ بیست ببێ، بەڵام ناتوانێ وەڵام بداتەوە، هەڵبەتە وەك گوتم: هەردوو ڕایەكان هەن.

٤- هەروەها موعاویە ڕای وا بووە كە میعراج تەنیا خەون بووەو بە ڕووح بووەو، جەستەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرز نەبۆتەوەو شەو ڕۆیی نەكردوە، بەڵام زۆربەی زۆری زانایان ڕایان وایە كە میعراج بە ڕووح و جەستە بووەو، لە حاڵەتی بێداریی (یقظة)شدا بووە.

ئنجا تۆ تەماشا بكە! بێنن بەراوردی ئەو هەڵوێستانە بكەن لەگەڵ هی هەندێ لە مسوڵماناندا، كە نەك هەر لەو مەسەلانەدا، بەڵكو لەهەر مەسەلەیەكی فیقهییدا، هەر كەسێ ڕای وەك هی وی نەبوو، پێی وایە كە ئەوە لەبازنەی شوێنكەوتنی سەلەفی صاڵح و لە بازنەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چۆتە دەرێ، كە بە هەقیقەت ئەوە نەفامیی و نەزانینە!

ب- لەبواری یاسا كردەییەكاندا :

١- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای جەنگی خەندەق، فەرمووی: هەركەسێ ئیمانی بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە، دەبێ نوێژی عەسر لەلای بەنی (بنو قریظة) بكا، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، بوونە دوو ڕا:

١)- هەندێكیان گوتیان: مەبەستی ئەوە بووە كە ئێمە بەپەلە بچین، نوێژەكەیان كردو ڕۆیشتن.

٢)- بەڵام هەندێكیان گوتیان: نا مەبەستی ئەوە بووە، نوێژەكەمان بەرینە ئەوێ، ئیدی نوێژەكەیان نەكرد، تاكو چوونە ئەوێ، كە چوونە ئەوێ، نوێژی شێوانیش بەسەر چوو بوو، نەك هەر هی عەسر.

ئنجا كە ئەمە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسكرا، ڕەخنەی لە هیچ كام لەو دوو لایەنە نەگرت.

کە ئەمە دەقی فەرمووده‌کەیە: {لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ، فَأَدْرَكَ بَعْضَهُمْ الْعَصْرُ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذَلِكَ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ} أخرجه البخاري برقم (٩٠٤).

یانی: هەندێکیان ئیشیان بە نێوەڕۆك (محتوى)ی دەقەکە کردوەو، هەندێکیان ئیشیان بە ڕواڵەتی (ظاهر)ی دەقەکە کردوە، هەردووکیشیان ڕێیان تێچووە، بەڵام بە تەئکید ئەوانەی ئیشیان بە نێوەڕۆکەکەی کردوە، چاکتر پێکاویانە.

٢- مسوڵمانان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەر کەسێك دوو شایەتمانەکانی نەهێنان، بەکافر لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام بەنسبەت چوار کردەوەکانەوە واتە: نوێژو، زەکات و ڕۆژوو، حەج، ڕاجیاییان هەیە، بەتایبەتی بەنسبەت نوێژەوە، هەندێکیان گوتوویانە: هەر کەسێ نوێژ نەکا، کافرە، بەڵام ئەوە مەسەلەیەکی ڕاجیاییە، بەڵام ئایا کەس خیلافی لەوەدا هەبووە کە کەسێ شایەتمان نەهێنێ، کافربێ؟ نەخێر.

٣- هەروەها لەمەسەلەی دەستنوێژدا، ئایا بەچی دەشکێت؟ لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەوەی لە دوو ڕێیەکانەوە بێتە دەر (ما خَرَج من السَّبيلين) دەستنوێژ دەشکێنێ، بەڵام ئایا بەخوێن لێهاتن، بۆ وێنە: کەڵە شاخی لێ بگرن، یان بریندار بێ، یان خوێنێ ڕاسێ، هەروەها بە ڕشانەوە، ئایا دەستنوێژ بەمانە دەشکێ؟ هەندێ گوتوویانە بەڵێ و، هەندێ گوتوویانە نەخێر، کەسیش ئەوی دیکەی تۆمەتبار نەکردوە، هەندێکیش وەك خەتێکی نێوەڕاست گوتوویانە: ئەو شتانە دەستنوێژیان پێ ناشکێ، بەڵام واباشە دەست نوێژ بگرێتەوە.

هەروەها بە نسبەت خواردنی گۆشتی کوڵێنراوی وڵاخەوە، هەروەها بەوە کە ئینسان دەستی بەر عەورەتی خۆی بکەوێ، یاخود پیاو دەستی بە ئافرەت بکەوێ، یان ئافرت دەستی بە پیاو بکەوێ، هەروەها بەهۆی پێکەنینی بە قاقاوە؟ ئایا ئەوانە دەستنوێژیان پێ دەشکێ؟ هەندێکیان گوتوویانە: بەڵێ و، هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر، بەڵام هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: وا باشترە، ئەگەر ئەو شتانەی بوون، دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە، نەشکاوە بەڵام وا باشترە.

٤- هەروەها لە مەسەلەی سەردانی کردنی گۆڕستاندا: هەندێکیان گوتوویانە: نابێ سەردان بکرێ و ناپەسندە، بەڵام زۆربەیان گوتوویانە: شتێکی ڕەوایە.

٥- لە کاتی چوون بۆ لای گۆڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و سڵاو لێکردنیدا، کە سڵاوی لێ دەکەی، ئایا وا باشە ڕوو لە گۆڕەکە بکەی و پشت لە قیبلە بکەی، چونکە بە پێچەوانەی یەکدییەوەن، یاخود ڕوو لە قیبلە بکەی و پشت لە گۆڕی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەی، ئنجا سەلامی لێ بکەی؟ هەردووك ڕایەکان هەن.

هەروەها زۆر مەسەلەو بابەتی دیکەی لەم شێوەیە هەن و، بۆیەش بۆتان باس دەکەم، تاکو عەقڵ و دڵی خۆتان فراوان بکەن، ئەوەتا پێشینی چاکی ئێمە، لەو مەسەلانەدا کەوتوونەتە مشت و مڕو ڕاجیایی و، کەسیش ئەوی دیکەی تۆمەتبار نەکردوە، چونکە ئەویش بەڵگەی خۆی هەیەو، ئەویش بەڵگەی خۆی هەیە، بەڵام ساغی دەکەینەوە داخۆ کام لە قسەکان ڕاستترە.

بنەمای
هەشتەم

## گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و جێنشینە ڕێی ڕاست گرتووەکان

ئەمیش تایبەتمەندییەکی بەرجەستەو بنەڕەتیی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانانەو، لەو بارەوەش ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴿٩٠﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، تۆش بەدوای ڕێنمایی ئەوان بکەوە.

دوای ئەوە باسی هەژدە (١٨) لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، دەکات، ئاوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ، ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) پابەند کرابێ کە بەدوای پێغەمبەرانی پێش خۆی بکەوێ، ئایا ئێمە پابەند نەکراوین بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى

الله عليه وسلم)و، بەدوای چوار جێنشینەکانی بەتایبەت، بکەوین؟ بەتەئکید با.

٢- {عَنِ العِرْبَاض بِن سارِيةٍ قالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصُّبْحَ ذَاتَ يَوْمٍ ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ فَقَالَ: قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟ فَقَالَ: (أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًّا، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، فَتَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ)} أخرجه أحمد برقم (١٧١٨٤)، وأبو داود برقم (٤٦٠٧)، والترمذي برقم (٢٦٧٦) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٤٢)، والحاكم برقم (٣٢٩) وقال: صحيح ليس له علة، والبيهقي برقم (٢٠١٢٥)، وأخرجه أيضا: ابن حبان برقم (٥)، والدارمي برقم (٩٥)، قال الألباني: صحيح، في سلسلة الصحيحة برقم (٢٧٣٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح ورجاله ثقات.

(العِرْبَاض بِن سارِيةٍ) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا نوێژی بەیانی بۆ کردین، پاشان سڵاوی دایەوەو ڕووی تێ کردین، ئامۆژگارییەکی زۆر کاریگەری کردین، چاومان فرمێسکی پێ داهات و، دڵمان لەرزی، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم ئامۆژگارییەت وەك ئامۆژگاریی کەسێکە کە ماڵ ئاوایی دەکات، بەچی ئامۆژگارییمان دەکەی، چی بکەین؟ فەرمووی: ئامۆژگارییتان دەکەم بە تەقوای خوا {پارێز لە خوا بکەن} و ببیستن و فەرمانبەریی بکەن {بۆ حوکمڕانی خۆتان} ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشەییش بێ، هەر کەسێ لە ئێوە لەدوای من بژیی، ڕاجیایی و ناکۆکیی زۆر دەبینێ، ئێوە ڕێبازی من و ڕێبازی جێنشینە سەرڕاستە هیدایەت دراوەکان بگرن، بەددان بیگرن و، خۆتان لە شتە پەیدا کراوەکان بپارێزن، چونکە هەموو پەیدا کراوێك بیدعەتەو، هەموو بیدعەتێکیش گومڕاییە.[1]

---

(١) با لێرەدا شتێکتان پێ بڵێم: زۆر کەس وا دەزانێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ڕێبازی من و جێنشینە سەر ڕاستەکان بگرن، واتە: ئەوان چییان گوتوە وەك دین، بۆ ئێمە دەبێتە پابەندکەر (ملزِم)، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، ڕێبازی پێغەمبەر ئەوە

بەڵێ زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان لەسەر ئەوە بوون، کە بەدوای چوار خەلیفە ڕاشیدەکان بکەون، شیعەش کە جیا بوونەوە لە زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، لێرەدایە[1]، ئنجا کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ڕێبازی من و ڕێبازی ئەوان بگرن، واتە: لە شێوەی حوکمڕانیی و وڵات بەڕێوە بردندا.

---

ڕێبازی پێغەمبەرە، ئەدی بۆچی دەفەرموێ: هەروەها ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان؟ یانی: لە ڕووی حوکمڕانییەوە، لێرەدا مەبەست پێی مەسەلەی حوکمڕانییە، چونکە دوایی باس دەکاو دەفەرموێ: هەرکەسێ لەدوای من بژیی، ناکۆکیی زۆر دەبینێ، کە مەبەست بواری سیاسییە، ئایا لەڕووی سیاسییەوە چی بکەین؟ دەفەرموێ: بەدوای ڕێبای من و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان بکەون، کە بەتەئکید چوار خەلیفە ڕاشیدەکان دەچنە نێوی، بەڵکو هەندێك دەڵێن: بەس ئەوانن.

(١) جارێك لەگەڵ مەلایەکی شیعە لە لوبنان موناقەشەیەکم بوو، لەساڵی (١٩٩٦)دا دەیگوت: با وتووێژ بکەین، مەبەستی پێ ئەوە بوو، ئێمە ببین بە شیعە، دوای ئەوەی کە قسەکانی تەواو کردن، منیش گوتم: من پێم وایە سوننەو شیعە بەیەك شت ئیشکالیان نامێنێ، گوتی بەچی؟ گوتم: بەوە کە هەمووومان بەدوای عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بکەوین، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو، گوتی: (بارك الله فيك)، منیش گوتم: بەڵام عەلی خوا لێی ڕازی بێ، چۆنی بەدوا بکەوین؟ ئەو عەلییەی ئێمە دەیناسین، پیاوێکی زۆر هەق بێژ بووە، زۆر چاو نەترس بووە، زۆر بوێر بووە، ئەوەی بەزمانی گوتوویەتی، بە کردەوەش کردوویەتی، بەیعەتی داوە بە ئەبو بەکر، واتە: بە سەرۆکی سیاسی خۆی لەقەڵەمی داوە، نوێژیشی لەدوا کردوە، کەواتە: بە ئیمامیشی لەقەڵەم داوە، دوای ئەبو بەکریش بەهەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵ عومەرو عوسماندا -خوا لێیان ڕازی بێ- کردوە، کەواتە: عەلی خوا لێی ڕازی بێ، هەر کام لەو سێ خەلیفەیەی بەسەرۆکی دنیایی خۆی داناون و بەیعەتی پێ داون، ڕاستیشی کردوە لە بەیعەتەکەیدا، ئێمە باوەڕمان وایە کە عەلی قەناعەتی بەوە بووە کە ئەوان گەورەیی و حوکمڕانینی، دوایی نوێژیشی لەدوا کردوون و بە ئیمامیشی داناون، گوتم: ئەگەر ئێمەش هەموومان وەك عەلی بکەین، هیچ موشکیلە نامێنێ، ئێمە عەلییمان پێ لەوە گەورەترە بڵێین: قەناعەتیشی وا نەبووە، بەڵام وای کردوە، ئەمە نیفاق و ئیزدیواجیەتەو، عەلی خوا لێی ڕازی بێ، زۆر لەوە ئازا تر بووەو زۆر لەوە بوێر تر بووە، کە شتێك قەناعەتی پێ نەبێ، بیڵێ، یان بیکا.

تێبینی: ئەم بەسەرهاتەم تێروتەسەلتر لە (الكتاب الحادي عشر)ی (موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا هێناوە.

٣-لە فەرمایشتێکدا هاتوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْخِلَافَةُ فِي أُمَّتِي ثَلَاثُونَ سَنَةً ثُمَّ مُلْكٌ بَعْدَ ذَلِكَ} أخرجه الطيالسي برقم (١١٠٧)، وأحمد برقم (٢١٩٦٩)، ونعيم بن حماد في الفتن برقم (٢٤٩)، والبغوي في الجعديات برقم (٣٣٢٣)، وابن حبان برقم (٦٩٤٣)، والترمذي برقم (٢٢٢٦) وقال: حسن، والطبراني برقم (٦٤٤٣)، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٨١٥٥)، وابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني برقم (١١٣)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

واتە: جێنشینایەتیی لە ئۆممەتی مندا ماوەکەی سی (٣٠) ساڵە، دوایی دەبێتە پادشایەتیی.

بۆ زانیارییتان! دوو ساڵ و چەند مانگەکەی ئەبو بەکر، لەگەڵ دە (١٠) ساڵ و شەش مانگەکەی عومەر، لەگەڵ دوازدە (١٢) ساڵ و چەند مانگەکەی عوسمان، لەگەڵ پێنج شەش ساڵەکەی عەلی، لەگەڵ شەش مانگەکەی حەسەنی کوڕی عەلی، خوا لێیان ڕازی بێ، دەبێتە سی (٣٠) ساڵی تەواو، کەواتە: لەدوای ئەوەوە کە سەردەمی موعاویە دەست پێ دەکات، بە پادشایەتیی (ملوكية) لەقەڵەم دەدرێ.

مسوڵمانان ئەو کاتە، هەموویان لەسەرحوکمڕانێتی ئەبو بەکر کۆبوون، دوای ئەو لەسەر عومەر، دوای ئەو لەسەر عوسمان، دوای ئەو لەسەر عەلی، جگە لە موعاویە، موعاویەش نەیدەگوت: تۆ خەلیفە نی، بەڵام دەیگوت: عوسمان کوژراوە بە زوڵم و دەبێ بکوژەکانی تۆڵەیان لێ بستێنرێتەوە، کەواتە: هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، هەموویان یەك دەنگ بوون لەسەر سێ خەلیفەکان، بەڵام هی عەلی مشت و مڕێکی تێدا پەیدا بووە، بەڵام ئێمە پێمان وایە: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە عەمماری کوڕی یاسری فەرمووە: {تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ} أخرجه أحمد برقم ( ٦٩٢٦) والترمذي برقم (٣٨٠٠) وقال: حسن صحيح غريب، وقال الألباني في السلسلة الصحيحة: صحيح، برقم (٧١٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: کۆمەڵەی یاخییان تۆ دەکوژێ.

کەواتە: گرووپی موعاویە یاخیی بوون و، عەلی خوا لێی ڕازی بێ، خەلیفەی بە هەق بووە.

کەواتە: یەکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ڕێبازی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، ئەوەیە کە: بەدوای ڕێبازی پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕاشیدەکانی دەکەون، لە شێوەی حوکمڕانییدا، نەك ئەوان هەر شتێکیان گوتبێ، بۆ ئێمە ببێتە دینێکی پابەندکەر، ئەوە وا نیە، بەڵکو لە هێڵە گشتییەکانی حوکمڕانییدا، ئەو چوار خەلیفەیە وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حوکمیان کردوە، بەدادگەریی حوکمیان کردوە، زاهیدو دنیا بەکەم گر بوون، خاکیی بوون، پابەند بوون بە شەریعەتەوە، برایەتییان کردوە، ناشڵێین: پارێزراو بوون لە هەڵە، بەڵام بەگشتیی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆیشتوون.

بنەمای
نۆیـەم

## پەیداکردن لە دینداریی دا قەدەغەیە،
## داهێنان لە دنیاداریی دا پێویستە

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە زۆربەی مسوڵمانان، واتە: جیا لە پێڕو تاقمە لادەرەکان، ئەو مسوڵمانانەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و، خەلیفە ڕاشیدەکان خوا لێیان رازی بێ و، هاوەڵانی بەڕێزی بە گشتی خوا لێیان ڕازی بێ، ڕۆیشتوون، یەکێك لە تایبەتمەندییە گشتییەکان، کە پێیانەوە پابەند بوون، ئەوەیە کە: پەیداکردنیان لە دینداربیدا، زۆر پێ شتێکی خراپ و حەڕام و قەدەغە بووە، بە پێچەوانەی بواری دنیاداریی و مامەڵە و هەڵسوکەوتەوە، کە داهێنان تێیدا شتێکی پێویستە، نەك هەر دروستە، بەڵکو شتێکی پێویستیشە.

با سەرەتا تەماشای چەند دەقێك بکەین، دوایی دێینە سەر پێناسەی داهێنان لە دیندا (الإِبْتِداعُ في الدينِ)و، داهێنان لە دنیادا (الإبداع في الدنيا) مەبەستمان پێیان چییە؟

١- خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾،

(دیارە خوا سبحانه و تعالى بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ)، واتە: بڵێ ئەگەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن و، لە گوناحەکانتان دەتانبووری، خوا لێبووردەی میهرەبانە، بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە بێگومان خوا کافرانی خۆش ناوێن.

واتە: هەرکەسێك پشت لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکات بە گشتیی، ئەوە دەچێتە ڕیزی کافرانەوە، چونکە مسوڵمانەتیی هیچ مانایەکی نیە، ئەگەر بریتی نەبێ لە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)، هەڵبەتە بە گشتیی، ئنجا ئینسان چەند لە خوا نزیکتر بێ، زیاتر چاو لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکات و، زیاتر بە شوێن پێی ئەودا هەنگاو دەنێ، لە وردودرشتیدا، پێشتریش باسمان کرد کە ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، {سوننەت} شتێك نیە لە بەرانبەر قورئاندا بێ، بەڵکو (سنة) بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان و، بەرجەستەکردنی قورئان لە واقعیی ژیاندا، لە بواری کەسیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

٢- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە فەرموودەی زۆرن، کە نابێ لە دینداریدا شت پەیدا بکرێ، یەکێك لە فەرموودەکانی: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا ما لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ} أخرجه البخاري برقم (٢٥٥٠)، ومسلم برقم (١٧١٨).

واتە: هەرکەسێك لەم ئایینەی ئێمەدا شتێك پەیدا بکات، کە لێی جیا بێ، پێی بێگانە بێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.

٣- لە فەرموودەیەکی دیکەدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ} أخرجه أحمد برقم (٢٥١٧١)، ومسلم برقم (١٧١٨)، وأخرجه أيضا: أبو عوانة برقم (٦٤٠٩)، والدارقطني (٢٢٧/٤).

واتە: هەرکەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت، (واتە: بەپێی وەحیی نەبێت) ئەوە ڕەتکراوەیە.

٤- لەبەشێکی فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە، دەفەرموێ: {فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ}, أخرجه أحمد برقم (١٤٣٧٣)، ومسلم برقم (٨٦٧)، والنسائي برقم (١٥٧٨)، وابن ماجة برقم (٤٥).

واتە: بێگومان باشترین فەرموودە، کتێبی خوایەو، چاکترین ڕێ و شوێن، ڕێ و شوێنی موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم)و، خراپترینی کارەکان، پەیداکراوەکانن و، هەموو داهێندراوێکیش گومڕاییە.

ئەوە بەنسبەت پەیداکردن و، داهێنان لە دینداریدا، کە ئەوە ڕەتکراوەیە و خراپە، بەڵام بەنسبەت داهێنان لە دنیادارییدا، بە پێچەوانەی داهێنانەوە لە دیندا، شتێکی پەسندو ویستراوە، بەڵکو شتێکی پێویستە، لەو بارەشەوە دەتوانین زۆر بەڵگان بێنینەوە:

٥- یەکیان ئەم ڕستە قورئانییەیە کە لە سووڕەتی (الزمر)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾.

(خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ ) موژدە بدە بە بەندەکانم، ئەوانەی کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، دوایی شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، ئەوانە خاوەن عەقڵانن.

زۆر جاران گوتوومە: عاقڵ ئەو کەسەیە، کە بە عەقڵی خەڵك، خۆی دەوڵەمەند بکات، عالیم ئەو کەسەیە بە عیلمی خەڵك خۆی دەوڵەمەند بکات، بەڵام هەر کەسێك پێی وابێ عەقڵی ئەو بەشی هەموو شتێك دەکاو، عیلمەکەشی بەشی زانینی هەموو شتێك دەکات، بەدڵنیایی ئەوە لە نەزانیی و نەفامییدا دەمێنێتەوە.

ئنجا ئێمە بۆ سەلماندنی ئەوە کە داهێنان لەبواری دنیادارییدا پێویستە، پێویستییمان بە بەڵگەی نەقڵییش ناکات، چونکە هەرشتێك عەقڵی سەلیم گەیاندی و دەلالەتی لەسەر کرد، ئێمە پێویست ناکا بەڵگەی نەقڵیی بۆ بێنینەوە، تەماشا دەکەی: کافرستان و وڵاتانی کافرو نامسوڵمان، لەبەر ئەوەی عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە لەبواری دنیادارییدا، پێشکەوتوون، بەڵام هەرکەس عەقڵی خۆی بەکارنەهێنێ، با مسوڵمانیش بێ، دوا دەکەوێ.

هەڵبەتە لەبورای دینداریی‌شدا هەر پێویستییمان بە بەکارهێنانی عەقڵ دەکات، بەڵام لەو شتانەدا کە وەحیی بڕاندوونیەوە، بواری بەکارهێنانی عەقڵ نیە، شتێك پەکی لەسەر وەحیی کەوتبێ، نابێ بگەڕێیەوە بۆ عەقڵ، بۆ وێنە: خوا سبحانە و تعالی چۆنە؟ سیفەتەکانی و ناوەکانی و، دەبێ چۆن بڕوا بە فریشتەکانی خواو بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی بێنین؟ دەبێ چۆن دروشمەکانی خوا پەرستیی ئەنجام بدەین و چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بکەین؟ چۆن لە خوا بپاڕێینەوە؟ چۆن هەموو ئەو شتانە ئەنجام بدەین، کە لە ڕێگای وەحییەوە نەبێ نازاندرێن؟ دەبێ چاوەڕێی وەحیی بکەین، بەڵام دنیاداریی و هەڵس و کەوتی نێو خۆمان، ئەوەیە کە: پەکی لەسەر وەحیی ناکەوێ و، لەوێدا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ عەقڵ و بەرهەمی عەقڵ، کە بریتیە: لە زانست و شارەزایی ئەزموون و...هتد.

**پێناسەی بیدعەت: (تَعْريفُ البِدعَة):**

**أ- لە ڕووی زمانەوانییەوە:**

{البِدعَةُ فِي اللغةِ: مأخُوذَةٌ مِنَ البَدْعِ وَهوَ الإختراعُ على غَيْرِ مِثالٍ سابِق، ومنهُ قَولهُ تَعَالى: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١١٧﴾ ﴾ البقرة، أَي: مُختَرِعُهما عَلى غَيْرِ مِثَالٍ سَابِق، وقَوله تعالى: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٩﴾ ﴾ الأحقاف، أَي: ما كنت أوّل من جاء بالرسالة من الله إلى العباد، بل تقدّمني كثير من الرسل، ويقال: إبتدع فلان بدعة، أي: إبتدأ طريقةً لَم يُسبَق إلَيهَا}.

واتە: لە ڕووی زمانەوانییەوە بیدعەت لە (بَدْع)ەوە هاتوە، (بَدْع)یش بریتیە لەوە کە شتێك پەیدابکرێ، بێ ئەوەی کە وێنەی بووبێ، وەك خوا دەفەرمویٰ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴿١١٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوی، کە پێشتر وێنەیان نەبووە، خوا بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٰ: ﴿ قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ من شتێکی نویٰ و تازە پەیدابوو نیم، لە نێو پێغەمبەراندا، واتە: من یەکەم کەس نیم، کە پەیامم لە خواوە بۆ بەندەکانی هێنابێ، بەڵکو زۆر لە پێغەمبەران پێش من کەوتوون و، من بیدعەتێك نیم پەیداکراوێك نیم لەو بوارەدا، دەگوترێ: (إبتَدَعَ فُلانٌ بِدعَة)، یانی: ڕێبازێکی داهێنا، کە پێشتر کەس ئەوەی نەکردوە.

**ب- لە ڕووی زاراوەییەوە**[1]:

سێ پێناسەم هێناون، بۆ وشەی (بدعة) لە عورف و باوی زانایاندا، کە پێناسەکان لێك نزیکن:

١- {هي كل اعتقاد، أو عبادة، لم يشرِّعْها الله تعالى ورسوله في الدين، أي: لم يأت على فعله دليل شرعي من الكِتاب والسنة}، واتە: بیدعەت بریتیە لە هەر بیرو بڕوایەك، یان هەر خواپەرستییەك، کە نەخوا سسبحانە و تعالى، نە پێغەمەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، دایاننابێ، لە دیندا، واتە: هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی لە قورئان و سوننەتدا لەسەر ئەو شتە نەبێ، ئنجا ئەو شتە چ پەیوەندیی بە عەقیدەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە عیبادەتەوە هەبێ.

٢- هەندێکی دیکە لە زانایان، کە (الشاطبي) لە (الموافقات) داو، لە کتێبی

---

(١) کە دەگوترێ: زاراوەیی، بۆ زانیارییتان! واتە: ئەوەی کە زانایان لەسەری ڕێککەوتوون، ئەو وشەیە بۆ ئەو واتایە بەکاربێنن، ئێستا (الصلاة) لە زماندا بەمانای (دعاء) دێ، بەڵام لە (إصطلاح)دا، کە شەرعزانان لەسەری ڕێککەوتوون، بە (الصلاة) ناگوترێ: دوعا، دەگوترێ: (أفعالٌ وأقوالٌ مُفتَتَحَةٌ بالتكبير، مُختَمَةٌ بالتسليم)، واتە: چەند قسە و کردەوەیەکن بە (ألله أكبر) دەست پێدەکەن، بە سڵاودانەوە کۆتاییان دێ، ئەوە مانای زاراوەیی نوێژە، بەڵام مانای زمانەوانیەکەی بریتیە لە (دعاء).

(الإعتصام)دا، وای پێناسە کردوە، دەڵێ: {البدعة: طريقة مخترعة تضاهي الشريعة الغرّاء بقصد التعبُّد والتقرُّب إلى الله تبارك وتعالى}، واتە: بیدعەت بریتیە: لە ڕێبازێکی داهێنراو، کە لە بەرانبەر شەریعەتی پاکدایە، بەمەبەستی بەندایەتیی بۆ خوا کردن و نزیك بوونەوە لە خوا تبارك و تعالی.

کەواتە: ئەمەیان تیشکێکی زیاتری خستە سەر پێناسەی بیدعەت، کە دەبێ مەبەست لەو پەیداکردنە، وێڕای ئەوە کە لەبواری عەقیدەو عیبادەتدایە، مەبەستیش پێی لەخوا نزیك بوونەوەو بەندایەتیی بۆ خوا کردنە.

٣- هەندێکی دیکە زانایان لە پێناسەی سێیەمدا ڕوونتریان کردۆتەوە، کە دەڵێ:

{البدعة في الدين نوعان:

النوع الأول: بدعة قولية اعتقادية، كمقالات الجهمية والمعتزلة والرافضة وسائر الفرق الضالة واعتقاداتهم.

النوع الثاني: بدعة في العبادات، كالتعبد لله بعبادة لم يُشَرِّعْها، ولم يكن قد فعلها النبـي ولا أمر بها ولا أقرّها، ولا فَعَلتْها الصَّحابة}.

واتە: بیدعەت لە دیندا، داهێنان لە دینداریی دا، دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** بریتیە لە داهێنانێك لە ڕووی عەقیدەوە، واتە: داهێنانێکی گوتەیی، وەك ئەو بیرو بڕوایانەو ئەو قسانەی کە تاقمە گومڕایەکان کە پێچەوانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن، دایانهێناون، وەك: جەهمییەکان و موعتەزیلە و قەدەرییە و ڕافیزەو ...هتد[1].

---

(١) دوایی بە تەفصیل باسیان دەکەین، کە ئەوانە هەموو پەیوەندییان بە عەقیدەوە هەیە، بۆ وێنە: جەهمییەکان ئینکاریان کردوە لە سیفەتەکانی خوا، موعتەزیلە زۆر پشتیان بە عەقڵ بەستوە لەسەر حیسابی نەقڵ، قەدەرییەکان نکووڵیان کردوە کە خوا هەموو شتێك بزانێ و، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێك بێ، ڕافیزە نکووڵییان کردوە لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لە ڕێی هاوەڵانەوە بە ئێمە گەیشتوون و، هاوەڵانیان جەرح کردوە، گوتوویانە: دادگەر نین و متمانەیان پێ ناکرێ.

**جۆری دووەم:** بیدعەت لەبواری خوا پەرستییەکاندا، واتە: بەندایەتیی کردن بۆ خوا بە شێوەیەك کە خوا داینەناوەو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، نەکردوویەتی و، نە فەرمانی پێکردوەو، نە دانیشی پێداهێناوە، هەروەها هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ[1].

**تێبینییەکی گرنگ دەربارەی بیدعەت:**

هەڵبەتە لە زۆربەی کتێبەکاندا ئاوا پێناسەی بیدعەت کراوە، کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کرد، هەر بۆ وێنە: کتێبی: {الوجیز في عقیدة السلف الصالح}ی {علي بن حسن الأثري} و، کتێبی {الإرشاد إلی صحیح الإعتقاد}ی {صالح الفوزان} و، زانایانی دیکەش، هەر بەم شێوەیەیان پێناسە کردوە، وەك هەر کام لە: {إبن بازو إبن عُثیمین} و هەموو زانایانی دیکەی پێشتریش، هەر ئاوا پێناسەی بیدعەتیان کردوە، کە بیدعەت تایبەتە بە: بواری عەقیدە و عیبادەتەوە.

ئنجا خوشك و برایان! جێی سەرسوڕمان ئەوەیە، وەك لە کتێبی {جەژن و بۆنە و یادەکان و هەڵسەنگاندنێك}دا باسم کردوەو، قسەی هەر کام لە: (إبن بازو إبن عثیمین)م ڕەحمەتی خوایان لێبێ، هێناوە: زۆر بەڕوونیی دەڵێن: بیدعەت تایبەتە بە بواری عەقیدە و عیبادەتەوە، دوایی کە دێنە سەر باسی (یاد و بۆنەکان) دەڵێن: ئەوانە هەموویان حەرامن، لەبەر ئەوەی بیدعەتن، من لەوێدا قسەکانی وانم باش هەڵوەشاندۆتەوە، چونکە لەلایەکەوە تۆ دەڵێی: بیدعەت تایبەتە بە بواری عەقیدە و عیبادەتەوە، ئنجا لە لایەکی دیکەشەوە: ئایا ئەوە کە خەڵك، یادی ڕۆژی (دار و درەخت) دەکات، یادی (ڕۆژی دایك) دەکات، یادی (ڕۆژی ڕۆژنامەنووسان) دەکا، یادی (کۆڕەو) دەکات، یادی (دانانی پەرلەمان) دەکات، هەروەها هەموو بۆنەو یادە جیهانییەکان، پیشەییەکان، نیشتیمانییەکان، نەتەوەییەکان، هەروەها یادە دینییەکانیش بۆ وێنە:

---

(١) هەڵبەتە دین هەر لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وەردەگیرێ، بەڵام ئەو کتێبە کە لێم وەرگرتوە باسی هاوەڵانیشی کردوە، لەبەر ئەوەی هاوەڵانیش شتێکیان نەکردوەو نەگوتوە، کە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، نەیان دیبێ و نەیان بیستبێ.

یادی لە دایك بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یادی کۆچکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یادی شەوڕۆیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یادی جەنگی بەدر، یادی ئازادکردنی مەککە، بەڵێ، ئایا ئەوە چ پەیوەندییەکی بە عەقیدە و عیبادەتەوە هەیە؟! بەدڵنیایی تەنیا پەیوەندییان بە هەڵسوکەوتەکانی خۆمانەوە هەیە، کەواتە: بیدعەت بردنە نێو یاد و بۆنەکان، پێچەوانەی ئەوەیە کە تۆ بیدعەتت پێ پێناسە کردوە! وەك لەو کتێبەشمدا -کە پێشتر ناوم هێنا- جوانم ڕوون کردۆتەوە، ئێستاش لەگەڵدا بێ، خەڵکێك هەر مشتومڕ دەکات، ئەرێ دروستە لە مانگی ڕەبیعی یەکەمدا یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەینەوە؟ کەسانێك دەڵێن: نەخێر دروست نیە، لەبەر ئەوەی داهێندراوەو لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نەبووە!! بەڵام زۆر زۆر شتی دیکەش لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نەبووە، بەڵام مادام پەیوەندیی بەبواری هەڵسوکەوتەکانی نێوان خۆمانەوە هەیە، بیدعەت ناچێتەوە نێوی، مەگەر کەسێك بەغەڵەت پێی وابێ بەشێکە لەدین، ئەگەر پێی وابێ و وەك عیبادەتێك ئەنجامی دەدات، ئەوکاتە دەڵێین: خەتای خۆیەتی، چونکە هەر شتێك وەك عیبادەت ئەنجام بدرێ و، لەسەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یشدا نەبووبێ، خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دایان نەنابێ، بە تەئکید ئەوە بیدعەتە، بەڵام بواری هەڵسوکەوتەکان، ئەصڵ تێیدا دەستکراوەییە، وەك دوای باسی دەکەین، بە پێچەوانەی عەقیدە و عیبادەتەوە، کە ئەصڵ و بناغە تێیاندا ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، جگە لەوە، بە داهێنان دادەنرێ.

جارێك یەکێك لەپەیجەکەی خۆمدا بۆی نوسیبووم: چۆن دەڵێی: یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبواری عادەت دایە، ئایا نازانی کە خەڵك چێشت و پڵاو دروست دەکات و، شیرینی دەبەخشێتەوەو، ئاهەنگ دەگێڕێ...هتد، بەتەمای پاداشتە؟

بەڵام ئەوەش هەر حاڵی نەبوونە لە دین! چونکە ئایا پاداشت تەنیا پەیوەندیی بە عیبادەتەوە هەیە؟! ئەدی ئەوە نیە فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه

وسلم)، دەفەرموێ: {تَبَسُّمُكَ فِي وَجه أَخِيكَ صَدَقة} أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم (٨٩١)، والترمذي برقم (١٩٥٦) وقال: حسن غريب، وابن حبان برقم (٥٢٩)، وأخرجه أيضا: البزار برقم (٤٠٧٠)، قال الألباني: حديث حسن، في السلسلة الصحيحة برقم: (٥٧٢).

واتە: زەردەخەنە کردنت لە ڕووی برایەکەتدا، خێرو چاکەیە.

ئایا ئەوە چ پەیوەندییەکی بە عیبادەتەوە هەیە؟ من لە ڕووی ئێوەدا ڕووم خۆش بێ، چ پەیوەدەندییەکی بە عیبادەتەوە هەیە؟

هەروەها دەفەرموێ: {والكَلِمَةُ الطَيِّبةُ صَدَقَة} أخرجه أحمد برقم (٨١٦٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: قسەیەکی خۆش خێرو چاکەیە.

قسەی خۆش و زەردە خەنە لە ڕووی برا و خوشکی خۆتدا، چاکەیەکە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: {مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا} أخرجه أحمد برقم (١٨٥٧٠)، وأبو داود برقم (٥٢١٢)، والترمذي برقم (٢٧٢٧) وقال: حسن غريب، وابن ماجه برقم (٣٧٠٣)، والبيهقي برقم (١٣٣٤٩)، وأخرجه أيضا: ابن أبي شيبة برقم (٢٥٧١٧)، قال الألباني: صحيح، في السلسلة الصحيحة برقم: (٥٢٥)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: دوو مسوڵمان دەگەنە یەك، تۆقە دەکەن، خوا لە گوناهەکانیان خۆش دەبێ، بەر لەوەی لێك جیا ببنەوە.

بەڵێ هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، پاداشتیان لەبەرانبەردا هەیە، ئەگەر بۆ خوا ئەنجام بدرێن، ئنجا چ بەمانا تەسکەکەی (عبادة) بە عیبادەت لە قەڵەم بدرێن و مامەڵە بن لەگەڵ خوادا، چ بەمانای فراوانی خوا پەرستیی (عبادة) بەپەرستن دابنرێن و، مامەڵە بن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، بەڵکو

لەگەڵ دروستکراوەکانی خوادا، ئەدی لە (صحيح البخاري)دا نەهاتوە، دەڵێ: ئافرەتێك، یان پیاوێك بە هۆی ئەوەوە چووە بەهەشت، کە سەگێکی تینووی ئاودا، هەتا یەکێك لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم)، ئایا ئێمە لە ئاژەڵانیشدا پاداشتمان هەیە، کە چاکەیان لەگەڵدا بکەین؟! فەرمووی: {فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ} أخرجه البخاري برقم (٢٣٣٤).

واتە: هەر شتێك ژیاندار بێ، تۆ چاکەی لەگەڵدا بکەی (مێروولەیەك بێ، پەڕەوەرێك بێ، هەر شتێك بێ تۆ چاکەی لەگەڵ بکەی) پاداشتی هەیە[1].

(إبن تيمية)ش ڕەحمەتی خوای لێبی لەبارەی بیدعەتەوە دەڵێ: {و"الْبِدْعَةُ" الَّتِي يُعَدُّ بِهَا الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ، مَا اشْتَهَرَ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالسُّنَّةِ، مُخَالَفَتُهَا لِلْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، كَبِدْعَةِ الْخَوَارِجِ وَالرَّوَافِضِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَالْمُرْجِئَةِ ...}[2].

واتە: ئەو بیدعەتەی کە پیاوێك[3]، بەهۆیەوە دەچێتە ڕیزی (أهلُ الأهواء) و پێی دەگوترێ: ئەهلی بیدعەت، ئەوەیە کە: لەلای شارەزایان بە ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، زاندراوە کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، وەك داهێنانی خەواریج و ڕەوافیزو قەدەرییەو مورجیئە.

کە خۆتان دەزانن لادانەکانی ئەوانە هەموویان، پەیوەندییان بەلایەنی عەقیدەییەوە هەیە.

لە کۆتایی ئەم باسەشدا سێ بنەماتان دەخەمەوە بیر:

**بنەمای یەکەم:** زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن دەڵێن: (الأصلُ في العبادات الحظرُ، إلاّ ما شَرَّعَه الشارع, والأصل في العادات: الإباحة، إلاّ ما منعه الشارع)، واتە: بناغە

---

(١) جارێك برایەك لێی پرسیم گوتی: ئایا مامۆستا! هەر بەوەندە کابرا دەچێتە بەهەشت؟! گوتم: نا، بەڵام وادیارە ئەو کەسە ئیماندارو مسوڵمان بووەو واجبەکانی جێبەجێ کردن و، ئەوەش یەکێك بووە لەو کردەوە چاکانەی کە پێی چۆتە بەهەشت، نەك ئیمانی نەبێ و سەگێکی تینوو ئاوبدات بچێتە بەهەشت! شتی وا نیە، دەبێ وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، ئاوا لەفەرمایشتەکانی تێبگەین.

(٢) مجموع الفتاوي، ج٣٥ ص ٤١٤.

(٣) سیاقەکە باسی پیاوانە، ئەگەرنا ئافرەتیش بەهەمان شێوە.

لە خواپەرستییەکاندا، بریتیە لە قەدەغەکردن، جگە لەوەی کە شارع (خوای پەروەردگار) داینابێ { بۆت نیە هیچ خواپەرستییەك ئەنجام بدەی، جگە لەوەی کە خوا داینابێ } بەڵام ئەصڵ لە هەڵسوکەوتەکاندا (لە نەریتەکاندا) بریتیە لە: ڕێپێدران و دەستکراوەیی، مەگەر ئەوەی شەرع دانەر قەدەغەی کردبێ.

کەواتە: ئێمە بۆمان نیە لەخۆوە هیچ عیبادەتێك ئەنجام بدەین، مەگەر بزانین خوا ئەو عیبادەتەی داناوە، ڕاستەوخۆ، یان یان لە ڕێی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا، ئێمە بەس سەرنجی ئەوە دەدەین: ئایا ئەو هەڵسوکەوتە، شەرع قەدەغەی کردوە، یان نا؟ ئەگەرنا ئەصڵ ئەوەیە کە هەموو هەڵسوکەوتەکان ڕەوان و، ئەصڵ تێیاندا دەستکراوەییە، بە پێچەوانەی خوا پەرستییەکانەوە، کە بۆت نیە لەخۆوە دوو ڕکات نوێژ بکەی، لەخۆوە جۆرێك لە ڕۆژوو بگری و ناوێکی لێبنێی، جگە لەوەی کە شەریعەتدا هاتوە، یان دروشمەکانی حەج، وەك تەواف و هاتوچۆ لەنێوان صەفاو مەڕوەدا، لە هەر شوێنێکی دیکەدا ئەو دروشمانە بەنیەتی عیبادەت بکرێن، بۆ وێنە: کەسێك بەدەوری شوێنێکدا تەواف بکات، وەك چۆن بە دەوری کەعبەدا تەواف دەکا، وەك شیعە ئەوە دەکەن، یان خەڵکی نەفام و نەزان بە دەوری هەندێك قەبردا تەواف دەکەن، هەڵبەت ئەوە حەڕامە و بیدعەتە.

**بنەمای دووەم:** هەندێك لە زانایان، بەڵکو زۆریشیان[١]، بیدعەت دابەش دەکەن بۆ دوو جۆر: (بیدعەتی چاك و بیدعەتی خراپ)، (البدعة الحسنة، والبدعة السیئة)، بگرە هەندێکیان دابەشی دەکەن بۆ پێنج جۆرو دەڵێن: پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپن، دەڵێن: {بیدعەت هەیە واجبە، بیدعەت هەیە حەڕامە، بیدعەت هەیە سوننەتە، بیدعەت هەیە نا پەسەند (مکروە)ە، بیدعەتیش هەیە ڕەوایە و موباحە}، ئەمەش ڕاو بۆچوونی زانایانی وەك: (ابن حجر العسقلاني) و (النووي) و (العز بن عبد السلام) و کۆمەڵێ زانای دیکەیە.

ئنجا ئەوەی من لێم کۆڵیوەتەوەو بۆم ساغ بۆتەوەو، تەماشای کتێبی زانایانیشم زۆر کردوە لەو بارەوە، بەمجۆرەیە: بێگومان بیدعەت لە ئەصڵدا

---

(١) سەرژمێرم نەکردوون، کە کامیان زیاترو کامیان کەمترن.

هەمووی نارەوایە، وەك فەرموودەکانمان هێنان، ئەدی بۆچی هەندێکیان دابەشیان کردوە بۆ چاك و خراپ، بگرە هەندێکیان دابەشیان کردوە بۆ پێنج جۆرو، پێنج حوکمەکەی بەسەردا دەچەسپێنن؟ وەڵام: لەبەر ئەوەیە کە چەمکی بیدعەتیان فراوانتر تەماشا کردوە، زیاتر وەك مانا زمانەوانییەکەی، هەر شتێك کە دابهێندرێ، ئنجا دیارە هەر شتێك کە دابهێندرێ، خراپ نیە، ئەگەر پەیوەندیی بە عەقیدەو عیبادەتەوە هەبێ، ئەوە خراپە، ئەدی ئەگەر پەیوەندیی بە هەڵسوکەوتەکانەوە هەبێ! خۆی ژیان بەهۆی ئیبداع و داهێنانەوە بەرەوپێش دەچێ، بۆ وێنە: دانانی دیوانەکان (الدواوين)و، دامەزراندنی شارەکان، داهێنانی زانستەکان زانستی زمانی عەرەبیی و فەرموودەناسیی و تەفسیرو ئوصوڵی فیقە، ئەوانەیان هەموو بردۆتە ئەو چوارچێوەیەوە کە داهێنراوی باشن، کەواتە: داهێندراو هەیە چاکەو، داهێندراویش هەیە خراپە.

بەڵام وەك گوتم: ئەگەر بڵێین: بیدعەت تایبەتە بە بواری: عەقیدە و عیبادەتەوە، ئەو کاتە هیچ زانایەك لەسەر ئەوە مشت و مڕی نیە، کە هەمووی خراپە، بەڵام کە چەمکی بیدعەتت فراوان کردو، هەڵسوکەوتەکانی هاتنە نێو، ئەوکاتە بە تەئکید ئەوەی کە ئێمە پێی دەڵێین: داهێنان (إبداع) ئەوەشی دێتە نێو، کە بێگومان لە کاروباری دنیادارییدا پێویستە، نەك هەر دروستە.

ئنجا هەر لێرەشەوە دەبێ لەو قسەیەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، تێبگەین، کە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە: تەماشای کرد مسوڵمانان نوێژی تەراویحیان دەکرد، کۆمەڵ، کۆمەڵ، لە مزگەوت، گوتی: ئەگەر ئەوانە لەسەر پێشەوایەك کۆبکەمەوە، شتێکی باشە، ئەوە بوو لەسەر پێشەوایەك کۆی کردنەوە، گوتی: با یەك پێشەواتان هەبێ و هەمووتان لەدوای وی نوێژی تەراویح بکەن، لەمانگی ڕەمەزاندا، دوایی بۆخۆی گوتی: (نِعمَتِ البِدعَةُ هذِهِ)، ئەمە بیدعەتێکی زۆر باشە، زانایان دەڵێن: لێرەدا کە گوتوویەتی: (نِعمَتِ البِدعَةُ هذِهِ)، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، زۆر چاك دەزانێ و زۆریش توند بوە کە لەڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لانەدرێ، بۆیە بە دڵنیایی مەبەستی پێ لایەنە زمانەوانییەکەی بووە، واتە: شتێك کە پەیداکراوە، ئنجا ئایا نوێژی تەراویح

شتێکە پەیداکراوە؟ نەخێر، لە ڕاستییدا پەیدانەکراوە، بەو واتایەی ئەصڵێکی نەبێ، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) لە (صحیح البخاري)دا هاتوە دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ڕەمەزاندا هات نوێژی کرد، کۆمەڵێك هاتن لە پشتی نوێژیان کرد، بۆ شەوی دووەم زیاتر، بۆ شەوی سێیەم زیاتر بوون، بۆ شەوی چوارەم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەهاتەدەر، چاوەڕێیان کرد، فەرمووی: دەزانم چاوەڕێم دەکەن، بۆیە نەهاتم، نەوەك من نوێژی تەراویحتان بە کۆمەڵ بۆ بکەم، دوایی لەسەرتان فەرز بێ و، نەشتوانن ئەنجامی بدەن و گوناحبار بن، بۆیە نەهاتم، واتە: بایی ئەوەندە کە لێیان حاڵی بکات، سوننەتە، سێ شەوان هات، ئنجا عومەر خوا لێی ڕازی بێ، زانیی کە ئەو ئەگەرە بەسەرچووەو گوتی: با کۆیان بکەمەوە لەسەر ئیمامێك لەجیاتی ئەوەی بەپرژ بڵاویی نوێژەکەیان بکەن، لەسەر ئیمامێك کۆی کردنەوە، کە هەر لەسەر ئەصڵی سوننەت بوونی خۆشی ماوەتەوە، لەسەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یشدا سوننەت بوونەکەی تەشریع کراوەو داندراوە، یانی: شتێکە پەیداکراوە، بەڵام کاتی خۆی ئەسڵی بووە، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی لەسەریان فەرز نەبێ، دەوامی لەسەر نەکردوە.

**بنەمای سێیەم:** کە گوتمان: داهێنان لە دنیادارییدا پێویستە، نەك هەر دروستە، پێویستییمان بەبەڵگەی نەقڵیی ناکات لەسەری بێنینەوە، بۆچی؟ ئەوە شتێکی گرنگە بیزانن، چونکە شەریعەت هاتوە ئەو شتانە بۆ ئێمە ڕون بکاتەوە، کە عەقڵمان پێیان ناشکێ، کە لەمەودای عەقڵ بەدەرن، بەڵام شەریعەت نەهاتوە پێمان بڵێ: چۆن نان دروست بکەین؟ چۆن چێشت لێبنێین؟ چۆن کەلوپەل دروست بکەین؟ چۆن سەیارە دروست بکەین؟ شەریعەت نەهاتوە ئەو شتانەمان پێ بڵێ، چونکە بەشەر عەقڵی بەو شتانە دەشکێ، بەشەر دەتوانێ بۆخۆی ئەوشتانە دابێنێ، شەریعەت هاتوە شتێکت پێبڵێ کە لەمەودای عەقڵدا نیە، بۆیە ئەوە کە ئێمە لەبواری دنیادارییدا دەبێ داهێنان بکەین، پێویست بەبەڵگەی نەقڵیی ناکات و بە عەقڵ دیارە، چونکە لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا سەنگی مەحەك بەرژەوەندییە، چۆن بەرژەوەندیی بێتە دی، دەبێ وابکرێ، بەرژەوەندیی

ژیانی دنیاش بەوە دێتە دی، کە لە ڕووی پیشەسازیی و، سیاسیی و، ئیداریی و، کشتوکاڵ و، ئاوەدانکردنەوەی وڵات و، بەدەستهێنانی زانست و ئەوانەوە، ئێمە بەردەوام لەهەوڵی زیاتر دابین، بۆیە پێویستییمان بەبەڵگەی نەقلیی ناکات، چونکە عەقڵ دەلالەتی لەسەر دەکات، ئەوەشتان بۆیە پێدەڵێم، چونکە وامەزانن ئەوەی ئێستا زاندراوە، وەختی خۆشی زانراوە، کاتی خۆی هێڵی شەمەندەفەر کە براوە بۆ سعوودیە، زانایانی سعوودیە کتێبیان لەسەر داناوە، کە ئەوە بیدعەتە، بۆ سەییارە گوتوویانە: بیدعەتە سواری بن، بۆ تەیارە گوتوویانە: حەڕامە، وێنەی فۆتۆگرافییان بە حەڕام داناوە، سەیارە لێخوڕینی ئافرەت، پار ڕێگایان پێدا! زۆر شتی دیکەش، کە ئەوە هیچی پەیوەندیی بە دینەوە نەبووەو، پەیوەندیی بە عورف و نەرێتی دواکەوتووانەی ئەو کۆمەڵگایانەوە بووە، کە بەگشتیی دەوڵەتانی کەنداو بەو شێوەیەن، ئێستاش زۆریان بڕوایان بە هەڵبژاردن نیە، بڕوایان بەوە نیە حیزب دروست بێ، بەتایبەتی لە سعوودیە، ئەوانە وەك گوتم: پەیوەندییان بە عورف و نەرێتی کۆمەڵگاوە هەیە، دین لێیان بەرپرسیار نیە، چونکە دین وای نەگوتوە، ئەوەتا خەڵکی میصریش مسوڵمانن و عالیمی گەورە گەورەشی لێنە و، ئەو جۆرە بیرۆکە سەیر و سەمەرانەیان نیە، هەروەها وڵاتانی دیکەی دنیای ئیسلام، وەك بۆخۆتان دەبینن.

ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین، پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم)و خەلیفە ڕاشیدەکانی لەبواری دنیادارییدا، زۆر داهێنانیان کردوە، چەند شتێك بەنموونە دێنمەوە:

١- یەکێك لەوانە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لە جەنگی خەندەك {جەنگی ئەحزاب}دا، سەلمانی فارسیی پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە لە وڵاتی فارس، کە شەڕمان دەبوو لەگەڵ دوژمن، ئەو شوێنانەی کە پێ دەشتن و دوژمن دەتوانێ لێیانەوە بێ، خەندەقمان لێدەدا، چاڵمان لێدەداو هەڵمان دەکەند، بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ بپەڕێتەوە، لە شوێنە بەرزەکانیش بورجمان دادەنان و پاسەوان و ئێشکچییمان تێدا دادەنان، پێغەمبەر (صلی الله

علیه وسلم)، ڕایەکەی سەلمانی وەرگرت و خەندەکی لێدا[١]، کافرەکان کە هاتن تووشی شۆك بوون، شتێکی سەیر بوو، چونکە عادەت نەبوو لەنیوە دورگەی عەرەبییدا، عەرەب لە شەڕدا ئەو جۆرە تاکتیکە بەکاربێنن.

٢- بۆ یەکەمجار لە سوپای پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، هەر کام لە ئامێری دەببابەو مەنجەنیق[٢] بەکار هێنران، کە پێشتر لە نیوە دورگەی عەرەبییدا ئەوانە بەکارنەهاتبوون، هەرچەندە لە وڵاتانی ڕۆم و فارس و چین و هینددا هەبوون[٣].

٣- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ویستی نامە بنووسێ بۆ پادشای فارس و ڕۆم، یەکێ لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم)، پادشایەکان نامەیەك ناخوێننەوە، مۆر نەکرابێ، فەرمووی: مۆرێکم بۆ دروست بکەن، نەیفەرموو: بیدعەتە، یان بڵێ: چۆن لاسایی ڕۆم و فارس بکەینەوە؟ مادام شتێکی باشە، تاکو پادشایەکە بزانێ کە ئەو نامەیە ئەو کەسە ناردوویەتی، ئەگەر نا ڕەنگە نامەی دیکەی بەناوی ئەوەوە بۆ بچێ، بەڵام کە خەتم کرابوو، ئەوە دیارە کە ئەو نامەیە لەو لایەنەوە هاتوە، ئەوە بوو مۆرێکیان بۆ دروست کردو، نامەکانی کە ناردنی بۆ کیسرا و هیرەقل و بۆ پادشاکانی دیکە، مۆری دەکردن[٤].

٤- لەسەردەمی ئەبوبەکردا خوا لێی ڕازی بێ، قورئان لە دوو توێی موصحەفدا کۆکرایەوەو، لەسەردەمی عوسماندا خوا لەهەموویان ڕازی بێ، زیاتر ڕێکخراو،

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣ ص١٠٩.

(٢) مەنجەنیق شتێکە وەك مەدفەعی ئێستا بەردی گەورەو ئاسنیان خستۆتە نێوو پێیان هەڵداوە، پێیان فرێداوە بۆ نێو قەڵاو کۆشك، بۆ ئەوەی ئەو قەڵایە برووخێنن، دەببابەش هەر وەك دەببابەی ئێستا پێچکەی هەبوون، لە تەختە دروستکراوەو، هەندێك جەنگاوەر چوونە بن تەختەکان بۆ ئەوەی تیرو زەبر کاریان لێ نەکاو، بچن قەڵایەکەی پێ برووخێنن.

(٣) هەمان سەرچاوە، ج٤، ص٢٧٤.

(٤) فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج٦ ص ١٠٨، و (مآثر الإنافة في معالم الخلافة) القلشقندي، ص١١٧، ١١٨.

بەو شێوەیە کە قورئان ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، هەڵبەتە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، هەر ئاوا بوو، بەڵام نەخرابووە نێوان دوو بەرگەوە، لەسەر لەوح و شتی دیکە نووسرابووو لە سینەی هاوەڵاندا هەبوو.

٥- سێ خەلیفەکان لە مەدینە بوون، واتە: پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیی مەدینە بوو، بەڵام عەلی خوا لێی ڕازی بێ، پایتەختی گواستەوە بۆ کووفە، دوایی لە سەردەمی موعاویەو بەنی ئومەییەدا، پایتەختی دەوڵەت دیمەشق بوو لەشام، دوایی لەسەردەمی عەبباسییەکاندا هاتە بەغداو، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا چووە ئەستەمبوول، چونکە کاروباری دنیایی بوو، هەر کامێکیان تەماشایان کرد، وا باشە کوێ پایتەختی حوکمڕانییەکەی بێ؟ کوێی بە باشتر زانیوە، لەکوێ زیاتر شوێنکەوتووان و خەڵکی هەبووە، ئەوێی کردۆتە پایتەخت.

٦- هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئۆپۆزسیۆندا، ئەوە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، ڕەنگێکی بۆ ڕشتووین، ڕەنگێکی زۆر چاك، چۆن مامەڵەی کرد لەگەل خەواریجدا، کە لە پێش ئەودا بەو شێوەیە نەبوو، لە پێشوودا بەڵێ ناکۆکیی و دووبەرەکیی هەبوو، بەڵام لەپێش ئەودا، ئەوە نەبووە خەلیفەیەك هەبێت و خەڵکێکیش ببنە نەیارو بەرهەڵستکاری و شەڕی لەگەڵدا بکەن!

٧- عومەر خوا لێی ڕازی بێ، زۆر داهێنانی ئیداریی کردن:

**یەك:** دیوانەکان (دواوین)ی دانان: دیوانی سەربازان، دیوانی خەراج، دیوانی زەکات، پێشتر وا نەبوو، (بيت المال) هەبوو هەرچی بۆی دەهات یەکسەر دەیاندا بەخەڵك، بەڵام تەماشایان کرد سوپا دروست بووەو ئێستا ئەو سوپایە پێویستیی بە مووچە دەکا، دەبێ ناونووس بکرێن، زەکات پێشتر هەر وا کۆدەکرایەوە و دابەشدەکرا، تەماشایان کرد: دەبێ زەکات بنووسرێ، چەندە، چۆنە؟ ئەوانەی ئەمساڵ زەکاتیان پێدراوە، بە ئەندازەی کیفایەت، نابێ ساڵێکی دیکە وەری بگرن و، دەبێ بدرێ بەکەسانی دیکە.

**دوو:** هەر لەسەردەمی عومەردا خوا لێی ڕازی بێ، پۆستە (بريد) دانرا، کە پێشتر نەبوو.

**سێ:** هەروەها سجن داهێندرا.

هەروەها زۆر شتی دیکەی ئیداریی، هەمووشیانی لە دەوڵەتی فارس و ڕۆم وەردەگرت، چونکە عەرەب ئەزموونی حوکمڕانییان نەبوو، هەر خێڵ و تیرە و هۆز بوون، تەنانەت دیوانەکان لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا، واتە: سەد ساڵ زیاتر تێپەڕیبوو، ئەمجار دیوانەکان کران بە عەرەبیی، واتە: ئەوەی لەلای ڕۆژهەڵات بوون، هەر بە فارسیی نووسرابوون، ئەوەی دیکەش هەر بە ڕۆمیی، لەسەردەمی (عبدالملك)دا دیوانەکان کرانە عەرەبیی گوتیان: با بەزمانی عەرەبیی بیاننووسین.

هەروەها دراو (عُملَة) پێشتر دراوی فارسەکان زیو بوو، پێی دەگوترا: (درهم)، دراوی ڕۆمەکان زێڕ بوو، پێی دەگوترا (دینار)، ئنجا مسوڵمانان هەر درەمی فارسیی ساسانیی و، دیناری بیزەنتیی ڕۆمییان بەکاردەهێنا، ئەویش دیسان لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا دراو (سكة)یان لێدا، بەشێوەیەك نیشانەی دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بوو.

کەواتە: زانایان، یان حوکمڕانان، ئەوانەی کە لەسەر ڕێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشتوون، لەبواری دنیاداریدا، داهێنانیان کردوە.

بنەمای
دەیەم

## بەعەقڵی فراوان و دڵسۆزیی و پەرۆش و ڕەوشتی بەرزەوە، هەوڵدان بۆ لێك نیزیك کردنەوەی مسوڵمانان، لەسەر بنەمای خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان

ئەمەش یەکی دیکەیە، لەتایبەتمەندییەکانی زۆربەی مسوڵمانان، کە هەمیشە بەعەقڵی فراوان و، بەدڵسۆزیی و بەپەرۆش و، بەرەوشتی بەرزەوە، هەوڵیان داوە کە مسوڵمانان لێك نزیك بخەنەوە، لەسەر بناغەی خاڵە هاوبەشەکان، بۆ زانیارییتان! شیعە، خەواریج، موعتەزیلە، مورجیئە، قەدەرییە، جەهمییە، هەموو ئەوانە، هەمیشە خەریکی دەمارگیریی بوون، هەمیشە خەریکی ماڵ ماڵۆکێنە بوون، بەڵام جەماوەرو زۆربەی مسوڵمانان، هەر بە سینگی فراوان مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون، ئەگەر تەماشای (صحیح البخاري) بکەین، ژمارەیەك لە ڕاوییەکانی شیعەن، خەواریجن، گوتوویانە: مادام مرۆڤێکی باشە، کە بۆیان دەرکەوتوە ڕاستگۆیە و دادگەرە، ڕیوایەتیان لێ وەرگرتوە، بەڵام ئەوان، بۆ وێنە: شیعە، ڕیوایەتی هاوەڵانیان ڕەتکردۆتەوە، موعتەزیلە هی ئەوانی دیکەیان ڕەتکردۆتەوە، ئەوانی دیکە هی ئەوانی دیکەیان ڕەتکردۆتەوە، ئەوەتان بۆیە

پێدەڵێم، تاکو ئێوەش ئاوا بن، (زۆربەی موسوڵمانان) بە عەقڵی فراوان، بە دڵی گەورە، بەبەزەیی، بەپەرۆش، بەبێ فەرق و جیاوازیی، بەتەبایی، لەگەڵ هەموو کەسدا مامەڵەیان کردوە، هەوڵیشیان داوە، هەمیشە موسوڵمانان کۆبکەنەوە سەر یەك، موسوڵمانان کۆ بن، پرژو بڵاو نەبن، بۆ ئەوەش خاڵە هاوبەشەکانیان ڕەچاو کردوون، نەك خاڵی جیاواز، خاڵی جیاواز ڕەچاوبکەی، هەرگیز دوو موسوڵمان نابن بەیەك، ئەبوبەکر و عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، ڕا جیاییان بووە، عوسمان و عەلی ڕاجیاییان بووە، هەرگیز لە سەر بناغەی خاڵە جیاوازەکان، ناتوانرێ خەڵك کۆبکرێتەوە سەر یەك، بەڵکو دەبێ لەسەر بناغەی خاڵە هاوبەشەکان بێ.

با لەو بارەوە تەماشای چەند دەقێك بکەین:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران)، ئایەتەکانی: (١٠٢) و (١٠٣) دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴿١٠٣﴾ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێبکەن و، بە موسوڵمانەتییش نەبێ مەمرن، {کاتێك دەمرن، موسوڵمان بن، کاتێکیش ئینسان دەتوانێ بە موسوڵمانەتیی بمرێ، کە بە موسوڵمانەتیی ژیابێ، چونکە ئینسان لەسەر ئەوە دەمرێ، کە لەسەری ژیاوە}و، دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن بەتێکڕایی و پەرتەوازە مەبن.

٢- لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴿٢﴾ ﴾.

واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و، هاوکاریی یەکدی مەکەن لەسەر گوناح و دەستدرێژیی.

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ: {الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ}، أخرجه البخاري برقم (٢٣١٤)، ومسلم برقم (٢٥٨٥)، والترمذي برقم (١٩٢٨) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٢٥٦٠)، وابن حبان برقم (٢٣١)، والديلمي برقم (٦٥٦٣)، والبيهقي برقم (١١٢٩١).

(ڕۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وتاری دەدا)، فەرمووی: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە، هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات، (پەنجەکانیشی ئاوا خستنە نێو یەك).

دیوار بۆخۆتان دەزانن تێکهەڵکێش دەکرێ، بۆ ئەوەی مەحکەمتر بێ، ئیماندارانیش دەبێ پێکەوە بەو شێوەیە بن.

## چوار بنەماو ڕاستیی گرنگ لەبارەی ئولفــەت و تەبایی مسوڵمانانەوە:

بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چوار ڕاستیی گرنگ بکەین، کە چۆن ئولفەت و تەبایی و یەکڕیزیی، لە نێو مسوڵمانانندا پەیدا دەبێ و، چۆن پارێزگاریشی لێدەکرێ:

**ڕاستی یەکەم: عەقڵ و زانیاریی فراوان، تەبایی و کراوەیی و، عەقڵی گچکەو زانیاریی کەم، دەمارگیریی و داخراویی بەرهەم دێنن:**

بەڵێ برا و خوشکەکانم! عەقڵ و زانیاریی فراوان، تەبایی و کراوەیی و، عەقڵی گچکە و زانیاریی کەم، دەمارگیریی و داخراویی بەرهەم دێنن، ئەوە وەك بنەمایەك لە مێشکی خۆتاندا تەبعی بکەن، هەمیشە عەقڵ و زانیاریی فراوان، لەگەڵ خەڵکدا تەبایی و گونجاویی و کراوەیی بەرهەم دێنێ، بەڵام عەقڵی گچکەو دڵی بچووك و زانیاریی کەم، دەمارگیریی و داخراویی لەمرۆڤدا پەیدا دەکات، هەڵبەتە مەگەر زۆر ناچار بم، ئەگەر نا نامەوێ ناوی هیچ لایەنێك بێنم، بەڵام دەشمەوێ ئێوەش و ئەوانەی دوای ئێوەش، کە ئەم مەوسووعەیە دەخوێننەوە، یان گوێیان لەوتارەکان دەبێ، تێبگەیەنم، کە لەنێو مسوڵماناندا کەسانێك هەن، لەسەر بچووکترین شت، ئامادەن گەورەترین هەرا و کێشە بنێنەوە، هی وا هەیە ڕایەکی هەیە، لەجیاتی ئەوەی وەك بۆچوون و بیروڕا مامەڵەی لەگەڵدا بکات، وەك دین مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا کەتۆ بۆچوونێکت وەك دین تەماشا کرد، مانای وایە هەرکەسێك ئەو بۆچوونەی نەبێ، دینی نیە، ئەوانەی کە گومڕاکردنی مسوڵمانان و، بە فاسق دانانیان و، بەکافر دانانیان و، پاشان حەڵاڵ کردنی ماڵ و سامان و نەفس و نامووسیان، دەکەنە پیشە، ئەوە لە عەقڵی گچکە و زانیاریی کەمیانە.

دوو قوڵە نەزیلە:

١)- جارێك نوێژم دەکرد، یەکێك لە تەنیشتم بوو، زۆر بە ئەدەب و شەرم گوتی: مامۆستا! ئەوە چۆنە لە تەحییاتدا پەنجەت ناجووڵێنی؟ گوتم: دەزانم ئەوەش سوننەتە، بەڵام ئەوەی دیکەم پێ بەهێزترە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، جارێك یان دووجار پەنجەی جووڵاندوەو ئیشارەی پێکردوە، ئنجا ئەوە لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، بەڵام ئەوی دیکە لە (سنن أبي داود)دا هاتوەو من ئەوڕایەم پێ بەهێزترە، بەڵام ئەگەر تۆش وا بکەی، هیچ پێی قەڵس نیم، گوتی: نا ئەوە سوننەتە، گوتم: ئەوەش سوننەتە و ئەویش سوننەتە، بەڵام من ئەوەم پێ سوننەتترەو بەڵگەکەی بەهێزترە، ئێستا من ئەوەی تۆم بەبەڵگەی زەعیفەوە قبووڵە، تۆ بۆچی ئەوەی منت بە بەڵگەی بەهێزەوە قبووڵ نیە؟!

٢)- جارێك یەکێك لە حەجێ یان لە عومرە هاتبۆوە، گوتی: مامۆستا! ئەو ڕەش پێستانە زۆریان شیعەن، گوتم بۆچی؟ گوتی: دەست ناگرن، منیش گوتم: نەخێر وانیەو ئەگەر تۆ شارەزاییەکەت زیاتر بووایە، دەتزانی کە ئیمام مالیك دوو ڕای هەن و، ئەوانە مالیکیی مەزهەبن و شیعە نین، کیشوەری ئەفریقیا شیعەی زۆر کەم لێیە، یان هەر لێی نیە، ئیمام مالیك لە بارەی دەستگرتنەوە دوو ڕای هەن، ڕایەکیان: بریتیە لە (إسبال) واتە: دەست نەگرتن کاتێ کە ڕادەوەستن، ڕایەکەی دیکەشی: بریتیە لە دەست گرتن، ئنجا ئەوانەی کە دەست ناگرن مالیکیی مەزهەبن، گوتی: وامزانی هەموویان شیعەن، گوتم: ئاخر ئەگەر عیلمەکەت زۆربایە، ئەو بۆچوونەت بۆ دروست نەدەبوو!

ئنجا بیکەن بەبنچینە لەلای خۆتان، عەقڵی فراوان و زانیاریی زۆر، دڵ گەورەیی و، لێبوردەیی و، تەبایی و، کراوەیی لە ئینساندا پەیدا دەکات، نەك هەر لە بازنەی مسوڵمانەتییدا، لەگەڵ نا مسوڵمانانیشدا.

تەماشا بکەن! جارێك پیاوێك بەناوی: (أشج عبد قیس) دێ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا، سەرۆکی وەفدێکە هاتوون مسوڵمان بن، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ئەی ئەشەج! ئەوە بۆچی لە قەومەکەت دوا کەوتی و ئەوان پێش تۆ هاتن؟ ئەسڵەکەی لە (صحیح مسلم)دایە، بەڵام تەفصیلەکەی لە (سنن)دا هاتوە، ئەویش دەڵێ: قەومەکەم هاتن، منیش سەرۆکی قەومەکەی خۆم بووم، بەڵام پێم لایق نەبوو بە بەدەنی ئارەقاویی و بەتۆز و خۆڵی ڕێیەوە و، بەبەرگێکی نەگونجاوەوە بێمە خزمەت تۆ، بۆیە لەڕێگادا خۆم شۆرد، بۆنی خۆشم لەخۆمداو بەرگم گۆڕی، گوتم: ئاوا لایقە بێمە مەجلیسی جەنابت، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یش تەماشای کردو فەرمووی: {إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ: الْحِلْمُ، وَالأَنَاةُ} أخرجه مسلم برقم: (١٧).

واتە: تۆ دوو سیفەتت تێدان، خوا خۆشی دەوێن، هێدیی و مەندیی و، پەلەنەکردن.

(الحِلْم) پێچەوانەی زوو تووڕە بوونەو، (الأَنَاةُ)یش پێچەوانەی پەلە کردنە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەماشای کرد: پەلەی نەکردوە وەك قەومەکەی یەکسەر بێتە خزمەتی، لە ڕێیە خۆی شۆردوەو بەرگی خۆی گۆڕیوەو خۆی بۆن خۆش کردوە، ئەوجار هاتۆتە خزمەتی! چونکە دوو سیفەتی تێدا بوون، کە خوا خۆشی دەوێن، ئێمەش ئەگەر سیفەتی باشمان لە هەر کەسێکدا بینی، دەبێ سیفەتە باشەکەیمان خۆش بوێ، ئەگەر سیفەتی خراپیشمان لە هەرکەسێکدا بینی، با مسوڵمانیش بێ، دەبێ ڕقمان لەو سیفەتە خراپەی بێ.

**ڕاستی دووەم: دڵسۆزیی و پەرۆشیی، مایەی نەرمیی و گونجاویی و، دڵ ڕەقیی و بوغز هۆکاری یاخیی بوون و سڵەمینەوەن:**

بەڕێزان! لێتان وەسیەت بێ، هەمیشە بۆ خەڵك دڵسۆز بن، مرۆڤ کافر بێ یان مسوڵمان، بۆی دڵسۆز بن و، بۆی بە پەرۆش بن، بۆی دڵسۆز بن یانی: چی بۆی چاکە، ئەوەتان بۆی بوێ، ئەدی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) بە گەلە کافرەکانی خۆیانیان نەفەرمووە: ﴿وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف

من بۆ ئێوە دڵسۆزێکی ئەمیندارم، هەرچەندە خەڵکەکەیان کافریش بوون! ئنجا ئەگەر ئینسان بۆ خەڵك دڵسۆز بێ و، بۆیان بە پەرۆش بێ، ئەوە وای لێدەکات لەگەڵیان دڵنەرم و بەڕەحم بێ، بەڵام ئەگەر بوغزو غەرەزت لەدڵدا هەبێ بەرامبەریان، ئەوە وات لێدەکات کە دڵت ڕەق بێ و، قسەت زبر بێ و، ڕەفتارت ناشایست بێ، هی وامان هەیە وادەزانێ سوننەتە، یاخود لە مسوڵمانەتییە، ڕووت لەگەڵ خەڵکی گرژ و مۆن بێ! لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ کەس لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ڕوو خۆشتر نەبووە، هیچ کەس لەو قسە خۆشتر نەبووەو، هیچ کەس لەو بەڕێزتر نەبووە، لەگەڵ کافر و لەگەڵ مسوڵمان، زۆر کەسی بەڕەوشتی جوانی، خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆی، کەچی ئێمە هی وامان هەیە، وادەزانێ نەك لەڕووی کافران، لە ڕووی مسوڵمانانیشدا، دەبێ گرژ و مۆن و مرچ بی، سڵاویشیان لێ نەکەی و، سڵاویشیان کرد، جوابیان نەدەیەوە! ئایا ئەوە چ عیلاقەی بە ئیسلامەوە هەیە؟ نەخێر بەڵکو ئەوە میزاج و تەبیعەتێکی نەخۆشە، ئەو ڕەفتارانە لە ئینساندا پەیدا دەکات، ئنجا ئێمە دەبێ شوێنکەوتووی شەریعەت بین، نەك شوێنکەوتووی تەبیعەت، بەتایبەت تەبیعەتێکی نەخۆش، کە پێت وابێ دەبێ لەگەڵ خەڵك مۆن و مرچ بی و، پێت وابێ کە خۆت لەخەڵکی زۆر چاکتری!

لێشتان وەسیەت بێ: ئەوانەی کە لەگەڵ خەڵك ڕوو گرژ و قسە ڕەقن، لەبەر ئەوەیە کە خۆیان پێ لە خەڵکی چاکترە، بەڵام هەر ئەسڵی خۆ پێچاکتر بوون لەخەڵك، خراپە، دەبێ خۆت پێ وەك ئەوان، یان لەخوار ئەوانەوە بێ.

**ڕاستی سێیەم: بەبێ ڕەوشتی بەرز و ئاکاری پەسەند، جیاوازییەکانی یەکدی تەحەممول ناکرێن:**

مسوڵمانان چۆن دەتوانن جیاوازییەکانی یەکدی تەحەممول بکەن؟ دەبێ ڕەوشتمان بەرز بێ لەگەڵ یەکدی، ئاکارمان پەسەند و جوان بێ، مەبەستم ئەوەیە: یەکێك لە ڕەوشتە بەرز و جوانەکان، ئەوەیە کە ئینسان، ئەوەی بەخۆی ڕەوا دەبینێ، بەخەڵکیشی ڕەوا ببینێ، لە کتێبێکدا خوێندمەوە دەڵێ: یەکێك لەگەڵ زانایەك قسەی دەکرد، گوتی: فلان زانا، من لێم بیستوە ئاوای گوتوە لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە، ئەدی تۆ چی دەڵێی؟ گوتی: منیش دەڵێم: ڕام ئاوایە، گوتی: بەڵگەت چییە لە قورئان و سوننەت؟ گوتی: تۆ بەڵگەی قورئان و سوننەتت هێناوەتەوە؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەدی بۆچی من مولزەمم، تۆ لە زانایەکت بیستوە، منیش بۆخۆم زانام، من دەڵێم: ڕام وایە، تۆ دەڵێی: بەڵگەت چییە لە قورئان و سوننەت؟ من کە زانام، دیارە لە قورئان و سوننەت تێگەیشتووم، بەڵام تۆ کە موقەللیدی زانایەکی، بۆچی بەڵگەی قورئان و سوننەت ناهێنیەوە، کەچی داوا لەمن دەکەی؟ ئەوە دەکا پێوان بە دوو پێوەر (الكَيل بِمِكيالَين).

زۆر گرنگە ئینسان چی بەخۆی ڕەوای دەبینێ، ئەوەش بەبەرانبەرەکەی ڕەوا ببینێ، ئەوە ڕەوشتێکی زۆر جوانە، چی بۆخۆی پێ چاکە، ئەوەشی بۆوان پێ چاك بێ، چی بۆخۆی پێ خراپە، ئەوەشی بۆوان پێ خراپ بێ، ئنجا بەبێ ڕەوشتی بەرزو جوان و، بەبێ ئاکاری جوان، خەڵك ناتوانێ جیاوازییەکانی یەکدی تەحەممول بکات.

**ڕاستی چوارەم: هەرکەسێك لە کار و پرۆژەی هەرەوەزیی و پێکەوەییدا، بەدوای خاڵی هاوبەشی نێوان خۆی و بەرامبەرەکانیدا نەگەڕێ، هەرگیز هەتا سەر بڕناکات، مەگەر خۆی یان بەرامبەرەکانی فۆتۆکۆپی و لاساکەرەوەیەکی بێ لام و جیم بن:**

بەڕێزان! من لەخزمەتتان دام، ئێوە چەند برا و خوشکێکن، ئەو قسانەی بۆتانیان دەکەم، تێگەیشتنی منن بۆ ئیسلام، ئنجا ئەگەر ئەو چاوەڕوانییەم لێتان هەبێ کە هەرچی گوتم، بڵێن: لە سەدا سەد وایە، مانای وایە دەمەوێ ئێوە فۆتۆکۆپی من بن، یان وەك کۆرسێك بن، چیم گوت، ئێوەش دووبارەی بکەنەوە! بەڵام هەر کەسێك ئاوا بیربکاتەوە، ناتوانێت لەگەڵ خەڵکدا بژی.

ئێمە زۆر جار ئەوەمان لێ بە تێبینی گیراوە، دەڵێن: مامۆستا! کۆمەڵی ئیسلامیی ڕای جیاوازی تێدایە، یەکێك وا دەڵێ و یەکێك وا دەڵێ، بە تایبەتی لەو بابەت و مەسەلانەدا کە ڕاجیایی هەڵدەگرن، لەوەڵامدا گوتوومە: ئەوە نیشانەی ڕاستیی ڕێبازی ئێمەیە، ئەدی نابێ ڕاجیایی هەبێ؟ هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، نەیانتوانیوە لە هەموو شتێدا یەك ڕا بن، ئەبو بەکر و عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، نەیانتوانیوە لەسەر هەموو مەسەلەیەك هاوڕابن، لە هەموو کەسیش چاکتر بوون لە دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بۆیە هەمیشە کاری هەرەوەزیی و کاری پێکەوەیی، پەکی لەسەر ئەوە کەوتوە، کە ڕای جیاوازی بەرانبەر قبووڵ بکەین و، گوێی بۆ بگرین، وەك (شافعي) خوا لێی ڕازی بێ، ئەو بنچینەیەی داناوە کە بە حەقیقەت بنچینەیەکی زێڕینە دەڵێ: (رأيي صوابٌ يَحتَملُ الخطأ، ورأيُ غَيري خطأ يَحتَمل الصواب)، بۆچوونی خۆم پێ ڕاستەو دەگونجێ هەڵە بێ، بۆچوونی بەرانبەرەکەم پێ هەڵەیەو، دەشگونجێ ڕاست بێ.

بەڵام ئەوەی بڵێ: بۆچوونی من ڕاستە و ناگونجێ هەڵە بێ و، بۆچوونی بەرانبەرەکەم هەڵەیە و ناگونجێ ڕاست بێ! ئەوە عەینی فیرعەونایەتییە، فیرعەون دەیگوت:

﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩﴾ الزمر

هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە من دەیڵێم و، ئەوەی منیش دەیڵێم، هەمووی ڕاستە.

برا و خوشکان! خەڵکی وا دەبینن کە ئیددیعای شوێنکەوتنی سەلەفی صالح دەکات، بەڵام وەك فیرعەونیش بیردەکاتەوە، نەك لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، بەڵکو لە بواری مەسەلەی گچکە گچکەو لە وردە بابەتاندا، شتی بچووك بچووك دەکاتە بیانووی ئەوەی کە: نابێ فڵان کەس بدوێندرێ، نابێ فڵان کەس سڵاوی لێبکرێ! بە حەقیقەت ئەو شتانە نەخۆشیین، هەرگیز پێشینی چاکی ئێمە، بەو شێوەیە نەبوون، مسوڵمانانی لەدین تێگەیشتووو لەدینداریيدا پێگەیشتووش، هەرگیز نابێ ئاوا بن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە وا لێبکا، کە بە ڕەوشتی بەرز و جوان و، بە بەزەیی و پەرۆش، هۆکار و فاکتەری ئەوە بین کە مسوڵمانان پێکەوە بن، ڕێك بن، تەبا بن، یەك ڕیز بن.

# بنەمای یازدەیەم

## کۆشش کردن (إجتهاد)، بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان لە قورئان و سوننەتدا، بەگشتیی فەرزی کیفایەیە، کەسێکیش توانای نەبێ، لەسەری پێویستە لە زانایان بپرسێ و، بەرچاو ڕوونانە شوێنیان بکەوێ، نەك کوێرانە لاساییان بکاتەوە

برا و خوشکانی بەڕێز!

لەم باسەدا: مەسەلەی (إجتهاد) - کە تایبەتمەندییەکی گەورەو گرنگی جەماوەری مسوڵمانانە- دەتوێژینەوە: (إجتهاد) چییە؟ تەقلید چۆنە؟ شوێن کەوتن چۆنە؟ ئەو سێ وشەیە: (الإجتهاد، التقليد، الإتباع)، هەر کامێکیان چەمك و واتای تایبەتیی و جیاوازی خۆی هەیە.

سەرەتا با تەماشای ئەم چەند دەقە بکەین:

١- لە سوورەتی (التوبة)، ئایەتی (١٢٢)دا، خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾،

واتە: دەبووایە لەهەر کۆمەڵێکی زۆری بڕواداران، کەمێکیان دەرچووبان بۆ ئەوەی لەدیندا شارەزا بن و، دوایی کە گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەیان، هۆشیاریان بکەنەوە، بەڵکو وریا بن، لە هەڵە و پەڵە پارێزراو بن.

٢- لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٨٣)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ ﴿٨٣﴾ ﴾

واتە: (بەسەرزەنشتکردنەوە باسی دڵ نەخۆشەکان، یان باسی مونافیقەکان دەکات) دەفەرموێ: هەرکاتێك هەواڵێکی پەیوەست بەهێمنیی و ئاساییشەوە، یاخود کە پەیوەندیی بە ترسەوە هەبێ، بۆیان بێ، یەکسەر بڵاوی دەکەنەوەو، ئەگەر ئەو هەواڵەیان بۆ لای پێغەمبەر گێڕابایەوە، هەروەها بۆ لای کاربەدەستانیان لە خۆیان (بۆ لای مشوورخۆرانیان)، ئەوانەیان کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی (واتە: دەیانزانی ئایا ئەو هەواڵە بەکەڵکی بڵاوکردنەوە دێ، یان دەبێ بشاردرێتەوە؟).

٣و٤- لە سووڕەتی (الأنبياء) ئایەتی(٧)و، لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (٤٣)دا خوای کاربەجێ بەیەك عیبارەت دەفەرموێ:

﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

واتە: ئەگەر نازانن، لە شارەزایان بپرسین.

٥- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ} أخرجه أحمد برقم (١٦٩٢٤)، والبخاري برقم (٧١)، ومسلم برقم (١٠٣٧)، وابن حبان برقم (٨٩)، وأخرجه أيضا: الدارمي برقم (٢٢٤).

واتە: هەرکەسێك خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئاییندا شارەزای دەکات.

## بـــابـــەتی (إجــتهــاد و تقـلـيد و إتِّبــاع)

ئەم بابەتە گرنگ و هەستیارە لە پێنج بڕگەدا دەتوێژینەوە:

### بڕگەی یەکەم: پێناسەی (إجتهاد) و (تقليد):

**أ- (الإجـتـهــــاد):**

**یـەك: لە ڕووی زمانەوانییەوە:**

وشەی (إجتهاد)، لە ڕووی زمانەوانییەوە، لەسەر کێشی (إفتعال)ە، لە (جُهد)ەوە هاتوە، (إجتهاد) واتە: خۆماندووکردن، هەوڵدان، کۆشش کردن.

**دوو: لەڕووی زاراوەییەوە، بەم جۆرە پێناسە کراوە:**

١)- (الغزالي) دەڵێ: {بَذْلُ المجتهد وُسْعهُ في طلب العلم بأحكام الشريعة، والإجتهاد التام أن يبذل الوسع في الطلب، بحيث يَحُسُّ من نفسه بالعَجز عن مزيد طلب}[1]، واتە: (إجتهاد) بریتیە لەوەی کە کۆششکەر (مجتهد)، هەوڵی خۆی بدات بۆ وەدەست هێنانی زانیاریی بە حوکمە شەرعییەکان و، کۆشش کردنی تەواو ئەوەیە کە، بابای کۆششکەر (مجتهد)، ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاربێنێ، بەشێوەیەك کە هەست بکات هیچی دیکە توانای نەماوە.

واتە: مەسەلەیەکی کە دێتە پێش، هەموو عەقڵی خۆی تێدا بەکاربێنێ و هەوڵی خۆی تێدا بدات، کە ئایا ئەو مەسەلەیە حوکمە شەرعییەکەی چۆنە؟

---

(١) المستصفى من علم الأصول، ج٢، ص٣٨٢.

٢- (الجصاص) دەڵێ: {فَهُوَ بَذْلُ الْمَجْهُودِ فِيمَا يَقْصِدُهُ الْمُجْتَهِدُ وَيَتَحَرَّاهُ، إِلَّا أَنَّهُ قَدْ اخْتُصَّ فِي الْعُرْفِ بِأَحْكَامِ الْحَوَادِثِ الَّتِي لَيْسَ لِلَّهِ تَعَالَى عَلَيْهَا دَلِيلٌ قَائِمٌ يُوصِلُ إِلَى الْعِلْمِ بِالْمَطْلُوبِ مِنْهَا، لِأَنَّ مَا كَانَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْهِ دَلِيلٌ قَائِمٌ، لَا يُسَمَّى الإِسْتِدْلَال فِي طَلَبِهِ اجْتِهَادًا}[1]، واتە: ئیجتهاد بریتیە لەوە کە لەلایەن بابای کۆششکارەوە ئەوپەڕی توانای بەکاربهێندرێ و زۆر بخەفترێ بۆ زانینی شتێك، بەڵام لە ڕووی عورفی زانایانەوە، ئیجتیهاد مەبەست پێی هەوڵدانە، بۆ زانینی حوکمی ئەو ڕووداوانەی کە ڕوو دەدەن، لەوانەی کە خوای بەرزو مەزن بەڵگەیەکی ئاشکرای لەسەر نەفەرموون، چونکە هەرشتێك کە خوا حوکمەکەی بە ئاشکرا فەرموویێ، ئەوە بەڵگە لەسەر هێنرانەوەی پێی ناگوترێ ئیجتیهاد.

یانی: کە ئێمە بزانین نوێژ فەرزە، پێنج فەرزەی نوێژەکان، پێویستیمان بەئیجتیهاد نیە، چونکە ئەوە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقرة.

هەروەها بۆ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرموویەتی: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ ﴿١٨٣﴾ ﴾

ئەوە پێویستی بە ئیجتیهاد نیە، ئیجتیهاد ئەوەیە حوکمەکەی دیار نەبێ، بەڵام شتێك کە دەقی لەسەر بێ، ئەوە وشەی ئیجتیهادی بۆ بەکار نایەت.

٣- (د. عبدالله درّاز) دەڵێ: {الإجتهاد استفراغ الجهد وبذل غاية الوسع، إما في درك الأحكام الشرعية وإما في تطبيقها}[2]، واتە: ئیجتیهاد بریتیە لە بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانا، سەرف کردنی ئەو پەڕی وزە، یان بۆ زانینی یاسا شەرعییەکان، یاخود بۆ جێبەجێ کردنیان لە واقیعدا.

---

(١) الفصول في الأصول، ج٤ ص ٩-١١.

(٢) تعليق عبدالله دراز على الموافقات للشاطبي، ج٤ ص ٨٩، ئەم پێناسەیە زۆر لە زانایان بەتایبەت (د. أحمد الريسوني) کە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا بە پیاوێکی زۆر بلیمەت دادەنرێ لەبواری (أصول الفقه)دا، دەڵێ: باشترین پێناسەیە.

ب- التـقـلـيـد[1]:

١- (الباجي) دەڵێ: {هو إلتزام حكم المقلَّد من غير دليلٍ}[2]، واتە: تەقلید بریتیە لە پابەندیی بەقسەی کەسێکەوە کە تەقلیدی لێ دەکرێ، بەبێ ئەوەی کە بەڵگە هەبێ، داخۆ پێکاویەتی یان نەیپێکاوە.

٢- هەر لە سەرچاوەی پێشوودا، ئاواش پێناسە کراوە: {الرجوع في الحكم الى قول المُقَلِّدِ من غير علم بصوابه ولا خطئه}[3]، واتە: بریتیە لە گەڕانەوە بۆ قسەی کەسێك کە پەیڕەویی لێ دەکرێ، بەبێ زانینی ئەوە کە پێکاویەتی، یان نەیپێکاوە.

٣- (جلالدين المحَلِّي) دەڵێ: {التقليد قبول قول القائلِ بلا حجة يذكرها}[4] واتە: تەقلید بریتیە لە وەرگرتنی قسەی کەسێك بەبێ بەڵگەیەك کە باسی بکات.

٤- هەروەها هەر لە هەمان کتێبدا، ئاواش پێناسە کراوە: {إلتزام المكلَّفِ في حكمٍ شَرعيٍّ مَذهب مَن ليس قوله حجة بذاته} بریتیە لەوە کە مرۆڤی ئەرکدار (مكلَّف) {ئەو کەسە کە ئەرکی شەرعیی دەکەوێتە سەرێ}، لەحوکمێکی شەرعییدا، پابەند بێ بەقسەی کەسێکەوە، کە ئەو کەسە قسەکەی لە زاتی خۆیدا، بەڵگە نیە.

ئەوەش پێناسەکی جوانە، چونکە ئایا ئەگەر تۆ بەدوای فەرموودەی خوا بکەوی، پێت دەگوترێ موقەللید؟! ئەدی ئەگەر بەدوای فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەوی، پێت دەگوترێ موقەللید؟! کردەوەکەت پێی دەگوترێ تەقلید؟ نا، چونکە فەرموودەی خواو قسەی پێغەمبەری خوا

---

(١) وشەی تەقلید زانایان بەکاریان هێناوە، کە من بۆخۆم لەگەڵ ئەوەدا نیم ئەم وشەیە بەکاربهێندرێ، دواییش ڕوونی دەکەمەوە، بۆچی!

(٢) إحكام الفصول في أحكام الأصول، للباجي، ص ١٧٣.

(٣) پێشوو ص٧٢١.

(٤) توضيح المشكلات من كتاب الورقات، ص٣٩٥.

(صلی الله علیه وسلم) لەخودی خۆیاندا بەڵگەن و، جگە لەخواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ کەسێك قسەکەی بەڵگە نیە، بۆیە زانایان گوتوویانە: (أقوال العلماء يُستَدلُّ لَها وَلا يُسْتَدلُّ بها) قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێندرێتەوە، بەبەڵگە ناهێندرێتەوە، تۆ ئەگەر تەماشای وەزعی ئۆممەت بکەی، ئنجا حاڵی دەبی کە ئەو ئۆممەتە لەگەڵ لاساکردنەوەو تەقلیددا، چی لێهاتوە؟ لەهەزاری یەك ناڵێ: خوا وای فەرمووە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وای فەرمووە، بەوانەشەوە کە بانگەشەی شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵح دەکەن، هەمووی هەر کتێبەو، قسەیەو، مەزهەبە، کە لە ڕاستییشدا، دین بریتیە لەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانە، ئیدی زانایان دەبێ ئەوەت پێ بڵێن، کە خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویانە، ڕێنماییت بکەن بۆ ئەوە، ئەگەر نا خۆ هیچ کەسێك، غەیری خوای کاربەجێ، شەرعی دانەناوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) شەرعدانەر (شارع) نیە، بە سەربەخۆیی، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتی خواداو بەهۆی وەحیی خواوە، ڕێنمایی ئێمەی کردوە.

## بڕگەی دووەم: ڕەوا بوونی شوێنکەوتن (إتباع)ی زانایان:

ئایا ڕەوایە ئێمە بەدوای زانایان بکەوین، یان دەبێ هەموو کەس بۆخۆی بەڕێ بزانێ و هەموو کەس بۆخۆی ئیجتیهاد بکات؟ با تەماشای ئەم چەند دەقە بکەین:

**١و٢**- خوا سبحانه و تعالی لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٧)و، لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٤٣)دا، وەك پێشتریش هێنامانن، دەفەرموێ:

﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾

واتە: ئەگەر نازانن، لە شارەزایان بپرسن.

کەواتە: دروستە بەدوای شارەزایان بکەوی و لێیان بپرسی، مادام بۆخۆت نەزانی، دەبێ بەدوای زانایان بکەوی، ئەمما بۆخۆشت نەزانی و، بەدوای زانایانیش نەکەوی، حاڵت باش نابێ!

٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە درێژەی بەسەرهاتێکدا فەرموویەتی: {...قَتَلُوهُ قَتَلَهُمْ اللَّهُ أَلَا سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ} أخرجه أبو داود برقم (٣٣٦)، والدارقطني (١٨٩/١).

واتە: کوشتیان خوا بیانکوژێ، کە نەیاندەزانی دەبووایە پرسیاریان کردبایە، چونکە چارەسەری نەزانیی، پرسیار کردنە.

پوختەی بەسەرهاتەکەش ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە هاوەڵان بە چالاکییەکی جیهادیی دەردەچن و، یەکیان لە حاڵێکدا کە سەری شکاوە، ئیحتیلامی دەبێ و، کاتێك پرسیار لە هاوەڵەکانی دەکات: ئایا مۆڵەتی هەیە خۆی نەشوات و تەیەممموم بکات؟ دەڵێن: نەخێر، هەر دەبێ خۆت بشۆی، ئیدی کە خۆی دەشوات، بەهۆی تەڕبوونی برینەکەیەوە دەمرێ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە ڕەخنەیان لێ دەگرێ، چونکە ئەو هاوەڵە بریندارە مۆڵەتی خۆ نەشۆردن و تەیەممموم کردنی بۆ هەبووە.

٤- {إنعقاد الإجماع من عهد الصحابة والتابعين، على أن العامة يستفتون العلماء ويتبعونهم في الأحكام الشرعية، ولا يُنكِرونَ عليهم هذا السلوك، وهذا معلوم بالتواتر من علمائهم وعامتِهم}[١]، واتە: یەك دەنگیی و یەك ڕایی زانایان لەسەردەمی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێت و، شوێن کەوتووانیانەوە، لەسەر ئەوە دامەزراوە، کە خەڵك بە گشتیی لە زانایان دەپرسن و، لەحوکمە شەرعییەکاندا شوێنیان دەکەون و، هیچ کەسێك نکوولیی لەوە نەکردوە، ئەوەش بە تەواتور زاندراوە، هەم لە زانایان و، هەم لە خەڵکی بەگشتیی.

---

(١) التجديد الأصولي: نحو صياغة جديدة لعلم أصول الفقه، بإشراف: د. أحمد الريسوني ص، (٧٧٦).

بەڕێزان! ئایا پێتان وایە هاوەڵان هەموویان موجتەهید بوون؟ نەخێر، هاوەڵان بۆخۆشیان لەیەکدیان پرسیوە.

٥- {توقّع الحرج الشديد إذا أُلزِم الجميعُ بالإجتهاد الشرعي في كل نازلةٍ، وهو تكليفٌ بما لا يُطاق وهو مرفوع شرعاً وعقلاً}[١][٢] واتە: سەغڵەتییەکی زۆر تووشی خەڵك دەبێ، ئەگەر هەموویان پابەند بکرێن بەوەوە کە دەبێ بۆخۆیان کۆشش بکەن، لە هەر شتێکدا کە بەسەریان دێ، {بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت}، کە ئەوەش داوا لێکردنی خەڵکە بە شتێك کە لەتوانایاندا نیە، ئەوەش هەم بەشەرع هەڵگیراوەو، هەم بە عەقڵیش هەڵگیراوە.

**یەك:** بەشەرع: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة، خوا لەهیچ کەس داوا ناکات، مەگەر ئەوەی لەتوانای دایە.

**دوو:** بەعەقڵیش دیارە کەسێك شتێکی لەتوانادا نەبێ، لێی داوا ناکرێ.

٦- (أحمد بن عبدالرحيم الدهلوي)[٣]، دەڵێ: {إعلم أن الناس كانوا قبل المائة الرابعة غير مُجْمِعين على التقليد الخالص لمذهب واحدٍ بعينه، وكان من خبر العامة أنهم كانوا في المسائل الإجماعية التي لا اختلاف فيها بين المسلمين، أو جمهور المجتهدين، لا يُقَلِّدون إلا صاحب الشرع}[٤]، واتە: بزانە کە خەڵك پێش سەدەی چوارەمی کۆچیی، یەك دەنگ نەبوون لەسەر لاساکردنەوەی تەواوو ساغ، بۆ ڕایەکی دیاریی کراو، بەڵکو هەواڵی موسوڵمانان بەگشتیی وا بوو، لەو شتانەدا کە یەك دەنگییان لەسەر پەیدا بووەو لەنێو زانایاندا ڕاجیاییان لەسەر نیە، یاخود زۆربەی

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

(٢) چونکە بۆ زانیارییتان! ئەو ڕایەش هەیە، کە دەڵێ: دەبێ هەموو کەس بۆخۆی ئیجتیهاد بکات.

(٣) لەساڵی (١١٧٦)ز وەفاتی کردووە، بە (شيخ ولي اللهِ الدهلوي) ناسراوە، کتێبێکی هەیە بەناوی (حجة الله البالغة)، لە یەك بەرگدا چاپکراوەو لە دوو بەرگیشدا هەیە، بەڕاستی کتێبێکی زۆر نایابە.

(٤) حجة الله البالغة، ص ١٥، ١٥٣.

هەرە زۆری کۆششکەران و زانایان لەسەریان یەك دەنگن، مسوڵمانان بەدوای هیچ مەزهەبێك نەدەکەوتن، بەڵکو ڕێك بەدوای قورئان و سوننەت و شەریعەتێك دەکەوتن، کە لەلایەن خواو پێغەمبەری خواوە هاتوە.

کەواتە: بەگشتی ڕەوایە خەڵك شوێن زانایان بکەون، لە شتێکدا کە نەیزانن.

## بڕگەی سێیەم: پێنج تێبینیی لەبارەی ئیجتهاد و تەقلیدەوە:

### تێبینی یەکەم:

وشەی تەقلیدم پێ باش نیە بەکاربێ، هەڵبەتە لە کتێبەکاندا هاتوە، بەڵام بۆ زانیارییتان! نە لە قورئاندا هاتوە، نە لەسوننەتیشدا هاتوەو، زانایان بەکاریان هێناوە.

بۆچی پێم باش نیە؟

چونکە وشەی (تقليد)لە (قِلادة)وە هاتوە، (قِلادة)، یانی: ڕێشمە، ڕێشمە کە لەملی ولاخی دەکەن و ڕایدەکێشن، جلەویشی پێ دەگوترێ، ئنجا بەڕاستیی من لە مسوڵمانانی ناوەشێنمەوە بڵێم: ڕێشمەیان لەملی کراوە، ئیدی بەهەرحاڵ ئەوە زانایان بەکاریان هێناوە، هەڵبەتە وشەکە لەوێوە هاتوە، بەڵام دوایی مەبەستیان ئەوە نەبووە، بەس کە تۆ لە تەقلید ورد بیەوە، هەر وا دەکاتەوە، کەسێك ولاخێك ڕادەکێشێ، ولاخەکە نازانێ بۆ کوێی دەبەی، مسوڵمانێکیش کە بەدوای کەسێك دەکەوێ و نازانێ بەڵگەکەی چییە؟ ئەوە ڕیشی خۆی لەمست دەنێ! بۆیە وەك دوایی باسی دەکەم: مسوڵمانان پێویستە (إِتِّباع)ی زانایان بکەن، نەك (تقليد)، ئنجا ئایا جیاوازییان چییە؟

تەقلید ئەوەیە، کە تۆ بەدوای زانایەك بکەوی، بەبێ ئەوەی لێی بپرسی: بەڵگەت چییەو چۆنە؟ بەڵام شوێنکەوتن (إِتِّباع) ئەوەیە کە تۆ بەدوای زانایەك بکەوی، بەڵام بەرچاو ڕوونانە، وەك لەسەرەتاوە گوتم: دەبێ بەرچاو ڕوونانە ئینسان بەدوای زانایان بکەوێ، نەك خۆییان تەسلیم بکا، بەبێ ئەوەی کە لێیان

بپرسێ ئەوە چۆنە؟ بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەدا، کە (وعاظ السلاطين) زۆرن، ئەوانە زۆرن لەبەرگی زاناياندا، کە يان نەزانن، يان زۆرزانن و، دينی خوا بەهەرزان دەفرۆشن و، فەتوا بەدڵی حوکمڕان و دەسەڵاتداران دەدەن، ئنجا ئەگەر خەڵك هەروا بەبێ لام و جيم خۆييان تەسليم بکا و شوێنيان بکەوێ، ئەوە دەقەومێ کە ئێستا قەوماوە، دەبينن زانايەك لە وڵاتێك، کەسێك لە وڵاتێك، دامەزراوەيەکی ڕەسميی لە وڵاتێك، فەتوايەك دەردەکا، ئەو خەڵکە هەمووی بەدوای دەکەوێ، لەوڵاتی ئێمەشدا ئەو حاڵەتە هەر هەيە، بۆخۆتان دەبينن، خەڵك بۆچی بەدوای حيزبی عەلمانيی کەوتوە؟ تەماشا دەکات: زانا و مامۆستايانيان لەگەڵدان و، ئەويش بەدوای مامۆستايان کەوتوە، ئنجا مامۆستايەکان بۆخۆشيان هەر لاسايیکەرەوەن و، خەڵکەکەش تەقليدی وان دەکاتەوە، ئيدی حاڵ بەم شێوەيەی لێهاتوە کە دەيبينن، هيچ کاميشی پێی وانيە لەدين لايداوە، هيچيشی بەڕێی ديندا ناڕواو، هەمووشی خۆی پێ مسوڵمانی چاکە!

تێبينی دووەم:

هيچ کام لە هەشت مەزهەبەکان، شوێنکەوتنيان فەرز نيە، بەڵکو فەرز تەنيا شوێن کەوتنی وەحييە، بەڵام ئەوەی شارەزا نەبێ، دەبێ شوێن شارەزايان بکەوێ، بۆيە زانايان بنچينەيەکيان داناوە، دەڵێن: (مذهبُ العامِّيِّ، مذهبُ مُفتيهِ) بابای عەوام مەزهەبەکەی بريتيە لە مەزهەبی ئەو کەسەی فەتوای بۆ دەدات، بێگومان لێرەدا من نامەوێ بڵێم: با خەڵك بەدوای مەزهەبە فيقهييەکان نەکەوێ، لێم تێبگەن! دەڵێم: لەسەر مسوڵمانان پێويست نيە، کە ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە بەتايبەت شوێن فلان مەزهەبە بکەون، ئەوانی ديکەش بەتايبەت شوێن فلان مەزهەب بکەون، ئەوەی کە بۆ مسوڵمانان پابەندکەر (ملزِم)ە، تەنيا وەحييە، شەريعەتە، بەڵام کەسێك بۆخۆی شارەزای شەريعەت نەبێ، دەبێ بەدوای زانايان بکەوێ، بەڵام چۆنيان بەدوا بکەوێ؟ شوێنيان بکەوێ، نەك لاساييان بکاتەوە، بەبێ ئەوەی لێی بکۆڵێتەوە، کوێرانە بەدوايان بکەوێ، واتە: لاسايی کردنەوەی کوێرانە نەبێ، شوێنکەوتنی بەرچاو ڕوونانە بێ.

هەشت مەزهەبەکانیش ئەمانەن: (حەنەفیی، مالیکیی، شافیعیی، حەنبەلیی، جەعفەریی، ئیباظیی، زەیدیی، ظاهیریی)، ئەو هەشت مەزهەبە، ئێستا لە جیهانی ئیسلامییدا شوێنکەوتوویان هەن.

تێبینی سێیەم:

١- ئیجتهاد جاری وایە فەرزی عەین دەبێت، کۆششکردن بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان، جاری وایە فەرزی عەین دەبێ، بۆکەسێك کە لەتوانایدا هەبێ، کۆشش بکات و خەڵکیش پێویستیی پێی بێ و خۆشی پێویستیی پێی بێ، جاری وایە فەرزی عەین و، جاری وایە فەرزی کیفایە دەبێ، خەڵکێك، کۆمەڵگایەك دەبێ هەندێك زانای تێدا هەبن، بتوانن کۆشش بکەن و حوکمە شەرعییەکان هەڵهێنجن، ڕووداویان بەسەر دێن، کارەساتیان دێنە پێشێ، دەبێ بزانن حوکمە شەرعییەکانیان چی و چین؟ چونکە پێشتر ئەو ڕووداوانە نەبوون، تاکو زانایان باسی حوکمە شەرعییەکانیان بکەن.

٢- جاری واش هەیە ئیجتیهاد دەبێتە سوننەت.

٣- هەروەها ئیجتیهاد جاری وایە حەڕام دەبێ، ئەگەر کەسێك ئیجتهاد بکات کە لەتوانایدا نەبێ، وەك دارکەری شەوێ، بە پێخواسیی بەنێو بکەوێ، ئەوە حەڕامە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: شتێك کە زانیارییت دەربارەی نیە، شوێنی مەکەوە.

تێبینی چوارەم:

ئیجتیهاد مەرج نیە یەك پلەو جۆر بێت، بەڵکو زانایان زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: (قد يتجَّزأُ الإجتهاد) ئیجتیهاد بەش بەش دەبێت، دەشتوانین بڵێین: ئیجتیهاد ئەم سێ جۆرو پلەیەی هەن:

أ- (الإجتهاد المطلق)، کە بابای (مجتهد) خۆی ڕێك لە قورئان و سوننەتەوە، یاسا شەرعییەکان هەڵدەهێنجێ.

ب- (الإجتهاد في المذهب)، کە کۆششکەر، لە چوارچێوەی مەزهەبێکدا ئیجتیهاد دەکات.

ج- (الإجتهاد في المسائل) چەند مەسەلەیەك، چەند بابەتێك دێنە پێشێ، دەگونجێ بابای کۆششکەر ئیجتیهادیان تێدا بکات، ئەوەی سێیەمیان بۆ زۆر کەس گونجاوە، مادام توانای هەبێت، شارەزای زمانی عەرەبیی بێ و، شارەزای قورئان و سوننەت بێ، ئەوە ئێستاش لەنێو زانایاندا زۆرە، زۆر مەسەلەی تازە کە هاتوونە پێش، زانایانی هاوچەرخ ئیجتیهادیان بۆ کردوون.

تێبینی پێنجەم:

ئەوەی ڕابرد بە نسبەت کۆششکردنەوە لە مەسەلە شەرعییەکاندا بوو، واتە: لەو شتانەدا کە دەبێ لە شەریعەت حوکمەکەیان دەربهێنین، بەڵام لە بوارەکانی دیکەدا: سیاسیی و، کۆمەڵایەتیی و، جەنگ و، ئاشتیی و، ئابووریی، لە هەموو ئەو بوارانەدا، دەبێ مسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆ شارەزای خۆی، کێ ئابوورییناسە، لەڕووی ئابوورییەوە، پرس بەو دەکەین، کێ پزیشکە، لە ڕووی پزیشکییەوە، پرس بەو دەکەین، کێ لە ڕووی سیاسییەوە شارەزایە، پرس بەو دەکەین، هەروەها لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، پرس بە کۆمەڵناسان دەکەین و... هتد.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ نەیفەرمووە (فاسألوا علماء الدين) لە زانایانی پیاوانی دین بپرسن، فەرموویەتی: ﴿أَهْلَ ٱلذِّكْرِ﴾ یانی: خەڵکی شارەزا، هەرکەسە لەبواری خۆیدا، دەبێ پرسی پێبکرێ و، بەهرە لە شارەزاییەکەی وەربگیرێ.

## بڕگەی چوارەم: حوکمی ئیجتهاد و تەقلید چییە؟

ئەم بابەتە دەکەینە دوو بەش:

### أ- لەبواری عەقیدەدا:

هەڵبەتە وشەی (تقليد) و (إتباع)، لەبەرانبەر (إجتهاد)دان، کەواتە: لەبواری ئیمان و عەقیدەدا، کە ئیجتیهادی تێدا نیە، جێی تەقلید و شوێنکەوتن (إتباع) نیە، پایەکانی ئیمان جاری دیکەش بۆم باسکردوون، نەك لاسایی کردنەوە (تقليد) بگرە شوێنکەوتن (إتباع)یشیان تێدا دروست نیە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار تاکە بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی ئەم کەون و کائیناتەیە، ئایا دروستە لێرەدا تەقلید بکەی، بگرە تەنانەت شوێنکەوتنیش بکەی و بڵێی: فڵانە زانا وا دەڵێ، منیش بەدوای وی دەکەوم؟ نەخێر دەبێ بۆخۆت لە پایەکانی ئیماندا بگەیە ئەو قەناعەتەی:

١- خوا سبحانه و تعالى کێیەو چۆنە؟

٢- ئیمان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

٣- ئیمان بەڕۆژی دوایی.

٤- ئیمان بە فریشتەکان.

٥- ئیمان بە کتێبەکان.

هەروەها ئەو شتانەی دیکەش کە بە دەقی قورئان و سوننەت چەسپاون و زانایان پێیان دەڵێن: (ما عُلِم مِنَ الدِّين بِالضَّرورة)، ئەوەی کە لە دیندا بە ئاشکرا زانراوە، لەو شتانەدا لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی خەڵك دروست نیەو، دەبێ خۆت بگەیە ئەو قەناعەتە.

تەماشا بکەن! مسوڵمانان بۆچی وایان لێهاتوە؟ ئەو حیزبە عەلمانییانەی لە جیهانی ئیسلامییدا هەن، چ لەهەرێمی کوردستانی ئێمەدا، چ لە عێراق و چ لە سەرجەم وڵاتانی دیکەی مسوڵماننشیندا، کەرەستەکەیان چییەو کێن؟ بێگومان هەر ئەو خەڵکە مسوڵمانەیە، ئنجا ئایا ئەو خەڵکە مسوڵمانە، ئەگەر ئیمانێکی تەحقیقییان هەبووایە، نەك تەقلیدیی، شوێن ئەوانە دەکەوتن؟ کەسی مسوڵمان ئەگەر بۆخۆی لەدین تێگەیشتبایە، نەك بە کوێرانە بەدواکەوێ، بەدوای خەڵکی عەلمانیی دەکەوت؟! ئایا عەلمانییەت جێی پێی دەبۆوە لە نێو مسوڵماناندا، ئەگەر مسوڵمانان لەدین تێگەیشتبان؟ ئنجا خۆ ناکرێ تاکو قیامەتێ ئەو خەڵکە هەر لە ناتێگەیشتوویی‌دا بمێنێتەوەو، پێشی وابێ کە ئەوە دینداریيە!! بۆیە هەندێ شتتان کە پێ دەڵێم، با لەگەڵ واقیعەکەشدا گونجاو نەبێ، بەڵام ئێمە دەبێ حەقێ بڵێین، ئیسلام و دینداریی بۆخۆی چۆنە، وای بڵێین، دەبێ مسوڵمانان خۆیان ڕاست بکەنەوە، ناکرێ ئێمە دینەکەمان خوار بکەینەوە، تاکو لەگەڵ واقیعی خواری مسوڵماناندا بگونجێ، دەبێ مسوڵمانان کە خوار بوون، خۆیان ڕاست بکەنەوە، لەگەڵ ڕاستە شەقامی خواداو بەپێی تەرازووی شەریعەتی خوا.

بەڵام لەبواری ئیمان و عەقیدەشدا، ئەو مەسەلانەی کە مشت و مڕیان لەسەرەو، مشت و مڕ هەڵدەگرن، مادام ئیجتیهادیان تێدا بکرێ، کەواتە: کەم و زۆر شوێنکەوتن و تەقلیدیشیان تێدا دروستە[1]، چۆن؟ بۆ نموونە: ئەوە کە پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم)، خوای پەروەردگاری لەشەوی میعراجدا بینیوە، یان نەیبینیوە؟ پێشتر باسمان کرد، هاوەڵان کەوتوونەتە ڕا جیاییەوە، کەواتە: دروستە لێرەدا بڵێی: من بەدوای ڕای فڵان زانایە دەکەوم، لەو مەسەلانەدا کە ڕاجیاییان لەسەرەو ئیجتیهادیان تێدا کراوە، بەڵام کەس ئیجتیهادی نەکردوە دەربارەی خوای پەروەردگار، داخۆ بەدیهێنەرە، یان نا؟ خاوەنە، یان نا؟ پەروەردگارە، یان نا؟ هەر دەبێ ئەو بپەرسترێ، یان نا؟ کەس لەو

---

(١) هەرچەندە وشەی تەقلید وەك گوتم: لەبەر ئەوەی زانایان زۆریان بەکاریان هێناوە، ئەگەرنا بە پەسەندی نازانم بەکار بێ.

بارەوە قسەی نەكردوە، كەسیش لەو بارەوە قسەی نەكردوە بڵێ: ئایا فریشتەكان هەن، یان نا؟ هەروەها ئایا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمِ) ڕاستن، یان نا؟ كتێبەكانی خوا، ڕاستن، یان نا؟ ڕۆژی دوایی هەیە، یان نا؟ ئەوانە پایەكانی ئیمانن و لە چەندان ئایەتی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) باسیان كراوە، لەبەر ئەوە لێرەدا شوێنكەوتن و لاسایی كردنەوە، داد نادا، دەبێ ئینسان خۆی قەناعەتی زاتیی بۆ پەیدا بێ.

**سێ جۆرە بیرو ڕا لە بارەی (تەقلید) و (شوێنكەوتن)ەوە لە بواری عەقیدەدا:**

**ڕای یەكەم:**

گوتوویانە: تەنانەت لەو مەسەلانەشدا كە ڕاجیاییان تێدا هەیە، دەبێ هەموو كەس ئیجتیهاد بكات، خوێندەوارو نەخوێندەوار، كە ئەوە جۆرێك لە تێپەڕاندنی تێدایە.

(إبن تيمية) دەڵێ: {أَمَّا فِي الْمَسَائِلِ الْأُصُولِيَّةِ فَكَثِيرٌ مِنْ الْمُتَكَلِّمَةِ وَالْفُقَهَاءِ مِنْ أَصْحَابِنَا وَغَيْرِهِمْ، مَنْ يُوجِبُ النَّظَرَ وَالإِسْتِدْلَالَ عَلَى كُلِّ أَحَدٍ حَتَّى عَلَى الْعَامَّةِ وَالنِّسَاءِ، حَتَّى يُوجِبُوهُ فِي الْمَسَائِلِ الَّتِي تَنَازَعَ فِيهَا فُضَلَاءُ الْأُمَّةِ قَالُوا: لِأَنَّ الْعِلْمَ بِهَا وَاجِبٌ وَلَا يَحْصُلُ الْعِلْمُ إلَّا بِالنَّظَرِ الْخَاصِّ}[1].

واتە: بەڵام لەمەسەلە بنەڕەتییەكان (أصول الدين)دا، زۆر لە زانایانی عیلمی كەلام و شەرعزانەكان، لە هاوەڵانی ئێمە، (واتە: مەزهەبی حەنبەلیی) و غەیری ئەوانیش گوتوویانە: پێویستە هەموو كەسێك تەنانەت خەڵك بە گشتی و ئافرەتانیش لێبكۆڵنەوەو، تەماشا بكەن، تەنانەت لەو مەسەلانەشدا كە ڕاجیاییان تێدا بووە لەنێوان زانایانی پێشێدا، گوتوویانە: چونكە زانیاریی بەو شتانە پێویستەو، زانیارییش پەیدا نابێ بەبێ سەرنجدان و لێكۆڵینەوەی تایبەتی خۆت.

كە ئەوە وەك گوتم: جۆرێك لە تێپەڕاندنی تێدایەو بار قورس كردنێكی زۆرە بۆ خەڵك.

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٢٠ ص٢٠٢.

ڕای دووەم:

(ابن السُّبكي) دەڵێ: {فإنَّ كثيراً من الفقهاء وبعض المتكلمين جوّزوا التقليد في الأصول، وربما بالغ بعضهم فقال: التقليد واجب والنظر في ذلك حرام}[1].

واتە: زۆرێك لە شەرعزانان و هەندێك لە زانایانی عیلمی کەلام، بە دروستیان داناوە لە بنچینەکانی دینیشدا لاسایی کردنەوە هەبێت، بەڵکو هەندێکیان زێدەڕۆییان کردوەو گوتوویانە: لاسایی کرنەوە واجبەو دروست نیە ئینسان بۆخۆی بیر بکاتەوە لە بنچینەکانی دیندا![2].

دروست نیە بۆخۆت سەرنج بدەی، یانی: حەتمەن دەبێ ئیرادەی خۆت لەمست کەسێك بنێی! کە بە حەقیقەت ئەوە هیچ پەیوەندیی بە دینەوە نیە.

ڕای سێیەم:

هەڵوێستی ڕاست، هەڵوێستی نێوەڕاستە: ئەوەی کە من بۆم دەرکەوتوە هەڵوێستی نێوەڕاست ئەوەیە وەك (إبن تيمية)ش گوتوویەتی: {الّذي عَلَيهِ جُمْهور الأُمّة: فَلَا إطْلَاقُ الْقَوْلِ بِالْوُجُوبِ صَحِيحٌ، وَلَا إطْلَاقُ الْقَوْلِ بِالتَّحْرِيمِ صَحِيحٌ}[3]، واتە: ئەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری ئۆممەت لەسەریەتی ئەوەیە کە: نە بەرِەهایی فەرزکردنی سەرنجدان و تێوە ڕامان ڕاستە بۆ هەموو کەس، نە بەرِەهاییش قەدەغە کردنی سەرنجدان، ڕاستە.

هەڵبەتە بۆ هەندێ خەڵکی عەوام کە هیچ لە هیچ نازانێ، ئنجا بێ لەسەر قەزیەی قەدەرو هەندێك شتی زۆر ورد، سەرنج بدات، ئەگەر بۆ ئەو حاڵەتە

---

(١) الإبهاج في شرح المنهاج، ج٣ ص٢٧٣.

(٢) سبحان الله! هەندێك لە زانایان، نازانم بۆچی کەیفیان پێهاتوە هەر ڕاست عەکسی یەکدی بجووڵێنەوە.

(٣) مجموع الفتاوى ج٢٠، ص٢٠٣.

بڵێی: ئەوە قەدەغەیەو تۆ تێیناگەی، ڕەنگە ڕێی تێبچێ، بەڵام بڵێی لەسەری پێویستە تەقلید بکات، ئەوە وانیەو ئەپەڕەکەی دێتەوە سەر (إتباع)، واتە: بابای عەوام لە زانایەکە بپرسێ و، بەبەرچاو ڕوونیی شوێنی بکەوێ.

**ب- لەبــواری فیقهــدا:**

لەبواری فیقهدا، زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوەن کە شوێنکەوتن (إتباع)و تەقلید بەگشتی دروستن، بەڵام بۆ کەسێك لەتوانای دا هەبێ، ئیجتیهاد کردن فەڕزە.

ئەمەش سێ نموونە لە قسەی زانایان لەو بارەوە:

١- (إبن الصّلاح) دەڵێ: {فكل من لم يبلغ درجة المفتي، فهو فيما يُسأل عنه من الأحكام الشرعية، مستفتٍ ومُقَلِّدٌ لِمَن يُفتيه}[١]، واتە: هەرکەسێك نەگەیشتبێتە پلەی فەتوادەر، ئەوە لەو شتەدا کە لێیان دەپرسرێ لە حوکمە شەرعییەکان، بە پرسیارکەر (مستفتي) لەقەڵەم دەدرێ و، شوێن ئەو کەسە دەکەوێ کە فەتوای بۆ دەدات.

٢- (أبو الوليد الباجي): دەڵێ: {فرض العامي: الأَخْذُ بقول العالِم}[٢]، واتە: بابای عەوام، لەسەری فەڕزە کە قسە لە زانا وەربگرێ.

چاکە کە ئەو باسی تەقلیدی نەکردوە، هەر قسەی لێ وەربگرێ و، لێی تێبگات و، شوێنی بکەوێ.

٣- (الغزالـي) دەڵێ: {العامي يجب عليه الإستفتاء واتِّباع العلماء}[٣]، واتە: ئینسانی عەوام {کەسێك زانا نەبێ} لەسەری پێویستە کە بپرسێ و بەدوای زانایان بکەوێت.

---

(١) أدب المفتي والمستفتي، ص ١٥٨.

(٢) إحكام الفصول في أحكام الأصول، ص ٧٢٨.

(٣) المستصفى من علم الأصول، ج٢ ص ٣٨٩.

ئەوانە وشەی (إتباع)یان زیاتر بەکارهێناوە، هەست دەکەم وشەی تەقلید لەدواییدا زیاتر بەکارهاتوە، پێشیٚ زانایان زیاتر وشەی (إتباع)یان بەکارهێناوە.

## برگەی پێنجەم: بەڵگەی فەرز بوونی (إجتهاد) بۆ کەسی تواناداروو، ڕەوا بوونی شوێنکەوتن (إتباع) بۆ کەسی بێ توانا:

### أ- فەڕز بوونی (إجتهـاد):

ئایا بەڵگەمان چییە، لەسەر ئەوە کە فەڕزە ئیجتیهاد بکرێ؟

بۆ فەڕز بوونی ئیجتیهاد، دەتوانین ئاماژە بەچەند دەقێك بکەین:

١- لەسووڕەتی (النساء) ئایەتی (٨٣)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴿٨٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، بۆلای مشورخۆران و کاربەدەستان (ئەوانیش هەموویان نا) ئەوانەیان کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی (واتە: دەیانزانی ئایا ئەو هەواڵە بڵاوبکرێتەوە، یان بڵاو نەکرێتەوە؟).

ئنجا ئەگەر هەواڵێکی ئاسایی، تەنیا ئەهلی هەڵهێنجان (إستنباط) بۆیان هەبێ بڕیار بدەن بڵاو بکرێتەوە، یان بڵاونەکرێتەوە؟ ئەدی هەواڵ بەناوی خواوە، کە ئەو شتە حەڵاڵە، ئەو شتە حەرامە! بەتەئکید هەموو کەس بۆلای نیە بڵاوی بکاتەوەو، هەموو کەس بۆی نیە بڵێ: ئەوە حەرامە و ئەوە حەڵاڵە، بەڵکو دەبێ بگەڕێینەوە بۆلای خەڵکی شارەزا و زانا.

٢- لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٢)دا، کە پێشتریش هێنامان، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ ﴿١٢٢﴾ ﴾ التوبة.

واتە: دەبووایە لەهەر کۆمەڵێکی زۆر، دەستەیەکیان دەربچن بۆ ئەوەی لە ئاییندا شارەزا بن....

کەواتە: (تَفَقُّه) یانی: ورد تێگەیشتن لە دین، پێویستەو ئەگەر بەهەموو مسوڵمانانیش نەکرێ، دەبێ کەسانێکیان خۆیانی بۆ تەرخان بکەن، چونکە (فِرقة) کۆمەڵێکی زۆری مسوڵمانان و (طَائِفَة)ش کۆمەڵێکی کەمیان، دەگەیەنن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە: ئیجتیهاد کردن لەسەر هەموان فەرز نیە، چونکە لە توانایان دانیە، بەڵام دەبێ کەمێکیان هەبن شارەزا بن و، ئەوانی دیکەش پرسیاریان لێ بکەن.

٣- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ: {وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ} أخرجه أحمد برقم (٢١٧٦٣)، وأبو داود برقم (٣٦٤١)، والترمذي برقم (٢٦٨٢)، وابن ماجه برقم (٢٢٣)، وابن حبان برقم (٨٨)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١٦٩٦). قال الألباني: صحيح.

واتە: بێگومان زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەبەر چاو ڕوونیی دینداریيان کردوە، لە ڕێی وەحییەوە، یاخود لە ڕێی ئیجتیهادی خۆیانەوە، ئنجا دەبێ زانایانیش وەحیی بکەنە چرایەك و ئەوەی وەحییش نەیفەرمووبوو، دەبێ عەقڵی خۆیان بەکاربێنن بۆ هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان لە وەحیی خوا.

٤- ئەو فەرمایشتەی موعاذی کوڕی جەبەل، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەینێرێ بۆ یەمەن و پێی دەفەرموێ: ئەگەر کێشەیەکت هاتە پێش چی دەکەی؟ موعاذ دڵێ: دەگەڕێمەوە بۆ کتێبی خوا، فەرمووی: ئەگەر لە کتێبی خوادا حوکمەکەیت چنگ نەکەوت؟ گوتی: دەگەڕێمەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: ئەگەر لەوێشدا نەتبینی؟ گوتی: {أَجتهدُ رأْيِي ولا آلو}، واتە: هەوڵدەدەم بەڕای خۆم حوکمەکەی بزانم، کەمتەرخەمییش ناکەم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەستی لە سینگیداو فەرمووی: {الحمدلله وَفَّق رسولَ رسولِ الله، لِما يرضي رسولَ الله}، واتە: ستایش بۆ ئەو

خوایەی کە نوێنەری پێغەمبەری خوای یارمەتییدا، بۆ شتێك کە جێگای ڕەزامەندیی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)[١].

براو خوشکانی بەڕێز!

بەبێ ئیجتیهاد، دین لە ژین بەجێ دەمێنێ، ئێستا تەماشای وەزعی موسوڵمانان بکەن: دینەکەمان لە ژینەکەمان بەجێماوە، هەڵبەتە بەجێماوەکە ئەصڵی دینەکەمان نیە، بەڵکو تێگەیشتنی ئێمەیە بۆ دینەکەمان کە لە ژینەکەمان بەجێماوە، ئێستا موسوڵمانان - وەك نووسەرێك گوتوویەتی و قسەکەی زۆر جوانە- ئەو چەکانەی جەنگیان پێدەکەن، کافر بۆی دروست کردوون، ئەو جل و بەرگەی لەبەری دەکەن، کافر بۆیان دەنێرێ، ئەو داو و دەرمانەی بەکاری دێنن، کافر بۆیان دەنێرێ، ئەو خواردنەی کە دەیخۆن، کافر بۆیان دەنێرێ، سەیارەو تەیارەو کەل و پەلەکانیش کە بەکاریان دێنن، هەمووی لە کافرستانەوە بۆیان دێن!! کەواتە: موسوڵمانان لەسەردەمی خۆیان بەجێ ماون، ئنجا ئایا خەتای دینەکەیانە؟ بەتەئکید نەخێر، بەڵکو خەتای تێگەیشتنی هەڵەیانە بۆ دینەکەیان، کە وەك گوتم: هی وایان هەیە دەڵێ: لە عەقیدەشدا دەبێ لاسایی بکەیەوەو کوێرانە شوێن بکەوی، ئنجا چۆن بەجێ نامێنین!!.

---

(١) درێژەی دەقەکە بەم شێوەیە هاتوە: { عَنْ أُنَاسٍ مِنْ أَهْلِ حِمْصَ مِنْ أَصْحَابِ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ، قَالَ: كَيْفَ تَقْضِي إِذَا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ؟ قَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّهِ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي وَلَا آلُو، فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدْرَهُ، وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ } أخرجه أحمد برقم: (٢٢١٥٣)، وأبو داود برقم: (٣٥٩٤)، قال الألباني: ضعيف، قال: شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لإبهام أصحاب معاذ وجهالة الحارث بن عمرو.

ب- ڕەوا بوونی شوێنکەوتن (إتِّباع):

كە پێشتر پێناسەمان كردو قسەمان لەبارەوە كرد، بۆیە ئێستا هەر بە كورتی دەڵێین:

مادام خوای میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾ ﴾ التغابن.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {وَإِذا أَمَرتُم بِأمرٍ فَأتوا مِنْه ما اسْتَطَعْتم} متفق عليه، هەروەها زانایانی ئیسلامیش وەك بنچینەیەكی شەرعیی گوتوویانە: {لا يَسْقط المَيْسورُ بِالمَعْسور} كەواتە: هەرچەندە لە ئەسڵدا ئیجتیهاد كردن بۆ هەڵێنجانی حوكمە شەرعییەكانی لە قورئان و سوننەت، لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزە، بەڵام كەسێك توانای نەبێ، ئەو ئەركە شەرعییەی ناكەوێتە سەرشان و، ئەوەی دەكەوێتە سەری ئەوەیە كە بەرچاو ڕوونانە شوێن زاناو شارەزایانێك بكەوێ، كە توانای ئیجتیهادیان هەیە.

# بنەمای دوازدەیەم

## خۆپاراستن لە بەکافر دانانی مسوڵمانانێك کە کوفر، یان شیرکیان لێ دەزانرێ، مەگەر دوای بەڵگە لەسەر تەواوکردن

ئەمەش تایبەتمەندییەکی گرنگ و هەستیارە، لە بەرنامەو ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانانداو، هەوڵدەدەم بە گوشراویی بۆ ئێوەی بەڕێزی بخەمە ڕوو، سەرەتا با تەماشای ئەم چەند دەقە بکەین:

١- خوا سبحانە و تعالى لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٩٤)دا دەفەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا ﴿٩٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکاتێك بەزەویدا ڕۆیشتن (کە مەبەست پێی جەنگ و جیهادە)، چاو ورد بکەنەوەو بەر پێی خۆتان ببینن و، کەسێك سڵاوتان لێ دەکا، مەڵێن: تۆ بڕوادار نی.

کە ئەمە هۆی هاتنە خوارەوەیەکی هەیە: کۆمەڵێك لە هاوەڵان بەلای کەسێکدا ڕۆیشتن، مەڕو بزنی پێ بوون، ئەوانیش تەماحیان لە مەڕو بزنەکانی

کردو کابرایان کوشت، هەرچەندە کابرا سەلامی لێکردن، بەڵام کوشتیان و گوتیان: ئەوە بەقەستی سەلامیّ دەکا، بۆ ئەوەی نەیکوژین، ئەگەر نا کابرا کافرە، مەڕو ماڵەکەشیان لیّ داگیر کرد[١].

خوای پەروەردگار بەو بۆنەوە ئەمەی ناردە خوار.

هەڵبەتە مسوڵمانانیش تووشی غەڵەت و پەڵەت دەبن، بەهۆی تەماحی دنیاوە.

٢- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النساء)، ئایەتی (١١٦)دا، دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ ﴾ النساء.

واتە: بێگومان خوا لەوە نابووریّ هاوبەشی بۆ دابندریّ، بەڵام جگە لەوە بۆ هەرکەسێك بیەویّ لیّی دەبووریّ و، هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنیّ، بە گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە.

٣- لەسوورەتی (الزمر) ئایەتی (٥٣)دا، دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر.

واتە: بڵیّ: ئەی ئەو بەندانەم! کە دەرحەق بەخۆتان زێدەڕۆییتان کردووە، لەبەزەیی خوا نائومێد مەبن، بێگومان خوا لە هەموو گوناحان دەبووریّ و بەتێکڕا، بەدڵنیایی ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

٤- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەفەرمایشتێکدا دەفەرمویّ: {أَيُّمَا امْرِىءٍ قالَ لِأَخِيهِ: يا كافِر! فَقَدْ باءَ بِها أحدُهُما، إنْ كانَ كما قالَ، وإلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ} أخرجه مسلم برقم (٦٠)، والترمذي برقم (٢٦٣٧) وقال: حسن صحيح غريب، وأخرجه أيضا: إبن حبان برقم (٢٥٠)، وابن والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٦٦٦٤).

---

(١) بروانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١ ص٤٦٠، هەروەها بروانە: صحيح البخاري: ٤٥٩١، وصحيح مسلم: ٣٠ ٢٥.

واتە: هەر بڕوادارێك بە برایەکەی بڵێ: ئەی کافر! ئەوە یەکێکیان گوناحەکەی کەوتۆتە سەرشان، ئنجا ئەگەر ئەو کەسە کە پێیگوتوە: کافر، کافر بێ، ئەگەر نا، گوناحەکەی دەگەڕێتەوە سەر خۆی.

هەڵبەتە مانای وا نیە کە خۆی کافر دەبێ، یانی: گوناحی بە کافر دانانەکە دەکەوێتە سەری، ئەگەرنا، ئەگەر ئەو مانایەی دیکەی لێ بگرین، بەنەزانیی، لەوانەیە مسوڵمانێکی کۆ دەنگیی لەسەر {متفق علیه} لە دنیادا نەمێنێ!! وردبن لە تێگەیشتنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم)، (باءَ بِها أحدُهُما)، یانی: یەکێکیان گەڕاوەتەوە بە سزا (عقوبة) یان خراپە (سیئة)ی ئەو بە کافر دانانەوە[1].

٥- لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ رَمَى مُؤْمِناً بِكُفْرٍ، فَهُوَ كَقَتْلِهِ} أخرجه أحمد برقم (١٦٤٣٢)، والبخاري برقم (٥٧٠٠)، ومسلم برقم (١١٠)، وأبو داود برقم (٣٢٥٧)، والترمذي برقم (١٥٤٣)، وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٣٨١٣)، وابن ماجه برقم (٢٠٩٨)، والدارمي برقم (٢٣٦١)، وابن حبان برقم (٤٣٦٧)، وأخرجه أيضا: ابن أبي شيبة برقم (١٢١٥٤)، وأبو يعلى برقم (١٥٣٥).

واتە: هەرکەسێك بڕوادارێك تۆمەتبار بکات بە کوفر، وەك ئەوە وایە: کوشتبێتی.

ئەمە چەمکی فەرموودەکەی پێشێ ڕوون دەکاتەوە، ئینسان کەسێك بکوژێ، پێی کافر نابێ، کەواتە: یانی: گوناحێکی گەورەی کردوە.

---

(١) بۆیەش ڕاناوی مێینە (مؤنث) ی بۆ بەکار هێنراوە، چونکە مەبەست لە (ها) لە وشەی (بها)دا: (عقوبة) یان (سیئة)یە.

بەشەكانی كوفر:

كوفر بە گشتی دەبێتە دوو بەش: ١- كوفری گەورە، ٢- كوفری گچكە، ئنجا ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە، زیاتر كوفری گەورەیە، بەڵام باسی كوفری گچكەش دەكەین.

أ- كوفری گەورە:

ئایا كوفری گەورە هەر یەك جۆرە؟ نەخێر، بەڵكو كە تەماشای قوڕئانم كردوە -ڕەنگە زیاتریش بێ-، بەڵام بەلای كەمەوە كوفری گەورە، دە (١٠) جۆری هەن:

١- كُفُـرُ الجُحُـود:

كوفری نكووڵیی لێكردن، یانی: بزانێ حەقەو دانی پێدا نەهێنێ، وەك لە سوورەتی (النمل) ئایەتی (١٤)دا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ﴿١٤﴾ ﴾ النمل.

(دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموێ): هەرچەندە لە دڵی خۆیاندا لێی دڵنیابوون كە ڕاستە (واتە: موعجیزەكانی مووسا)، بەڵام (جُحُود)یان پێكرد، واتە: نكووڵییان لێكردو، دانیان پێدا نەهێنا.

٢- كُفُر التَكذيب:

كوفری بەدرۆدانان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یاخود حەق بە درۆ دەزانێ، دوای ئەوەی دێ بۆ لای، ئایا لە دۆزەخدا جێگاو ڕێگا نیە بۆ کافران، {کە تێیدا سزا بدرێن}؟!

٣- كُفر الإستكبار:

کوفری خۆ بەزلگرتن، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ١١١﴾ الشعراء.

(قەومی نووح بەنووحیان گوت): ئایا ئێمە لەگەڵ تۆ بڕوا بێنین، بۆتۆ بڕوا بێنین، لە حاڵێکدا کە هەرچی و پەرچییەکان، {خەڵکە سادەو ڕەش و ڕووتەکە} بەدوات کەوتوون؟ (واتە: ئێمە لەوە گەورەترین لەگەڵ واندا بڕوا بەتۆ بێنین) ئەمەش کوفری خۆ بەزلگرییە.

٤- كُفر الإعراض:

کوفری پشت تێکردن، ئیهمال کردن، وەك خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ٣﴾ الأحقاف.

واتە: ئەوانەی کە بێ بڕوان، لەوەی کە پێی ترسێندراون و لێی ورياکراونەوە، پشت هەڵکردوون[1].

---

(١) هەندێك نووسەر (پێویست ناکات ناوی کەس بێنم) گوتوویانە: کەسێك کە نەزانێ ئیسلام چییە، با بەهۆی ئەوەشەوە بێ کە خۆی پێوە ماندوو نەکردوە، بەکافر لەقەڵەم نادرێ، چونکە کافر کەسێکە حەقی ناسیبێ و ڕەفزی کردبێ، ئەمە ڕاستە ئەوە مانای کافرە، بەڵام ئەوەش هەر کوفرە، یەکێ بێ بڵێ: من پێغەمبەری خوام و ئەو حەقە بۆم هێناوی، بەڵام ئیهمالی بکات و پشتی تێبکات، کوفری پشت تێکردن و ئیهمال کردنیش هەیە.

٥- كُفر الشَكِّ والتّرَدُّد:

کوفری دوودڵیی و دڵ لەدڵدان، ڕاڕایی، (شك) بەمانای گومان نیە، بەمانای دوو دڵییە، (ظَنْ) بەمانای گومانە، خوا دەفەرموێ:

﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ٩ ﴾ إبراهيم.

واتە: پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەبەڵگە ئاشکرایەکانەوە هاتنە لایان، قەومەکانیان دەستیان بەدەمەوە نان (دەستیان بە دەمی پێغەمبەرانەوە نا، واتە: بێ دەنگ بن، یاخود دەستیان بەدەمی خۆیانەوە نا، وەك گاڵتە پێکردن)و، گوتیان: ئێمە ئەوەی ئێوە پێی ڕەوان کراون، پێی بێ بڕواین و، ئەوەی کە ئێوە ئێمەی بۆ بانگ دەکەن، لە بارەیەوە لە دوو دڵییەکی دڵ ناڕەحەت کەرداین.

کەواتە: دوودڵییش هەر کوفرە.

٦- كُفر النفـــاق:

کوفری نیفاق و دەغەڵیی، (نفاق) ئەوەیە کە ئینسان ئیسلامەتیی پێشانبداو، لە دڵیدا کوفر هەبێ، خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨ ﴾ البقرة.

واتە: لە خەڵکی هەیە کەسانێك کە دەڵێن: بڕوامان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هێنا، بەڵام بڕواشیان نەهێناوە.

کەواتە: بە قسە وا دەڵێن، بەڵام لە دڵیاندا کوفر هەیە، ئەوەش کوفری نیفاقە.

٧- كُفر البُغـض:

کوفری ڕق لێهەڵسان، ڕق لێبوونەوە، خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی:

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ ﴾ محمد.

واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە ڕقیان لەوە هەڵسا، کە خوا ناردوویەتە خوار {بۆیە خوا کردەوەکانی هەڵوەشاندنەوە}(١).

---

(١) چەندان کەس هەن لە حیزبە عەلمانییاکان، ڕقیان لە زۆر حوکمی شەرعییە، هەروەها لەوەش خراپتر هەیە: جارێك لە مەجلیسێك مەلایەك باسی شتێکی دەکرد، دەیگوت: بەخوا نازانم خوای پەروەردگار ئەوەی بۆچی قەدەغە نەکردوە، گوتم: مامۆستا! دەزانی دەڵێی چی؟ گوتی: ڕاست دەکەی، گوتم: مامۆستا ئەوە کوفرە چۆن شتی وا دەڵێی؟ یانی: تۆ پێشنیار بۆ خوا دەکەی، یان ڕەخنەی لێ دەگری؟

براو خوشکەکانم! دەبێ ئینسان زۆر ئاگای لەخۆی بێ، هەرچی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، فەرموویانە، دوای ئەوەی دەردەکەوێ ئەوە حەقێکە خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانەو، تێی گەیشتی، دەبێ تەسلیمی بی، ئەگەر لە دڵتدا دەمارێك جووڵا شتێکی بەدڵ نەبوو، دەبێ ئەو دەمارە سەرکوت بکەی، ئەوە دەماری وەسوەسەی شەیتانە، جاری وا هەیە هەندێك حوکمی شەرعیی هەیە، بەڵام مرۆڤ پێی خۆشە بە نەوعێکی دیکە بێ.

بۆ وێنە: بۆ مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان، یان لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: {لَا تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ} أخرجه أحمد برقم (٤٦٥٥)، والبخاري برقم (٨٥٨)، ومسلم برقم (٤٤٢)، وابن حبان برقم (٢٢٠٩). واتە: {بەندە مێیینەکانی خوا لەماڵەکانی خوا قەدەغە مەکەن}، عومەر خوا لێی ڕازی بێ پێی ناخۆش بوو خێزانەکەی بچێ، خێزانەکەشی دەیگوت: ئنجا ئەگەر لێم قەدەغە دەکەی، ناچم، دەیگوت: نا، قەدەغەت ناکەم، ژنەکەی دەشیزانی پێشی ناخۆشە، بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) وای فەرموو بوو، عومەر نەیدەگوت: مەچۆ! دوایی عومەر جۆرێك ڕەفتار دەکات لەگەڵ خێزانەکەی لە تاریکیی شەوو لەکاتی چوونە مزگەوتدا، خێزانەکەی دەڵێ: لەمەودوا ناچمە مزگەوتێ، عومەر دەڵێ: بۆچی؟ خێزانەکەی دەڵێ: خەڵك خراپ بووە، نازانێ عومەر بووە، دیارە بەنەوعێك دەستێکی گەیاندۆتێ! یانی: عومەر خۆی پاراستوە لەوەی شتێك بکات پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر بێ (صلی الله علیە وسلم)، پێشی ناخۆش بووەو زۆر غەیرەی هەبووە! ئینسان دەبێ وریا بێ، ئافرەتان هەندێك جار مەسەلەی چەند ژنیی و مەسەلەی

**٨- كفـر الإستهــزاء:**

کوفری گاڵتە پێکردن، خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴿٦٦﴾ ﴾، التوبة.

واتە: ئەگەر لێیان بپرسی {لە مونافیقەکان، لە دڵ نەخۆشەکان} دەڵێن: ئێمە هەر وا دەچووینە نێو قسان و گاڵتەمان دەکرد {قسەی ڕێمان دەکرد بۆ ئەوەی ڕێی پێ ببڕین}، بڵێ: ئایا گاڵتە بە خواو بە ئایەتەکانی و بە پێغەمبەرەکەی دەکەن، پۆزش مەهێننەوە، لەدوای ئەوەی ئیمانتان هێنابوو، کافر بوون.

کەواتە: بە گاڵتەکردن بە خواو بەئایەتەکانی خواو بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئینسان کافر دەبێت.

**٩- كفـر الشـرك:**

کوفری شیرك، هاوبەش بۆ خوا دانان، لە بەدیهێنەرایەتییدا، یان لە خاوەنداریێتی دا، یان لە پەروەردگاریێتیی دا، یان لە پەرستراوێتیی دا، یاخود لە ناو و سیفەتەکانیدا، خوای تاك و پاك دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الزمر.

واتە: سروش کراوە بۆ تۆ و بۆ ئەوانەی پێش تۆش {بۆتان نێردراوە}، کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، کردەوەکانت هەڵدەوەشێنەوەو، لە زیانباران دەبی.

---

میرات و، مەسەلەی شایەدیی و، ....هتد، دێنە پێشێ، با ئافرەتانی بێ دین، خوشکانی ئێمە نەخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە، وەك وان بیربکەنەوەو، وەك وان بڵێن، دوایی لە دڵیاندا جۆرێك لە ڕق لێهەڵسان هەبێ لە حوکمێکی شەرعیی، چونکە ئەوە کوفرە.

ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام مەبەست پێی خەڵکی دیکەیە، چونکە خوا زانیویەتی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شیرك ناکات، کەواتە: جۆرێکی دیکە لە کوفر بریتیە لە شیرك واتە: شتێك بهێنیە ئاستی خوا، لە شتێك لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خواوە.

١٠- كفـر الإلحـــاد:

کوفری لادان، کوفری بێ بڕوایی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا ﴿٢٤﴾ ﴾ الجاثیة.

واتە: (کافرەکان) گوتیان: ژیان هەر ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین و تەنیا ڕۆژگار ئێمە لەبەین دەبا.

واتە: ئێمە لەبەر دەستی خوادا نین، لەبەر دەستی کەس دانین، ئەوەش: نکوولیی کردنە لە بوونی خوا، کە ئەوەش جۆرێکی دیکەیە لە کوفرو، کوفرێکی زۆریش خەستە.

ب- کوفری بچووك:

زانایان وەك پێناسێك گوتوویانە: کوفری بچووك، یانی: گوناهێك کە مرۆڤی پێ لە بازنەی ئیمان و ئیسلام ناچێتە دەرێ، ئەویش لەبەر ئەوەی هەندێك لە فەرمایشتەکان، وشەی کوفریان تێدا هاتوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا مەبەست پێی گوناحی گەورەیە، یانی: هەندێك گوناحی گەورە ناونراون: کوفر.

ئەمەش چەند دەقێکی شەریعەت لەو بارەوە:

١- خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات، واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕواداران پێکەوە جەنگیان کرد، ئاشتەواییان لەبەیندا بکەن.

کەواتە: دەگونجێ ئیمانداریش بن و یەکدیش بکوژن، چونکە قەتڵ گوناحی گەورەیە، بەڵام ئیمان لە ئینسان لانابا.

٢- لە فەرمایشتێکیدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ} أخرجه أحمد برقم (٣٦٤٧)، والبخاري برقم (٤٨)، ومسلم برقم (٦٤)، والترمذي برقم (١٩٨٣) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٤١٠٨)، وابن ماجه برقم (٦٩)، وأخرجه أيضا: ابن حبان برقم (٥٩٣٩).

واتە: جنێودان بە مسوڵمان مایەی فاسق بوونەو، جەنگ لەگەڵدا کردنیشی کوفرە.

٣- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ} أخرجه أحمد برقم (١٩٢٣٧)، والبخاري برقم (١٢١)، ومسلم برقم (٦٥)، والنسائي برقم (٤١٣١)، وابن ماجه برقم (٣٩٤٢)، والدارمي برقم (١٩٢١)، وابن حبان برقم (٥٩٤٠).

واتە: لەدوای من خۆتان کافر مەکەنەوە، هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن.

٤-لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ} أخرجه أحمد برقم (٦٠٧٢)، والترمذي برقم ١٥٣٥) وقال: حسن، والحاكم برقم (٤٥) وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي برقم (١٩٦١٤)، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٣٢٥١)، وأبو عوانة برقم (٥٩٦٧)، وابن حبان برقم (٤٣٥٨)، قال الألباني: صحيح.

واتە: هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، کوفری کردوە یان شیرکی کردوە.

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ على المَيِّتِ} رواه أحمد: ١٠٤٣٨، ومسلم: ٦٧. واتە: دوو سیفەت لە نێو خەڵکدا هەن، دوو سیفەتی کوفرن تێیاندا: تانەدان لە نەسەب و ڕەچەڵەك و، شین گێڕان لەسەر مردوو.

کەواتە: ئایا مەبەست لەمانە چییە؟ بەتەئکید مەبەست لەو کوفرە، کوفری گچکەیە، واتە: گوناحی گەورە.

## شەش (٦) ڕوونکردنەوەی گرنگ لە بارەی کوفرو شیرکەوە:

**١)- مەرج نیە هەر قسەو کردەوەیەکی کوفر یان شیرك، مایەی بە کافر دانان یان بە هاوبەشدانەر دانانی مرۆڤـ بێ:**

(ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو بارەوە گوتوویەتی: {قَدْ يَكُونُ الفِعل أو المَقالَة كُفْرًا، فَيُطْلَقُ الْقَوْلُ بِتَكْفِيرِ صَاحِبِهِ وَيُقَالُ: مَنْ قَالَ كَذَا فَهُوَ كَافِرٌ، لَكِنَّ الشَّخْصَ الْمُعَيَّنَ الَّذِي قَالَهُ، لَا يُحْكَمُ بِكُفْرِهِ حَتَّى تَقُومَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ الَّتِي يَكْفُرُ تَارِكُهَا... فَلَا يُشْهَدُ لِمُعَيَّنٍ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِالنَّارِ، لِجَوَازِ أَنْ لَا يَلْحَقَهُ الْوَعِيدُ لِفَوَاتِ شَرْطٍ أَوْ ثُبُوتِ مَانِعٍ}[1]، واتە: جاری وا هەیە کردەوەیەك، یان قسەیەك کوفرە، دەشگوترێ هەرکەسێك ئەو قسەیە بکات، {یان هەر کەسێك ئەو کردەوەیە بکات (وەك سەجدە بردن بۆ صەنەم)} ئەوە کافرە، بەڵام بۆ کەسێکی دیاریی کراو کە ئەو قسەیە دەکات {یان ئەو کردەوەیە دەکات}، یەکسەر ناگوترێ کافرە، هەتاکو بەڵگەی لەسەر تەواو نەکرێ، بەڵگەیەك کە هەرکەسێك وازی لێبێنێ، پێی کافر دەبێ... بەڵام هەر کەسێك لە ئەهلی قیبلە کە زاندرابێ مسوڵمانە، ناگوترێ: ئەوە دۆزەخییە، {ناگوترێ: ئەوە کافرە} چونکە دەگونجێ ئەو حوکمە بەسەریدا نەچەسپێ، لەبەر ئەوەی کە مەرجێکی تێدا نەهاتۆتە دی، یاخود پەرچێکی هاتۆتە بەر.

**٢)- یەقین بە دوودڵیی هەڵناوەشێتەوە:**

بنچینەیەکی دیکە کە زانایان لەو بارەوە دایان ناوە دەڵێ: {اليَقين لا يَزُول بالشَك} دڵنیایی بە دوو دڵیی لاناچێ.

هەروەها بنچینەیەکی دیکە دەڵێ: {مَنْ ثَبَتَ إِسْلامهُ بيَقينٍ فَلا يَزولُ بالشك}، هەرکەسێك دڵنیا بی لێی کە ئەوە مسوڵمانە، لەبەر ئەوەی کە لێی کەوتووینەتە

---

(١) مجموع الفتاوى ج٣٥ ص١٦٥.

دوو دڵیی و گومان، بەوە سیفەتی مسوڵمانەتیی لێ لاناچێ، هەروەك چۆن کەسێك کە یەقینی هەبێ کە دەست نوێژی هەیە، بەوە کە دوو دڵییەکی بۆ پەیدا دەبێ، گوێ ناداتە دوو دڵییەکە، تاکو یەقینی پەیدا دەبێ، یەقین بەیەقین لادەچێ، نەك بە دوو دڵیی (شك).

**٣)- بەبێ چەسپانی مەرجەکان و، لاچوونی پەرچەکان {ثبوت الشروط، وانتفاء الموَانع} نابێ حوکمی کوفر یان شیرك بەسەر کەسدا بدرێ:**

ئەم بنچینەیە بنچینەیەکی گەورەو گرنگە، بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ مەسەلەی بەکافر یان موشریك دانانی کەسێکدا.

**أ- مەرجەکان بۆ بەکافر دانانی کەسێك:**

١- عەقڵ (العقل).
٢- باڵغ بوون (البلوغ).
٣- پێگەیشتنی پەیامی ڕوون (البلاغ المبین).

یانی: دەبێ ئەو کەسە:

**١)**- عاقڵ بێ، چونکە شێت بەکافر داناندرێ، هەروەها منداڵ بە کافر داناندرێ، کە جارێ عەقڵی کامڵ نەبووە.
**٢)**- دەبێ باڵغ بێ.
**٣)**- دەبێ پەیامی خوای بە ئاشکرا پێ گەیشتبێ.

چونکە کەسێك ئەرکێکی شەرعیی پێ نەگەیشتبێ، پێی موکەللەف نابێ.

بیستوومە کاتی خۆی لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، مسوڵمانەتییەکەیان بەس ئەوەندە بووە، بەرەو قیبلە مردوویان ناشتوون، هیچی دیکەیان لێ نەزانیوە، دەڵێن: ئێستاش خەڵك هەیە لە وڵاتی چین، کە هیچ لە ئیسلامەتیی نازانن، تەنیا خەتەنە کردن و مردوو ناشتن و، هێندێك لەو شتانە دەزانن.

ب- پەرچەکان لەبەردەم بەکافر یان موشریك دانانی کەسێك دا:

١- نەتوانین (العَجْز).

٢- نەزانین (الجهل)[1].

٣- هەڵە کردن (الخطأ).

٤- لەبیر چوونەوە (النسیان).

٥- زۆر لێکران (الإکراه)[2].

٦- تەئویل کردن (التأویل)[3].

کەواتە: هەرکات ئەو شەش پەرچە، یەکێکیان ببێ، ڕێ دەگرێ لەوەی حوکمی کافربوون بەسەر کەسێکدا بچەسپێندرێ، هەرچەندە کوفرو شیرکیشی لێ بیسترابێ، یان بینرابێ.

---

(١) لەو بارەوە فەرمووودەیەکی پێغەمبەری خوا هەیە کە ئەوە کورتەی واتایەکەیەتی: {کابرایەك زۆر گوناحان دەکات، دوایی وەسیەت دەکات بۆ کوڕەکانی دەڵێ: ئەگەر مردم بمسووتێنن، نیوەی خۆڵەمێشەکەم بەبەحرێ دابکەن، نیوەشی ڕۆژێك بایەکی بەقوەتی بێ، بڵاوی بکەنەوە، دەڵێ: چونکە ئەگەر خوا زیندووم بکاتەوە، زۆر خراپ سزام دەدات، {وام بڵاوبکەن، کۆنەکرێمەوە}، ئنجا کە دەمرێ، وای لێدەکەن و کوڕەکانی وەسیەتەکەی جێبەجێ دەکەن، خوای پەروەردگاریش بەدەریا دەفەرموێ: کۆی بکەوە، هەروەها بە وشکانیی دەفەرموێ: کۆی بکەوە، پاشان پێی دەفەرموێ: بۆچی وات کرد؟ دەڵێ: خوایە لە ترسی تۆ؟ دەفەرموێ: ئەوە لێت خۆش بووم}. بڕوانە: صحیح البخاري: ٧٥٠٦، وصحیح مسلم ٢٧٥٦.

(٢) وەك عەمماری کوڕی یاسر کە کافرەکان ئازاریان دەدا، تاکو قسە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڵێ و، باب و دایکییان شەهید کردبوون، ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: [إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ] النحل: ١٠٦، لەبارەی ئەوەوە هاتۆتە خوار. بڕوانە: الإستیعاب في بیان الأسباب ج٢ ص٤٢٣.

(٣) بۆ زانیارییتان! هەندێك لەوانەی کە خۆیان بە {سەلەفیی} ناو دەنێن، زۆر لە ئەهلی (تأویل)یان وەك (الأشاعِرة، والماتریدیة)و، هەر کەسێك تەئویلی کردبێ، بە گومڕاو لادەریان داناوە، بێ خەبەر لەوەی کە (تأویل) وەك دوایی باسی دەکەین، حاڵەتێکە، هیچ کەس ناتوانێ بەرەهایی لێی دوور بێ، بۆ وێنە ئیمام ئەحمەد ئەو ئایەتەی تەئویل کردوە: [وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ] الحدید: ٤، واتە: خوا لەگەڵتانە لە هەرجێیەك بن، گوتوویەتی: (أي: بِعِلمِهِ وَبِقُدرَتِهِ)، چونکە ناکرێ بڵێی: خوا لێرەیە، ئەدی چۆن خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی و، لەدەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە؟!.

**٤)- جیاوازیی کردن لەنێوان بەکافردانانی گشتیی و تایبەتیی دا:**

بەڵێ پێویستە جیاوازیی بکرێ لەنێوان (التّكفير للنّوع) و( التكفير للمعين):

(التكفير للنّوع) یانی چی؟ یانی: دەتوانی بڵێی: هەموو ئەوانەی بت دەپەرستن، هەموو ئەوانەی کە لە غەیری خوا دەپاڕێنەوە، هەموو ئەوانە موشریکن، یان هەموویان کوفر دەکەن، بەڵام بۆ کەسێکی دیاریی کراو (مُعَيَّنْ) دەبێ لێی بکۆڵیەوە، ئایا ئەو کەسە:

١- پەیامی ڕوون (البَلاغ المُبين)ی پێ گەیشتوە؟
٢- عەقڵی تەواوە؟
٣- باڵغە؟

پاشان: ئایا هیچ کام لەو شەش پەرچانەی کە ڕێ دەگرن لە کافرکردنی، لە ئارادانین؟ ئنجا حوکمەکەی بەسەردا دەدرێ.

**٥- چەند تێبینییەکی گرنگ لەسەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):**

فەرموودەکە بەچەند ڕێژگە (صيغة)یەك هاتوە، کە ئێمە دووانیان دێنین:

١- {إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابَيْنِ افْتَرَقُوا فِي دِينِهِمْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً {يَعْنِي الْأَهْوَاءَ} كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلَّا وَاحِدَةً، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ} أخرجه أحمد برقم (١٦٩٧٩)، والطبراني برقم (٨٨٥)، والحاكم برقم (٤٤٣)، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٤٥٩٧)، وابن أبي عاصم في السنة برقم (٢)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن وحديث افتراق الأمة، صحيح بشواهده.

واتە: خاوەن کتێبەکان لە دینداریی خۆیاندا بوونە حەفتاو دوو (٧٢) تاقم، ئەم ئۆممەتەش لە دینداریدا دەبێتە حەفتاو سێ (٧٣) تاقم، {یانی: خاوەن ئارەزووە داهێنەرەکان} هەموویان لە ئاگردان، جگە لە یەکێکیان، ئەویش بریتیە لە کۆمەڵی مسوڵمانان {یانی: زۆربەو جەماوەریان}.

٢- {افْتَرَقَتْ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفَرَّقَتْ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً} أخرجه أبو داود برقم (٤٥٩٦)، والترمذي برقم (٢٦٤٠) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٣٩٩١)، والحاكم برقم (١٠)، والبيهقي برقم (٢٠٦٩٠)، وأخرجه أيضا: أحمد برقم (٨٣٧٧)، وأبو يعلى برقم (٥٩١٠)، وابن حبان برقم (٦٢٤٧)، قال الألباني: حسن صحيح.

واتە: جوولەکەکان بوونە حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو بەش و، نەصرانییەکان بوونە حەفتاو یەك، یان حەفتاو دوو بەش، ئۆممەتی منیش دەبێتە حەفتاو سێ بەش.

ئەم دەقە هەندێك کەس دەیکاتە بیانوو بۆ بەکافر دانانی هەندێك لە مسوڵمانان، کە شکڵی حیزب بەخۆوە دەگرن، شێوەی مەشرەبێکی دیاریی کراوو، تەوژمێکی دیاریی کراو بەخۆوە دەگرن، کە بەتەئکید ئەوە زۆر هەڵەیە.

(االخطابي) لە بارەی ئەو دەقەوە دەڵێ: {فِيهِ دِلالةُ على أنَ هذهِ الفِرَقَ كُلَّها غَيرُ خارِجَةٍ مِنَ الدينِ، إذ قَدْ جَعَلَهم النبـيُّ كُلَّهُمْ مِنْ أُمتِهِ}[1]، واتە: ئەم دەقە {لە فەرزێکدا کە بڵێین: سەنەدەکەشی ڕاست بێ، چونکە مشت و مڕی زۆری لەسەرە}، دەلالەتی ئەوەی تێدایە کە ئەو حەفتا و سێیە، هەموویان لە ئایین بەدەرنین و لە نێو بازنەی ئۆممەتی پێغەمبەردان (صلى الله عليه وسلم)، چونکە پێغەمبەر هەموویانی بە ئۆممەتی خۆی داناوە.

(إبن تيمية)ش دەڵێ: {والنَبـيُّ لَم يُخْرِجْهم مِنَ الإسلامِ، بَل جَعَلَهُم مِن أُمّتِهِ}[2]، واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە ئیسلامی نەبردوونەتە دەرێ، بەڵکو فەرموویەتی ئۆممەتی منن.

واتە: هەر لە چوارچێوەی ئۆممەتدان.

ئنجا وەك گوتم: لەسەر سەنەدەکەشی مشت و مڕی زۆر هەیە، زۆر لە زانایان ڕەتیان کردۆتەوە، یەکێك لەوانە (إبن حزم)، گوتوویەتی: ئەوە فەرمایشتی

---

(١) معالم السنن ج٧ ص٤.

(٢) منهاج السنة النبوية، ج٥، ص٢٤١.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نیە، بەبەڵگەی ئەوە: چۆن خوای بەرزو مەزن بە ئۆممەتی موحەممەد دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران.

کەچی جوولەکە حەفتاو یەك تاقم و، نەصرانیی حەفتا و دوون و، هی ئێمە حەفتاو سێ و، لەوان زیاترن؟! دەڵێ: ئەوە نەنگیی (ذَم) دەگەیەنێ، لە حاڵێکدا کەخوا دەفەرموێ: ئێوە ئەی ئۆممەتی ئیسلام! باشترین کۆمەڵن، هەروەها بەڵگەی دیکەش هەر دێنێتەوە.

بەڵام هەندێکیان دەڵێن: سەنەدەکەی ڕاستەو جێگیرە، ئنجا ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە جێگیر بێ، گرنگ ئەوەیە ناکرێتە بەڵگە، لەسەر لادان و گومڕایی هەموو ئەو کۆمەڵ و تەوژمانەی کە کەسانێکی {سەلەفیی ناو} لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان دەکەن! وەك ئەو زانایانە گوتیان، بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەکرێتە بەڵگەی ئەوە کە ئەوانە هەموویان لەبازنەی ئۆممەتدان، بەڵام غەڵەت و پەڵەتیان هەیە.

هەڵبەتە ئەگەر گریمان ئەو دەقە بشکرێتە بەڵگەی دەعوای باسکراو، ئەوە (سەلەفیی ناو)ەکان پێش هەمووان دەگرێتەوە، چونکە دەیان گرووپ و دەستەی (سەلەفی ناو) هەن کە هەرکەسە بە دۆڵ و شیوێکدا دەڕوات!

لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین: {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ) قَالَ: دَخَلَ قُلُوبَهُمْ مِنْهَا شَيْءٌ لَمْ يَدْخُلْ قُلُوبَهُمْ مِنْ شَيْءٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قُولُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَسَلَّمْنَا، قَالَ: فَأَلْقَى اللَّهُ الْإِيمَانَ فِي قُلُوبِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا) قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، (رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا) قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، (وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا) قَالَ: قَدْ فَعَلْتُ}، أخرجه مسلم برقم (١٢٦)، والترمذي برقم (٢٩٩٥٤).

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ بۆمان دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی ئەو دوو ئایەتە (٢٨٤و٢٨٥)ی کۆتایی سووڕەتی (البقرة) دابەزین، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾

{واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خوایە، ئنجا ئەوەی لە دەروونتاندا هەیە دەریخەن، یاخود پەنهانی بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەسەری لەگەڵدا دەکات، ئنجا هەرکەس بیەوێ دەیبووری و، هەرکەسێکیش بیەوێ سزای دەداو، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە}.

هاوەڵان شتێك چووە دڵیانەوە کە بەهۆی هیچ شتێکەوە ئاوا دڵیان سەغڵەت نەبووبوو، {لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئەو ئایەتەمان بۆ جێ بەجێ ناکرێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئایا دەتانەوێ وەك خاوەن جوولەکەو نەصرانییەکان بڵێن: {سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا} بیستمان، بەڵام سەرپێچییمان کرد؟} بڵێن: {سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَسَلَّمْنَا}، پەروەردگارمان! ئەوە فەرمانی تۆمان بیست و وەرمانگرت و فەرمانبەرییش دەکەین، دوای ئەوە خوا ئیمانی خستە دڵیان، {واتە: ئەوەیان کەوتە دڵ کە وا بڵێن}، دوای ئەوە خوا سبحانە و تعالی ئەو ئایەتەی نارده خوار:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا .... ﴾

{واتە: خوا لە هیچ کەس داوا ناکات، مەگەر ئەوەی کە بۆی دەکرێ، هەر شتێك کە بەدەستی بێنێ لە چاکە، خۆی لێی بەهرەمەندەو، هەر شتێك لە خراپە وەدەستی بێنێ، خۆی لێی زەرەرمەندە، پەروەردگارمان! ئەگەر لەبیرمان چوو، یان هەڵەمان کرد سزامان مەدە}، خوا فەرمووی: ئەوە وام کرد، {پەروەردگارمان! بارێك کە لەوانەی پێشێت بار کردوە، بەهۆی گوناهێکەوە کە لەسەر وی سزات داون، ئێمە وا لێمەکە}، فەرمووی: ئەوە کردم، {لێمان ببوورەو بەزەییت پێماندا بێتەوە، تۆ سەرپەرشتیارمانی}، خوا فەرمووی: ئەوەشم قەبووڵ کرد.

دیارە مەبەست ئەوەیە کە خوای کاربەجێ، لەسەر هەڵە، لەسەر لەبیرچوون، لەسەر شتێك کە ئینسان لە توانایدا نیە، مرۆڤ سزا نادات، دوایی خوای میهرەبان بۆی ڕوون کردوونەوە کە ئەو خولیایەی بە دڵ و مێشکتدا دێ، بەڵام دەست خۆت نیە، لەسەری سزا نادرێی، بە مەرجێك نەیکەیە بڕیارو، دڵتی لەسەر نەچەسپێنی، هەر شتێك دڵتی لەسەر نەچەسپێ، خەتەرەیەك کە بەدڵت دادێ و پێشت ناخۆشە، ئەوە هیچ لێپرسینەوەی لەسەر نیە، ئەم ئایەتە ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە.

ئنجا وەك لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا باسم کردوە[١]، هەندێك گوتوویانە: ئەم ئایەتەی دوایی، دوو ئایەتەکەی پێشێی، نەسخ کردوونەوە، هەتا (إبن عباس)یش ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، کە: ئەوەی دوایی ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە!، بەڵام بۆ زانیارییتان! ئەوان وشەی نەسخیان کە بەکارهێناوە، بەو مانا باوو عورفییە نەبووە کە دوایی زانایان پێیان بەکاریان هێناوە، کە بریتیە لە: {إزالة حكم سابق بحكمٍ لاحق} واتە: لابردنی حوکمێکی پێشتر، بە حوکمێکی دواتر، بەڵکو مەبەستیان پێی ئەوەیە: شتێك گشتیی (عام) بووبێ، دوایی تایبەت (تخصیص) کرابێ، یان شتێك ڕەها (مطلق) بووبێ و دوایی بەنددار (مقیّد) کرابێ، یان شتێك کورت (مجمل) بووبێ و، دوایی ڕوون و واڵاکرابێ و (تفصیل) درابێ، یاخود مەبەستیان پێی پلە پلەیی (تدرُّج) بووە.

ئەو ئایەتەش لەوەیانە کە: پێشێ خوا بەگشتیی فەرموویەتی، بەڵام دوایی خوای کاربەجێ کە ئەوان خەریك بووە بە هەڵە لێی تێبگەن، بۆی ڕوون کردوونەوە، کە دەفەرموێ: ئەوەی لە دڵتاندایە ئاشکرای بکەن، یان پەنهانی بکەن، خوا لێتان دەپرسێتەوە، واتە: ئەوە مانا گشتییەکەی مەبەست نیە، کە هەرشتێ بەدڵتدابێ، لەسەری سزا بدرێی! بەڵکو یانی: ئەوەی کە دڵتانی لەسەر دەچەسپێنن، خوا لەسەر ئەوە لێتان دەپرسێتەوەو سزاتان دەدات.

---

(١) واتە: بەرگی یەکەمی: {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز}.

هەر بۆیەش زانایان دەڵێن: ئەگەر کەسێك دڵی خۆی بچەسپێنێ لەسەر گوناهێك، گوناهەکەی بۆ دەنووسرێ، یانی: دڵی خۆی لەسەر بچەسپێنێ، بەڵام بۆی نەکرێ ئەنجامی بدات، بۆی دەنووسرێ، بەڵام وەك خۆی بۆی دەنووسرێ، هەروەك چۆن ئەگەر دڵی خۆی بچەسپێنێ لەسەر چاکەیەك، یەك بە دە (١٠)، تاکو یەك بە حەوسەد (٧٠٠)یش بۆی دەنووسرێ.

**٦- دەقێکی ڕۆشنکەرەوەی {إبن تيمية}، لە بارەی دووربینی (إحتياط) کردن لە بواری بە کافر داناندا:**

لە کۆتایی ئەم باسەی دوازدەیەمدا، چەند قسەیەکی (إبن تيمية) دێنین، کە بەڕاستی تیشکێکی باشمان بۆ دەخەنە سەر هەڵوێستی زانایانی پێشوومان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، دەربارەی مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو غەڵەت و پەڵەت و لادانانەی کە مسوڵمانان تووشیان دەبن، بە کوفرو شیرکیشەوە، کەسێك کوفرێکی بەزار دادێ، شیرکێکی بەدەم دادێ، یاخود شتێك دەکا کە بە کوفر یان شیرك لەقەڵەم دەدرێ، چۆن دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ یان مسوڵمانێك گوناهێك دەکات، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ هەرچەندە ئەوەی کە لێی دەخوازمەوە، بڕێك درێژە، بەڵام تیشکێکی باش دەخاتە سەر ئەو بابەتەمان، گوتوویەتی:

{وَالْخَوَارِجُ الْمَارِقُونَ الَّذِينَ أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقِتَالِهِمْ، قَاتَلَهُمْ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَحَدُ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، وَاتَّفَقَ عَلَى قِتَالِهِمْ أَئِمَّةُ الدِّينِ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ، وَلَمْ يُكَفِّرْهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، وَغَيْرُهُمَا مِنْ الصَّحَابَةِ، بَلْ جَعَلُوهُمْ مُسْلِمِينَ مَعَ قِتَالِهِمْ، وَلَمْ يُقَاتِلْهُمْ عَلِيٌّ حَتَّى سَفَكُوا الدَّمَ الْحَرَامَ وَأَغَارُوا عَلَى أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَاتَلَهُمْ لِدَفْعِ ظُلْمِهِمْ وَبَغْيِهِمْ، لَا لِأَنَّهُمْ كُفَّارٌ، وَلِهَذَا لَمْ يَسْبِ حَرِيمَهُمْ، وَلَمْ يَغْنَمْ أَمْوَالَهُمْ، وَإِذَا كَانَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ ثَبَتَ ضَلَالُهُمْ بِالنَّصِّ وَالْإِجْمَاعِ، لَمْ يُكَفَّرُوا مَعَ أَمْرِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بِقِتَالِهِمْ، فَكَيْفَ بِالطَّوَائِفِ الْمُخْتَلِفِينَ الَّذِينَ اشْتَبَهَ عَلَيْهِمْ الْحَقُّ فِي مَسَائِلَ غَلِطَ فِيهَا مَنْ هُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ؟ فَلَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ مِنْ هَذِهِ الطَّوَائِفِ أَنْ تُكَفِّرَ الْأُخْرَى وَلَا تَسْتَحِلَّ دَمَهَا وَمَالَهَا، وَإِنْ كَانَتْ فِيهَا بِدْعَةٌ مُحَقَّقَةٌ}[1].

---

(١) مجموعة الرسائل والمسائل، ج٢ ص ٢٧٨-٣٨٠

واتە: خەواریجی دەرچوو (واتە: ئەوانەی دەرچوون لە فەرمانبەریی کردن بۆ خەلیفەی چوارەم عەلی خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد کە جەنگیان لە دژ بکرێ و، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ئەو فەرمانەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) جێبەجێ کرد لە ڕۆژگاری خۆیدا، کە یەکێکە لە چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، ئنجا هەموو ئەوانەی پێشەوای دین بوون لە هاوەڵان و لە تابیعین و، ئەوانی دوای وانیش، یەك دەنگ بوون لەسەر جەنگ کردن لە دژی خەواریج، بەڵام نە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، نە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، نەغەیری ئەو دووانەش لە هاوەڵان، ئەوانەیان بە کافر دانەنا، بەڵکو بە مسوڵمانیان دادەنان، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە دژیشیان دەجەنگان، ئنجا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، لە دژیان نە جەنگا، مەگەر دوای ئەوەی کە خەڵکیان کوشت و[1]، ماڵی مسوڵمانانیان دەست بەسەردا گرت، ئیدی {عەلی خوا لێی ڕازی بێ} بۆ بەرپەرچ دانەوەی ستەمەکەیان، جەنگی لە دژ کردن، نەك لەبەر ئەوەی کە کافر بن، هەر بۆیەش ئافرەتەکانی بە دیل نەگرتن و، ماڵ و سامانیانی بە دەستکەوت و غەنیمەت لەقەڵەم نەدا.

ئنجا ئەگەر ئەوانە کە بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و بە یەك دەنگیی هاوەڵان، چەسپابێ، کە گومڕابن، بە کافر لە قەڵەم نەدرابن، لەگەڵ ئەوەشدا کە خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانیان کردوە بە جەنگ لەدژ کردنیان، ئەدی ئەو کۆمەڵ و تاقمانەی کە ناکۆك دەبن و، لە ڕاستە شەقام لادەدەن و، هەقیان لێ ون دەبێ و، لە هەندێك مەسەلەدا بە هەڵەدا دەچن، کە کەسانێك لەوان زۆر زاناتر بوون، تێیاندا بەهەڵەدا چوون، ئەوانە بۆیان نیە یەکێکیان ئەوی دیکەیان کافر بکات، یاخود خوێنی یان ماڵی بۆ خۆی حەڵاڵ بکات، هەرچەندە داهێنانێکی جێی دڵنیاییشیان هەبێ (واتە: بیدعەتێکی سەلمێنراو).

---

(١) مەشهوورە کە یەکێك لە هاوەڵانیان کوشت خۆی و خێزانەکەشی کە دوو گیان (حامل) بوو، یەکیان گوتی: ئەوە (حامل)ە، ئەوەی دیکە گوتی: بیکوژە، چونکە (وَلا يَلِد إلاّ فاجِراً كَفّاراً) ئەوەندە دڵ ڕەق بوون!

دوایی (إبن تيمية) بەردەوام دەبێ و دەڵێ: {وَإِذَا كَانَ الْمُسْلِمُ مُتَأَوِّلاً فِي الْقِتَالِ أَوْ التَّكْفِيرِ، لَمْ يُكَفَّرْ بِذَلِكَ، كَمَا قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِحَاطِبِ بْنِ أَبِي بلتعة: يَا رَسُولَ اللهِ دَعْنِي أَضْرِبُ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْراً، وَمَا يُدْرِيك أَنَّ اللَّهَ قَدْ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْت لَكُمْ، فَهَكَذَا السَّلَفُ قَاتَلَ بَعْضُهُمْ بَعْضاً مِنْ أَهْلِ الْجَمَلِ، وصفِّين، وَنَحْوِهِمْ، وَكُلُّهُمْ مُسْلِمُونَ مُؤْمِنُونَ كَمَا قَالَ تَعَالَى:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات.

فَقَدْ بَيَّنَ اللَّهُ تَعَالَى أَنَّهُمْ مَعَ اقْتِتَالِهِمْ وَبَغْيِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ، إخْوَةٌ مُؤْمِنُونَ، وَأَمَرَ بِالإِصْلَاحِ بَيْنَهُمْ بِالْعَدْلِ، وَلِهَذَا كَانَ السَّلَفُ مَعَ الِاقْتِتَالِ يُوَالِي بَعْضُهُمْ بَعْضًا، مُوَالَاةَ الدِّينِ، لا يُعَادُونَ كَمُعَادَاةِ الْكُفَّارِ، فَيَقْبَلُ بَعْضُهُمْ شَهَادَةَ بَعْضٍ، وَيَأْخُذُ بَعْضُهُمْ الْعِلْمَ عَنْ بَعْضٍ، وَيَتَوَارَثُونَ، وَيَتَنَاكَحُونَ، وَيَتَعَامَلُونَ بِمُعَامَلَةِ الْمُسْلِمِينَ بَعْضِهِمْ مَعَ بَعْضٍ}.

واتە: مسوڵمان کە بە تەئویل جەنگ دەکا، یاخود کەسێك بە تەئویل کەسێك بە کافر دادەنێ، بەوە بەکافر لە قەڵەم نادرێ[١]، خەواریج بە تەئویل ئەم کارەیان کرد[٢]، هەروەها وەك عومەری کوڕی خەتتاب دەربارەی (حَاطِبِ بْنِ أَبِي بلتعة)

---

(١) دیارە خەواریج جۆرێك لە تێگەیشتنی هەڵەیان هەبوو بۆ ئەو ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة، تێیدا بەهەڵە دا چووبوون، بەوە عەلییان خوا لێی ڕازی بێ بەکافر دانا، گوتیان: تۆ خەلیفەی مسوڵمانان نیی؟ گوتی: با، گوتیان: چۆن دەبێ خەلیفەی مسوڵمانان ڕازی بێ دوو دادوەر دابنیشن داخۆ چۆن مامەڵە بکەن؟ گوتی: ئەدی بۆ خۆتان نەتان گوت: ئەگەر شەڕەکە ڕانەگری، ڕازی نەبی بە دادوەریی، نابێ، گوتیان: با، بەڵام ئێمە بە هەڵەدا چوو بووین و، ئێمە پەشێمانین، تۆش هەڵەت کردوە، دەبێ تۆش پەشێمان بیەوە، ئێمە ئێستا مسوڵمانین، تۆش بەو گوناهە کافر بووی، دەبێ تۆش پەشێمان ببیەوە، عەلی خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: وەڵڵاهی لەو کاتەوەی مسوڵمان بووم کوفرم نەکردوەو کافریش نەبووم، تاکو مسوڵمان ببمەوە، ئیدی ئەوە بوو کە لێی یاخی بوون.

(٢) عەلی خوا لێی ڕازی بێ چەند پیاوێکی دووربین و بە حەوسەڵەو زانا بوو، لەسەر قسەی

وان شەڕەکەی ڕاگرت لەگەڵ موعاویە، ئەگەرنا موعاویەو کۆمەڵەکەی ڕووحیان گەیشتبووە لووتیان و بە تەواویی تێکشکا بوون، قورئانیان بەرز کردنەوە گوتیان: با قورئان لە نێوانماندا حەکەم بێ، عەلی خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەوە فێڵە، شەڕ ڕامەگرن و زۆری نەماوە، چونکە ئەوانە یاخی بوون، خەواریج گوتیان: شەڕ ڕانەگری، ئێمە لە دژی تۆ دەجەنگین! ئیدی بە ناچاریی شەڕەکەی ڕاگرت، دواییش کە دوو حەکەمەکەش: ئەبو مووسای ئەشعەریی و عەمری کوڕی عاص خوا لێیان ڕازی بێ و خوا لێیان خۆشبێ، فەشەلیان هێنا، لەبەر ئەوەی کە عەمری کوڕی عاص فێڵی لە ئەبوو مووسای ئەشعەریی کرد، بەسەرهاتەکەی هەیە، پێویست ناکات من باسی بکەم، شتێکی زۆر ناخۆش بووە، ئەوە بوو کە کێشەکە هەروەك خۆی مایەوە، ئنجا خەواریج گوتیان: تۆ فێڵت لێکرا، نەدەبوو ڕازی بووای، ئیدی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی نارد بۆ لایان، گوتی: کێشەتان چییە؟ گوتیان: کێشەمان ئەوەیە عەلی بە دوو دادوەرەکە ڕازیی بووە بەمەش کافر بووە، لەبەر ئەوەی بە حوکمی بەشەر ڕازی بووە!

ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ئایا کێشەی نێوان دوو کۆمەڵ لە مسوڵمانان گەورەترە، یان کێشەی نێوان ژن و مێردێك؟ گوتیان: هی نێوان دوو کۆمەڵی مسوڵمانان، گوتی: خوا بۆ چارەسەری کێشەی نێوان ژن و مێرد فەرمووییەتی: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەگەر لە ناکۆکیی نێوانیان ترسان، دادوەرێك لە لایەنی ژنەکەو، دادوەرێك لەلایەنی پیاوەکە بنێرن با پێکەوە دابنیشن؟ گوتیان: وایە.

پاشان گوتی: ئایا کێشەی نێوان دوو کۆمەڵی مسوڵمانان گەورەترە، یان ئەوە ئەگەر کەسێك بەبەرگی ئیحرامەوە نێچیرێك بکوژێ؟ کە خوا لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴿٩٥﴾ ﴾، گوتیان: ڕاست دەکەی، ئیدی زۆریان پەشێمان بوونەوە لەو هەڵوێستەی خۆیان، بەڵام هەندێکیان هەر مانەوە، ئەوە بوو کە شەڕی نەهرەوان ڕوویدا، بۆیەش عەلی خوا لێی ڕازی بێ، کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی خەواریج و گوتیان: ئەوانە چین؟ (أكفّار هؤلاء؟ قال: لا، من الكفر فرّوا) ئایا بێبڕوان؟ گوتی: نەخێر، لە کوفر ڕایان کردوە، لە ترسی کافر نەبوونێ وایان کردوە، گوتیان: ئەدی مونافیقن؟ گوتی: نەخێر، خوا دەربارەی مونافیقان دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ ﴾ النساء، واتە: بەکەمیی نەبێ یادی خوا ناکەن، بەڵام ئەوان نوێژو تاعەتێکی زۆریان هەیە، گوتیان: ئەدی ئەوانە چین؟ گوتی: (أَصَابَتهم فِتنةٌ فَعَمُوا فيها وَصَمّوا وَبَغَوا عَلَينا) السنن الكبرى، للبيهقي (١٧٤/٨)، ورواه عبدالرزاق في (العقول) (١٠/ ١٧٤)، إبن أبي شيبة في (الجمل): ٣٩٠٩٧.

فیتنەو بەڵایەك تووشیان بووە، کوێر بوون و کەڕ بوون و، ستەمیان لێمان کرد، دوای ئەو

کە نامە دەنووسێ بۆ هاوبەش دانەرەکان و ئاگاداریان دەکات، {دوایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی دەکات بۆ لێپرسینەوە}، عومەر دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! لێم گەڕێ بە لە گەردنی ئەو مونافیقە بدەم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئاخر ئەوە بەشداری جەنگی بەدر بووە، تۆ چووزانی! دەبینی خوا سەرنجێکی داوەتە ئەهلی بەدرو فەرموویەتی: بڕۆن لەمەودوا هەرچی دەکەن، بیکەن، لێتان خۆش بووم، {یانی: ئەو هەڵوێستەی کە بەشدارییەتی لە جەنگی بەدردا، ئەو وردە هەڵەی ئێستای دەسڕێتەوە}.[1]

دوایی دەڵێ: ئاوا پێشین جاری وابووە پێکەوە جەنگیشیان لە دژی یەك کردوە، وەك ئەهلی (جَمَل) و (صفِّين)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمووشیان مسوڵمان و ئیماندارن، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات.

لە کۆتاییدا دەڵێ: خوای بەرز لەگەڵ ئەوەشدا کە پێکەوە شەڕیان کردوەو ستەمیان لە یەکدی کردوە، بەڵام ڕوونی کردۆتەوە کە هەر برای ئیمانداریشن لەگەڵ یەکدی، پێشین بەو شێوەیە بوون کە برایەتییان لەگەڵ یەکدا دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ناکۆکییش دەکەوتە نێوانیان، دەستیان دەچووە خوێنی یەکدی، بەڵام وەك دژایەتیی کافران دەکەن، ئاوا دژایەتیی یەکدییان نەدەکردو، هەندێکیان شایەدییان لە یەکدی قبووڵ دەکردو، هەندێکیان زانیارییان لە هەندێکیان وەردەگرت و، دیارییان لە یەکدی وەردەگرت و، میراتیان لە یەکدی دەگرت و، ژن و ژنخوازییان لەگەڵ یەکدی دەکرد، وەك مسوڵمان مامەڵەیان پێکەوە دەکرد.

---

هەموو ستەم و خراپەیە، کە دوایی هەر خەواریج عەلیشیان خوا لێی ڕازی بێ شەهید کرد، بەڵام ئەمە وای لێ نەکردوە لە هەق بچێتە دەرێ، ئێستا مسوڵمانی وا هەیە کەسێك هەر جنێوی پێبدات، دەڵێ: کافر بووی، یان قسەیەکی پێ بڵێ، زۆر خراپتری پێ دەڵێتەوە!

(١) بڕوانە: صحيح البخاري: ٤٨٩٠ و صحيح مسلم: ٢٤٩٤.

بنەمای
سێزدەیەم

## زانیاریی دەربارەی ئایین و، شارەزایی بە ژین

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لەو بنەمایانەی کە لە ڕێبازی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵماناندا، هەمیشە درەوشاوە بوون و، ئەگەر سەرنجیان بدەین دەبینین: هەم لە ئایینیدا شارەزا بوون، هەم لە ژیندا بەرچاو ڕوون بوون، سەرەتا ئاماژە دەکەین بە چەند دەقێك:

١- لە سووڕەتی (محمد) ئایەتی (١٩)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ (١٩).

واتە: بزانە کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە.

کەواتە: دەبێ بزانین و، زانیارییمان هەبێ، بۆیە زانایان گوتوویانە:

{وَكُلُّ مَن بِغَيرِ عِلمٍ يَعملُ ... أَعمالُهُ مَردودَةَ لا تُقْبَلُ}.

واتە: هەر کەسێك بەبێ زانیاریی کار بکات، کردەوەکانی بەسەردا دەدرێنەوەو، قبووڵ ناکرێن.

بەڵێ دینداریی و مسوڵمانەتیی بە زانیاریی و شارەزایی دەکرێ، بە نەزانین و بێ ئاگایی ناکرێ.

٢- لە سوورەتی (المجادلة) ئایەتی (١١)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە: خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە بەرزیان دەکاتەوە، بەڵام ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، چەندان پلە زیاتر لە بڕوادارانی گشتیی بەرزیان دەکاتەوە.

٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَنْ يُرِدِ الله بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ} أخرجه أحمد برقم: (٧٢٣٤) ، والبخاري برقم: (٥٣٢١)، وابن حبان برقم: (٢٩٠٧).

واتە: هەر کەسێك خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئایینندا شارەزای دەکات.

ئەوە بە نسبەت شارەزایی لە ئاییندا.

بەنسبەت بەرچاو ڕوونییش لە ژیندا، دەتوانین چەندان بەڵگە بهێنینەوە، بۆ نموونە:

٤- ئایەتی (١٠٨) لە سوورەتی (یوسف) کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

واتە: (خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:) بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، لەبەر ڕۆشناییدا، بەبەرچاو ڕوونییەوە، بانگەواز بۆ لای خوا دەکەین و، پاکیی بۆ خواو من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم.

واتە: پاکیی بۆ خوا، کە بەبێ ئاگایی و نەزانیی و نەشارەزایی خەڵکی بۆلا بانگ بکەم، من لە هاوبەش بۆخوا دانەران نیم، کە بە لاسایی کردنەوەی

کوێرانە، دوای پێشینان بکەوم، بەڵام نەزانم خوای پەروەردگار چی بە چاك داناوەو، چی بە خراپ و حەڕام داناوە!

٥- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە موعازی کوڕی جەبەل دەنێرێ بۆ یەمەن پێی دەفەرموێ: {إِنَّكَ تَأْتِي قَوْماً مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ، فَادْعُهُمْ إِلى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ} أخرجه البخاري برقم: (١٤٩٦)، ومسلم برقم: (٢٩).

واتە: بێگومان تۆ دەچیە لای کۆمەڵە خەڵكێك کە خاوەنی کتێبن، (نەصڕانیی بوون) ئنجا با یەکەم شتێك کە تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەکەی، ئەوە بێ کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، واتە: پێشێ بانگیان بکە بۆ خوا بە یەکگرتن.

**قسەیەکی پڕشنگداری (إبن القیم):**

(إبن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێ، عیبارەتێك دێنێ کە زۆر لە زانایان لێیانەوە نەقڵ کردوە، کە هەم باسی پێویستبوونی زانیاریی بە ئایین، هەم شارەزایی بە ژین دەکات، دەڵێ:

{ولا يتمكّن المفتي ولا الحاكم من الفتوى والحكم بالحق، إلا بنوعين من الفهم:

أحدهما: فهم الواقع والفقه فيه واستنباط علم حقيقة ما وقع بالقرائن والأمارات والعلامات، حتى يحيط به علماً.

والنوع الثاني: فهم الواجب في الواقع، وهو فهم حكم الله الذي حكم به في كتابه أو على لسان رسوله، في هذا الواقع ثم يطبق أحدهما على الآخر}[1].

واتە: موفتی و حاکم (ئەو کەسەی فەتوا دەدات و ئەو کەسەی دادوەریی دەکات) ناتوانێ فەتوا بدات و، ناتوانێ دادوەریی بکات، بەشێوەکی هەق و ڕاست، مەگەر دوو جۆرە تێگەیشتنی هەبن:

---

(١) إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج ١ ص ٩٤.

**یەکێیان:** بریتیە لەوە کە ئەو واقیعەی شتەکەی تێدا ڕوویداوە، پێی ئاشنا بێ و، بە وردیی لێی تێبگات و، ئەوەی کە ڕوویداوە، جوان هەڵیبهێنجێ، بە نیشانەکان و بەو شتانەی کە ئەوەیان پێ دەزانرێ، تاکو شارەزای بێ کە چ ڕوویداوە.

**جۆری دووەمیان:** بریتیە لەوە کە بزانێ: پێویستە لەو واقیعەداو دەربارەی ئەو ڕوویداوە، چ بڕیارێك بدرێ؟ ئەویش بریتیە لە تێگەیشتن لە بڕیاری خوا لە کتێبەکەیدا، یان لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کە لەبارەی ئەو ڕووداوەوە فەرموویەتی، دوایی یەکێك لەو دوو زانیارییە، بەسەر ئەوی دیکەدا دەچەسپێنێ، {مەبەستی ئەوەیە ئەو حوکمەی لە قورئاندا هاتوە، یان لە سوننەتدا، بەسەر واقیعەکەدا دەیچەسپێنێ}.

لێرەدا دەمەوێ بڵێم: پێشینی چاکی ئێمە ئاوا بوون، هەم لە ئایینـدا شارەزا بوون، هەم بە واقیعیش ئاشنا بوون، هۆی بە هەڵەدا چوونی زۆرێك لە زانایان لەم ڕۆژگاری ئێستاماندا، بە تایبەتی لە هەندێ وڵاتی ئیسلامیی، ئەوەیە کە بەڕاستیی شارەزایی واقیعەکە نین، بۆیە لە خستنە ڕووی فەتوایەکەدا بە هەڵەدا دەچن.

با وێنەیەك بهێنینەوە: (إبن عثیمین) زانایەکی باشە، خوا پلەی بەرز بکات و لێی خۆشبێ، زۆر خزمەتی کردوە، کتێبێکی هەیە بە ناوی (فتاوی العقیدة) قوتابییەکی سعوودیە لێی دەپرسێ دەڵێ: لە کتێبی قوتابخانە پرسیارمان بۆ دێتەوە، ئەگەر وەك کتێبەکە دەڵێ، وەڵام بدەینەوە، ئەوە بیستوومە کە جەنابت دەڵێی: ناڕاستەو گوناهبار دەبن و، ئەگەر وەك تۆش دەڵێی، وەڵام بدەینەوە، مامۆستا نمرەمان ناداتێ، ئەویش ئەوەیە کە بە پێی کتێبەکەی ئێمە زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوەو، تۆش دەڵێی: خۆر بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە، ئنجا جەنابت دەڵێی چی؟ ئەویش دەڵێ: ئەگەر سفریشیان بۆ دانابی، تۆ هەر مەڵێ: زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، چونکە خۆر بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨ ﴾ یس.

ئنجا ئیبنو عوسەیمین، ئەگەر هەندێك شارەزایی گەردووناسیی و فیزیای ئەم ڕۆژگارە بووایە، وای نەدەگوت، ئەگەر هەر بەئەندازەی ئەبو حامیدی غەززالیی شارەزایی گەردوون بووایە، کە نۆ سەد ساڵ پێش ئێستا ژیاوەو، لە کتێبی (تهافت الفلاسفة)دا دەڵێ: بە بەڵگەی هەندەسیی و فەلەکیی ئیسپات بووە کە خۆر سەدو حەفتا (١٧٠) جار زیاتر لە زەوی گەورەترە![1] مانای وایە لەو مەسەلەیەدا ئیبنو عوسەیمین نۆ سەد ساڵ زیاتر لە سەردەمی خۆی بەجێ ماوەو عەرەب گوتەنی: (یعیش في غیر زمانه!!) بۆیەش فتوایەکەی کە دەیدات، ناڕاست دەردەچێت، ئەوە شتێکی زۆر سەرەتایی و وەك ئەلیف و بێی زانستی گەردووناسیی وایە، کە خۆر ملیۆنێك و سێ سەد هەزار (١،٣٠٠،٠٠٠) جار لە زەوی گەورەترە، کەچی ئەو لەبەر ئەوەی شارەزای واقیعە زانستییەکە نەبووە، بۆیە بەو شێوەیە فەتوای داوە.

بۆیە بەڕاستی زۆر گرنگە کە ئێمە وێڕای شارەزایی بە ئایین، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، لە ژین و واقیعیشدا شارەزا بین، ئێستا لە سعوودیەو هەندێ وڵاتانی کەنداو خۆپیشاندان قەدەغەیەو، دەڵێن: بیدعەتە! من جارێك لەگەڵ یەکێك لە قوتابییەکانی شێخ ئەلبانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە ئوردوون، موناقەشەیەکم بوو، گوتم: پێم ناڵێن: خۆپیشاندان و، مانگرتن و، کۆبوونەوە، چ پەیوەندیی هەیە بە بیدعەت و سوننەتەوە، ئەوە هەڵسوکەوتی نێوان خۆمانە؟ تۆ ڕەخنە دەگری لەو دەستەڵاتەو دەڵێی: ئێمە هاتووین هوتاف دەکێشین و ڕەخنە دەگرین و گلەییمان لێت هەیە، ئەوە چ پەیوەندیی بەبیدعەت و سوننەتەوە هەیە؟! بە هەر حاڵ کە شارەزای واقیعەکە نەبووی، بێگومان بڕیاری هەڵەی لەبارەوە دەدەی.

کتێبێکم لەلایە لەبارەی (السیاسة الشرعیة)وە، پێم وایە لە جەزائیر نووسراوە، شێخ (ناصر الدین الألباني) و کۆمەڵێك زانای مەشرەب سەلەفیی قسەیان لە بارەیەوە کردووەو تێیدا زۆر تانە لە (فقه الواقع) دەدەن! لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوەی لە واقیعی خۆیدا شارەزا نەبووبێ، نەیتوانیوە مامەڵەی ڕاست لەگەڵ ئەو واقیعەدا بکات.

---

(١) تهافت الفلاسفة، ص ١٢.

(أبو حامد الغزالي) بەوە توانی ڕەخنە لە فەلسەفەی یۆنانیی بگرێ، هەڵسا کتێبێکی دانا بە ناوی (مقاصد الفلاسِفة)، کە ئەو خەڵکەی کەوتبوونە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانیی، گوتیان: (أبو حامد) بە جۆرێك فەلسەفەی بۆ شیکردووینەوە، بۆ خۆمان لە هەندێ لە مەسەلەکان، ئاوا حاڵی نەبوو بووین، سەرەتا کتێبی (مقاصد الفلاسفة) دەنووسێ و هیچ ڕەخنە لە فەلسەفەی یۆنانیی ناگرێ، تەنیا دەڵێ: ئەوە فەلسەفەی یۆنانییە، دوایی هەڵسا کتێبی (تهافت الفلاسفة)ی نووسی، واتە: پووچەڵیی فەیلەسووفەکان، ئیدی وەك گوتراوە: لە دوای ئەو کتێبەی (أبو حامد الغزالي) جارێکی دیکە فەلسەفە لە جیهانی ئیسلامدا، لەسەر پێی خۆی نەوەستایەوە، چونکە لە ڕووی زانیاریی و شارەزاییەوە ڕەخنەی لێگرت.

هەروەها (إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کتێبێکی هەیە بە ناوی: (منهاج السنة النبوية في الرد على الرافضة والشيعة القدرية) چاك چاك چۆتە بنج و بنەوانیەوە، یان کتێبی: (الجواب الصحيح لمن بدّل دين المسيح) باش باش تاوتوێی نەصرانییەتی کردوە.

هەروەها {شێخ ئەحمەد دیدات} و {د. زاکیر نایك} لەم سەردەمەی خۆماندا، کە ڕەخنە لە نەصرانییەکان دەگرن، زۆر شارەزای واقیعن، بۆیە دەبێ تۆ زۆر چاك شارەزای ئەو باتیڵە بی، تا بتوانی باش ڕەخنەی لێ بگری و هەقی لە شوێن دابنێی، چونکە ئەگەر تۆ شارەزای واقیعەکە نەبی، ئنجا واقیعی گەردوونیی بێ، فیزیایی بێ، مێژوویی بێ، فیکریی بێ، ...هتد، بە دڵنیایی ناتوانی مامەڵەیەکی دروستی لەگەڵدا بکەی، زانایانی پێشینی ئێمە، وا بوون و بە واتای وشە: هەم لە ئاییندا شارەزا بوون، هەم بە واقیعیش ئاشنا بوون.

بنەمای
چواردەیەم

## جەنگ و فیداکاریی لە پێناوی خوادا بۆ پاراستنی: خەڵك و، خاك و، دین و، ژین

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە بنەما گشتییەکانی زۆربەی مسوڵمانان، با سەرەتا تەماشای چەند ئایەتێك و چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٣٩)دا دەفەرموێ: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾.

واتە: مۆڵەت درا (بۆ جەنگ و بەرگریی کردن) بە ئەوانەی کە جەنگیان لەدژ دا دەکرێ و ستەمیان لێکراوە، خوا لەسەر سەرخستنیان بە توانایە.

٢- لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٠)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾.

واتە: لە پێناوی خوادا لە دژی ئەو کەسانە بجەنگن، کە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، چونکە بێگومان خوا دەستدرێژیی کارانی خۆشناوێن.

٣- لە سوورِەتی (النساء) ئایەتی (٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾.

(ئەوەی جێی مەبەستە) خوا دەفەرموێ: ئەوە چیتانە! لە پێناوی خواو لە پێناوی چەوسێنراواندا ناجەنگن؟!....

٤- لە سوورِەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٣)دا دەفەرموێ:.﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ﴾.

واتە: لە دژیان بجەنگن تاکو فیتنە نامێنێ {یانی: هەتا کافران توانایان نامێنێ، ڕێ لە مسوڵمانان بگرن، دینداریی خۆیان بکەن، یاخود ڕێ لە خەڵك بگرن کە مسوڵمان ببن} و هەتا ملکەچیی هەمووی بۆ خوا دەبێ، ئنجا کە وازیان هێنا نابێ لە دژی جگە لە ستەمکاران، بەکار هێنانی هێزو بەرەنگاریی هەبێ.

دین لێرەدا بە مانای ملکەچیی دێ، نەك بە مانای ئیسلام، چونکە زۆر لە خاوەن تەفسیرەکان و بانگخوازو مامۆستایان وا دەزانن: وشەی (دین) هەر کاتێك هات، هەر بە مانای ئیسلام دێ! بەڵام وانیە چونکە ئەگەر ئێمە بجەنگین یان نەجەنگین، ئیسلام هەر بەشی غەیری خوای پێوە نیەو هەر هی خوایە.

ئنجا لە سوورِەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾.

یانی: لە دژیان بجەنگن تاکو ئازاردان نامێنێ و ملکەچیی هەمووی تەنیا بۆ خوا دەبێ {خەڵك جگە لە خوا دەستەڵاتی کەسیان بەسەرەوە نابێ} ئنجا ئەو کاتە مادام کەس جەبرو قەهری لێنەکردن، ئەگەر مسوڵمان بوون باشە، ئەگەر مسوڵمانیش نەبوون، ئازادن.

٥- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسولهِ»، قيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، قَيلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ «حَجٌّ مَبْرُورٌ»} أخرجه البخاري برقم: (١٤٤٧)، ومسلم برقم: (٢٥٨).

واتە: ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم): کام لە کردەوەکان (پاداشتی) باشترە؟ فەرمووی: بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی (کەواتە: ئیمانیش کردەوەیە، بەڵام کردەوەی عەقڵ و دڵ و، پاشان زمان و ئەندامەکانە) گوترا: دوای ئەوە چ کردەوەیەك باشترە؟، فەرمووی: تێکۆشان لە ڕێی خوادا، گوترا: دوای ئەوە؟ فەرمووی: حەجێکی قبووڵ کراو، واتە: حەجێك کە بە شێوەیەك بکرێ قبووڵ بکرێ.

٦- {عَنْ ابنِ مَسْعُودٍ قَالَ سألْتُ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): أيُّ العَمَلِ أفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا)، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قَالَ: (بِرُّ الوَالِدَيْنِ)، قَال: قُلْتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قَالَ: (الجِهَادُ في سَبيلِ اللهِ)} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٢٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٨).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرد: چ کردەوەیەك لە هەموو کردەوەکان باشترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ باب ودایك، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: تێکۆشان، {یاخود جەنگ کردن} لە پێناوی خوادا.

ڕیز بەندییەکی چەند جوانە! نوێژ لەکاتی خۆیدا، هەقی خوایە، چاکە لەگەڵ دایك و باب، هەقی نزیکترین کەسە کە دایك و بابن، تێکۆشان لە پێناوی خوادا، هەقی ئۆممەتە، ئەم سێ کردەوەیە، لە هەموو کردەوەکان چاکترن.

٧- {عَنْ مُعَاوِيَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: لاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللهِ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلاَ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللهِ، وَهُمْ عَلَى ذلِكَ} أخرجه أحمد برقم: (١٦٩٧٤)، والبخاري برقم: (٣٤٤٢)، ومسلم برقم: (١٠٣٧).

واتە: موعاویە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئۆممەتی من لە سەر هەق بە سەرکەوتوویی دەمێننەوە، بە دەستەڵاتەوە، ئەوەی کە پشتیان بەر دەدات و ئەوەش کە دژایەتییان دەکات، زیانیان پێ ناگەیەنێ، تاکو فەرمانی خوا دێ، ئەوان لەسەر ئەو حاڵەن.

ئیبنو تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: {ثم هم مع هذه الأصول، يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر، على ما تُوجِبُهُ الشريعة، ويرون إقامة الحج والجهاد والجُمَع والأعياد مع الأمراء، أبراراً كانوا أو فُجّاراً}[1]، واتە: زۆربەی مسوڵمانان {کە بە ئەهلی سوننەت ناسراون} لەگەڵ ئەو بنچینانەشدا (کە پێشتر باسی کردوون) فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە خراپەش دەگرن، بە پێی ئەوە کە شەریعەت پێویستی کردوە، پێیان وایە دەبێ حەج ئەنجام بدرێ و، جیهادیش ئەنجام بدرێ و، جومعەکان بکرێن، جەژنەکان وەك دروشمی ئیسلامەتیی جێبەجێ بکرێن، لەگەڵ حوکمڕاناندا، چاکەکاربن، یان خراپەکاربن.

واتە: لە پشتیانەوە نوێژ بکرێ، لەگەڵیاندا جەنگ و جیهاد بکرێ، دژی دوژمنان، با هەڵەو کەم و کوڕییشیان هەبێ.

براو خوشکە بەڕێزەکان!

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئێستا لەم ڕۆژگارەدا، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەو ڕێکخراوە پەڕگیرو تێپەڕێنەرانە پەیدابوون، خەڵکێك ڕەنگە هەر پێی عەیب بێ باسی جەنگ و جیهاد بکات، یان دوای دەوڵەتەکەی داعش ئەو دەوڵەتە وەهمییە، ڕەنگە خەڵکانێك پێیان عەیب بێ باسی دەوڵەتی ئیسلامیی بکەن! بەڵام ئێمە دەبێ وریابین و نەکەوینە ژێر کاریگەرییە نەرێنیی و خراپەکانی ئەو واقیعەی کە تێیدا دەژین، جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا، ئەوە کە ئامادە بی سەری خۆت دابنێی، ماڵی خۆت خەرج بکەی، فیداکاریی بکەی بە سامان و بە گیان، یەکێکە لە بنەڕەتەکانی ئیسلام، کە زۆربەی مسوڵمانان لەسەریان ڕۆیشتوون، چونکە ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه

---

(١) العقيدة الواسطية، بشرح ابن عثيمين، ص ٦٥١-٦٥٧.

وسلم) دەیگەیەنن و، هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان وا بوون و، مسوڵمانانی ڕەسەن و ڕاستەقینەش وا بوون.

ئنجا کەسی وا هەیە، وا دەزانێ کە فیداکاریی لە پێناوی خوادا، ئەوەیە کە تۆ هەموو دەمێ، دەبێ چەکت بە شانەوە بێ! کە ئەوەش ڕاست نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆ هەموو دەمێ ئامادەبی، وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، تەماشا بکەن! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەند ورد بووە لە فەرمایشتەکانی دا، دەفەرموێ: {مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِغَزْوٍ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنَ النِّفَاقِ} أخرجه أحمد برقم: (٨٨٥٢)، ومسلم برقم: (١٩١٠)، وأبو داود برقم: (٢٥٠٢).

واتە: هەر کەسێك بمرێ و جەنگ نەکات لە پێناوی خواداو، نیازیشی نەبێ جەنگ بکات، {چونکە جاری وایە جەنگت نایەتە پێش، بەڵام دەبێ دڵت لەسەر ئەوە دامەزراو بێ، کە ئەگەر جەنگت هاتە پێش، ئیسلام پێویستی بە ماڵ و خوێنی تۆ بوو، بۆی ببەخشی، هەر کەس وانەبێ، کە بە کردەوە جەنگ بکات لەکاتی خۆیدا، یان بەتەما بێ بیکا هەر کاتێ هاتە پێش} ئەوە لەسەر بەشێك لە نیفاق مردوە.

ئەمە بابەتێکی گرنگە، پێویستە بیزانین و، بە هۆی ئەوەوە کە داعش یان گرووپێکی دیکە هەڵەو پەڵە دەکات، یان لایەنێکی نەیارو ناحەز هێرش دەکاتە سەر جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا، با باسکردنی ڕاستییەکانی ئیسلاممان پێ شەرم نەبێ و، لەژێر لێوەوە نەیڵێین! خەڵك دەناسم لە کاتێکدا کە پێش نوێژییش دەکات، خۆی لەو ئایەتانە دەپارێزێ کە باسی جەنگ و جیهاد دەکەن! وا لە دەروونی خۆیدا تێکشاوە، لە بەرانبەر ئەوانەدا کە هێرش دەکەنە سەر جەنگ و جیهادی ئیسلامیی و، بەکارهێنانی هێز لەلایەن مسوڵمانانەوە، نەك هەر لە لای خۆشیەوە ئایەتەکان ناخوێنێتەوە! بەڵکو -خوا پەنامان بدات - ڕەنگە هی وا هەبێ لە دڵی خۆیدا بڵێ: خۆزگە خوا ئەو ئایەتانەی نەناردبانە خوارێ! ئێستا ئێمە تووشی ئەو ئیحراجییە نەدەبووین! خوا بمان پارێزێ لەو جۆرە حاڵەت و هەڵوێستانە کە هەموویان هەن و لەخۆمەوە ئەو قسانە ناکەم.

بنەمای
پـازدەیەم

# بەرپا کردنی ئایین و ئەنجامدانی دروشمەکانی پێکەوەو بە هەرەوەزیی

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لە بنەمایەکانی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، کە ئایینیان بەرپا کردوەو، دروشمەکانیشیان پێکەوە بە هەرەوەزیی ئەنجامداون، ئایینی ئیسلام ئایینی خوا بەیەکگرتن (توحید) و ئایینی یەکبوون (وحدة)ە، ئێمە لەسوورەتی (الفاتحة)دا دەڵێین: {إِيّاكَ نَعْبد وَإِيّاكَ نَسْتَعِين} هەمووومان پێکەوە بەس تۆ دەپەرستین و، داوای یارمەتییش بەوە لەتۆ دەکەین، یانی: هەر ئەو وشەیە {إِيّاكَ نَعْبد} هەم تەوحیدی تێدایە، هەم وەحدەتی تێدایە، نەیفەرمووە: {إِيّاك أَعْبدُ}، بەڵکو {إِيّاكَ نَعْبد} وێکڕا بەس تۆ دەپەرستین و پشتیش بەس بەتۆ دەبەستین (ئەی خوایە!).

١- لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (١٣)دا خوا دەفەرموێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۝١٣﴾.

واتە: ئایین بەرپا بکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن.

واتە: هەمووتان دەستبار بۆ یەکدی بگرن و، ئایین بەرپا بکەن، چونکە ئەو ئایینە پان و پۆڕە، ئەو ئایینە گەورەو گرانە، بە هەمووان نەبێ و بەهەرەوەزیی نەبێ، بەرپا ناکرێ.

٢- لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٤١)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾.

(خوا مەدحی کەسانێکمان بۆ دەکات دەفەرموێ): ئەوانەی کە دەستەڵاتمان پێدان لەزەویداو پێمان چەسپاندن: نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمان بە پەسند دەکەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن و، سەرەنجامی کارەکانیش تەنیا بۆ لای خوایە.

٣- لەسوورەتی (البینة) ئایەتی (٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: فەرمانیان پێنەکرابوو، مەگەر بەوە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن بەساغیی و پاکیی و، نوێژ بەرپا بکەن و، زەکات بدەن، ئا ئەوەش بەرنامەو ئایینی ڕاستە.

واتە: وێکڕاو بەدەستە جەمعیی نوێژ بکەن و، زەکات بدەن و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

٤- لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٣٢)دا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: ئەوەی ڕابرد، بەو شێوەیەو، هەر کەسێ دروشمەکانی خوا بەمەزن بگرێ، ئەوە پەیوەندیی بەو تەقوایەوە هەیە، کە لە دڵ و دەروونەکاندا هەیە.

(إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە دەڵێ:

{ويرون إقامة الحج والجهاد والجمع والأعياد مع الأمراء، أبراراً كانوا أو فجاراً، ويحافظون على الجماعات}[١].

واتە: زۆربەی مسوڵمانان ڕایان وا بووە کە دەبێ حەج بەرپا بکرێ و، جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا بکرێ، نوێژی هەینی بکرێ و، نوێژە جەژنەکان بکرێن، لەگەڵ حوکمڕانان، چاکەکار بن، یان خراپەکار بن و، پارێزگارییان کردوە لەنوێژی بەکۆمەڵ.

ڕەنگە هەندێ بڵێن: ئەوانە شتی ئاشکران، بۆچی زانایان باسی ئەوانەیان کردوە؟ دەڵێین: شیعە بەدرێژایی مێژووی خۆیان نوێژی جومعەیان نەکردوە، مەگەر چۆن ئەگەرنا بەشداریی نوێژی جومعەیان نەکردوە، هەروەها بەشداریی نوێژی جەژنیان نەکردوەو، بۆیان کرابێ بەشداریی جەنگ و جیهادیان نەکردوە، گوتوویانە: دەبێ (مهدي) بێ، ئەو مەهدییەی کە هەر بوونی نیەو ئەفسانەیە، چونکە حەسەنی عەسکەریی نەزۆك بووە، نە کوڕی بووەو نە کچی بووە! ئنجا شیعە گوتوویانە: هەتا ئەو نەیەت دروست نیە، نە دەبێ دەوڵەت دابمەزرێ، نەنوێژی جومعە بکرێ، نە نوێژی جەژن بکرێ، ئەو کارە بە کۆمەڵییانە هیچیان نابێ بکرێن!

بەڵام کاتێك خومەینی هات و ویلایەتی فەقیهی تەبەننیی کردو دەستکاریی ویلایەتی فەقیهی کرد، کە لە ئەصڵدا بۆ ئەوە بوو: ئەگەر کەسێك مردو هیچ میراتگرێکی نەبوو،ماڵەکەی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟ هەروەها منداڵانی بێ باب و بێ سەرپەرشت، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ؟ (ولاية الفقيه) واتە: ئەو کەسەی کە شارەزایە دەبێ سەرپەرشتیی ئەو شتانە بکات، بەڵام ئەو هەڵسا چوارچێوەی ویلایەتی فەقیهی فراوان کرد، مەسەلەی حوکم و سیاسەت و دەوڵەتیشی تێخست، وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین.

---

(١) العقيدة الواسطية، بشرح ابن عثيمين، ص ٦٥٧-٦٦١.

بنەمای
شازدەیەم

# کرانەوەی هۆشیارانە، بەڕووی بیرۆکە و ئەزموونە جۆراو جۆرەکانی بەشەرەوە

ئەگەر سەرنجی ڕێبازی زۆربەی مسوڵمانان بدەین، دەبینین ئەوەش یەکێك بووە لە بنەمایەکانیان و، بەڕووی ئەزموونی بەشەرو فیکری بەشەرو زانیاریی و شارەزایی بەشەردا، ئنجا ئەو بەشەرانە کافر بووبن، یان مسوڵمان، هەر کەسێك بووبن، بەڕوویاندا کراوە بوون و، شتی باشیان لە هەموو کەسێك وەرگرتوە، شتێك کە شەریعەت فەرمانی پێ کردوە، یان ڕێی لێ نەگرتوە.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم دوو ئایەتە بدەین:

١- خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الزمر) ئایەتەکانی (١٧و١٨)دا دەفەرموێ:
﴿ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨ ﴾.

واتە: ئنجا موژدە بدە بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، دوایی شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە خوا ڕێنمایی کردوون {یان خوا خستووینە سەر ڕێی ڕاست} ئا ئەوانە خاوەن عەقڵانن.

٢- خوای کاربەجێ لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٦٤)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بڵێ: ئەی خاوەن کتێبەکان! وەرن بۆ وشەیەك کە یەکسانە لە بەینماندا {واتە: خاڵی هاوبەشە}، کە جگە لە خوا نەپەرستین و، هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی و، هەندێکمان لە جیاتی خوا هەندێکمان نەکەین بە پەروەردگارو سەرپەرشتیار، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بڵێن: ئێوە شاهێد بن کە ئێمە بۆ خوا ملکەچین.

براو خوشکە بەڕێزەکان!

ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دایمەزراندو خەلیفە ڕاشیدەکانی فراوانیان کرد، لە سەردەمی (پێشینی چاك)دا بوو، ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە توانی هەرچی شارستانییەت و فەلسەفەو فیکرو ئەزموونی ڕۆم و فارس و هیندو چین و میصرە، هەمووی لە بۆتەیەکدا لەقاڵب بدات و، ئەوەی کە سوودی هەیە، لێی بەهرەمەند بێ، ئەوەشی کە سوودی نیە، فڕێی بدا، مسوڵمانان ئەگەر لە حاڵەتی هێزدا بن، هیچ کات هەستیارییان نابێ بەرانبەر بە فیکرو ئەزموونی خەڵکی دیکە، بەڵام کاتێ لە حاڵەتی بێ هێزییدا دەبن، دەچنەوە نێو کەوڵی خۆیان و پێیان وایە هەر خۆیان بجووڵێنن: کافر دەبن! کە بەهۆی بێ هێزییەوە، ئەو حاڵەتەیان بەسەر دێ.

مسوڵمانان کاتێ دەسەڵات و هێزیان هەبووە، بەجۆرێکی دیکە بوون، لەسەردەمی (مەئموون)دا (دار الحكمة) دروست کرا لە بەغداو، هەرچی کتێبەکانی هیندو چین و فەلسەفەکانی یۆنان بوون، وەریانگێڕان و هیچ گرفتیان نەبوو، هەروەها لەپێش ئەوەشدا لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا، لە ئەزموونی دەوڵەتداریی ڕۆم و فارس، سوودی زۆریان وەرگرت، وەك پێشتر باسمان کرد، هەستیان بە هیچ سەغڵەتییەك نەدەکرد.

ئنجا بۆ زانیارییتان! لەسەردەمی پێشینی چاکدا، واتە: لە سێ سەدەی یەکەمدا، هەموو تەوژمە سیاسیی و فیکرییەکان و سەرجەم زانستە ئیسلامییەکان لەسەردەمی ئەواندا چەکەرەیان داو، گەورە بوون: هەر هەشت مەزهەبەکان، زانیاریی تەفسیرو زانستەکانی قورئان و، زانستەکانی فەرموودە، مێژوو، سیرە، زانستەکانی زمان، هەموویان لەو سێ سەدەیەدا سەریان هەڵداو پاشان گەشەیان کرد، هەروەها هەر لەو سێ سەدەیەدا، دەوڵەتی ئیسلامیی گەشەی بەخۆوە بینی، لە ئەنجامی هەڵهێنجانی جۆراو جۆر، لە قورئان و سوننەت و، داهێنانی نوێ لە دنیادارییدا، بەڵام لەدوای ئەوەوە، دەرگای ئیجتیهاد قفڵ دراو مسوڵمانان کەوتنە دواوە، کەواتە: کرانەوەی هۆشیارانە بەڕووی ئەزموونە جۆراو جۆرەکانی بەشەرەوە، یەکێکە لە بنەمایەکانی جەماوەری مسوڵمانان.

زۆر جار گوتوومە: مسوڵمان نابێ سەبەتە بێ، هەرچی تێی بکرێ، وەری بگرێ، بەڵکو دەبێ بێژینگ بێ، ئەوەی بەکەڵك بێ، بیهێڵێتەوە، ئنجا ئەوانەی پێیان وایە کارلێك (تفاعل)ی ئەرێنیی مسوڵمانان، لەگەڵ کلتوورو فەرهەنگی جۆراو جۆری گەلاندا، هەڵە بووە (هەندێك ئاوا دەڵێن)، بۆ وێنە: هەندێك دێن ڕاستەوخۆ ڕەخنە دەگرن لە عیلمی کەلام، بەتایبەتی لە موعتەزیلە (دوایی لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین)، ڕەخنەیان لێ دەگرن لەسەر ئەوەی عەقڵیان زۆر بەکار هێناوەو، زۆر سوودیان بینیوە لە کلتوورو فەرهەنگی ڕۆم و فارس و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، پێیان وایە: ئەوە هەڵە بووە[1]!! بەڵام کاتێ ئەو کارلێکە ئیجابییە کراوە، توانیویەتی پێشکەوتووبێ و، قەناعەت بە خەڵك بێنێ و، خەڵك بێنێتە نێو ئیسلامەوە، خەڵك بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، کەواتە: ئەو بیر کردنەوەیەی کە پێی وایە: مسوڵمانان دەبێ داخراو بن، سەر قاپ لەسەر خۆیان دابخەن، کارلێك لەگەڵ دەورو بەریاندا نەکەن، ئەوە بۆ بیابان و کوێرە دێیەك

---

(١) ئاشکرایە عەقڵی خۆ بەکار هێنان و بەهرە وەرگرتن لە فیکرو فەرهەنگ و کلتووری گەلان، پێویستەو هیچ عەیبی نیە، بەڵام زێدە ڕۆیی کردن لە پشت پێ بەستنی عەقڵدا لەسەر حیسابی نەقڵ (وحي)، هەڵەیەو، ئەوەیە کە ڕەخنەی پێ لە موعتەزیلە دەگیرێ، وەك لە تەوەری سێیەمدا باسی دەکەین.

باشەو دەگونجێ، کەسێك کەڵکەڵەی ئەوەی لە مێشکدا نەبێ، دین بکاتەوە کالآی بالآی ژین، ئەوە دەبێ بۆخۆی لە شوێنی خۆی دابنیشێ و، سەری خۆی کزبکا، بەڵام کەسێ بیەوێ دین بێنێتەوە نێو واقیع، هیچ چاری نیە دەبێ کارلێك بکات لەگەڵ واقیعەکەی دەورو بەریدا، بەڵام هۆشیارانەو بێدارانەو، لە چوار چێوەی شەریعەتدا، بەتەئکید شەریعەت هیچ کاتێك لەگەڵ شتێکدا دژ نیە کە: لەسوودو بەرژەوەندیی خەڵکی بێ و، هەرگیزیش لەگەڵ شتی خراپ و زیانبەخش نیە.

ئنجا بەرهەم و شوێنەواری ئەو داخراوییەی کە باسمان کرد، دیارەو دەیبینین: چۆن مسوڵمانانی خستۆتە پەراوێزی ژیانەوە، ئێستا مسوڵمانان لە هەموو شتێکدا پێویستییان بە نامسوڵمانانە، لەبەر چی؟! لەبەر ئەوەی کارلێکی ئیجابییان بە ڕووحی ئیسلامییەوە لەگەڵ دەورو بەریاندا نەکردوە، بۆیە من وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان پێتان دەڵێم کە: هەرگیز مەسڵەمنەوە لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکداو، کارلێکی ئیجابیی لەگەڵ هەر فیکرەو بۆچوون و سیاسەتێکدا، بەڵام بۆخۆت پێشتر چەکداربە بە تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست دەربارەی ئیسلام و شەریعەت، ئنجا بێ منەت بە لەگەڵ هەر فیکرەو بۆچوونێکدا ڕووبەڕوو دەبیەوەو {تەماشا بکە! چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی؟} بابەتییانە تەماشا بکە، نەك خودییانە.

# بنەمای حەڤدەیەم

## لێبوردەیی و سینگ فراوانیی، لە بواری تێڕوانین و مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵ و تەوژمە لادەرەکانی نێو ئۆممەت دا

سێ دەق دێنمەوە لەوبارەوە، دوایی هەندێ قسە لە زانایانەوە دەخوازمەوە:

١- خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: بێگومان ئەوانەی کە ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کردووەو بوونە کۆمەڵ کۆمەڵ و تاقم تاقم، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە (ئەی موحەممەد! (صلى الله عليه وسلم)) کاری وان بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، دوایی هەواڵیان پێدەدا بەوەی کە دەیانکرد (واتە: بەو لادان و پەرتەوازە بوون و تاقم تاقم بوونە).

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ، فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ} أخرجه أحمد برقم: (٨٥٨٠)، ومسلم برقم: (٧).

واتە: لە دوا دوای ئۆممەتمدا کەسانێك دەبن، شتێکتان بۆ باس دەکەن {دەربارەی ئیسلام} کە نە خۆتان نەباب و باپیرانتان نەتان بیستوە، خۆتانیان لێ دوور بگرن.

٣- فەرموودەیەکی دیکەش لەوبارەوە هەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَا هُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ} أخرجه أحمد برقم: (٧٧١٣)، ومسلم برقم: (٢٥٦٤).

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە[١]، نە ستەمی لێ دەکات، نە پشتی تێ دەکات، نە بەکەم تەماشای دەکات، تەقواش لێرەدایە، ئاماژەی کرد بۆ سینەی موبارەکی، سێ جاران وای فەرموو (واتە: ڕیشەی تەقوا لە سینەو دیوی پەنهان و نەبینراوی مرۆڤ دایە، بەڵام شوێنەوارەکانی تەقوا لەسەر جەستەی دەردەکەون)، مرۆڤ ئەوەندە خراپەی بەسە کە برای مسوڵمانی بە کەم تەماشا بکات، هەموو شتێکی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان قەدەغەیە: خوێنی، ماڵ و سامانی، کەرامەتی (کەرامەت تەنیا مەبەست پێی ناموس نیە، واتە: سومعەی، ناوی، شۆرەتی).

(إبن تيمية)[٢] ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەڵێ: (أن المتأول الذي قَصْدُهُ متابعة الرسول (صلى الله عليه وسلم) لا يكفر، بل ولا يفسق، إذا اجتهد فأخطأ، وهذا مشهور عند الناس في المسائل العملية، وأما مسائل العقائد، فكثير من الناس كفَّر المخطئين فيها، وهذا القول لا يُعْرَفُ عن أحد من الصحابة، والتابعين لهم بإحسان، ولا عن أحد من أئمة

---

(١) ئەدی بە نسبەت خوشکان! بێگومان کۆڕەکە کوڕی پیاوان بووە، هەمیشە ئەوە بزانن، ئەگەرنا (المسلمة أخت المسلمة، والمسلم أخ المسلمة).

(٢) هەڵبەتە وەك سەرنج دەدەن من زۆرجار لە ئیبنو تەیمییە دەخوازمەوە، لەبەر ئەوەی زانایەکی زۆر موعتەبەر بووە، زۆر متمانە پێکراوە، ئەو بابەتانەش کە باسیان دەکەم ئەو قسەی زۆری لە بارەیانەوە هەیە، ئەگەرنا زانایانی دیکەش لەوبارەوە قسەیان کردوە.

المسلمين، وإنما هو في الأصل من أقوال أهل البدع الذين يبتدعون بدعة وَيُكَفِّرون مَنْ خالَفهم، .... ولا يلزم إذا كان القول كفراً، أن يَكْفُرَ كلُّ مَن قالَه مع الجهل والتأويل، فإن ثبوت الكفر في حق الشخص المعيَّن، كثبوت الوعيد في الآخرة في حقه، وذلك له شروط وموانع، كما بسطناه في موضعه، وإذا لم يكونوا في نفس الأمر كفاراً، لم يكونوا منافقين، فيكونون من المؤمنين، فَيُسْتَغْفَرُ لهم وَيُتَرَحّمُ عليهم، وإذا قال المؤمن:

﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ ﴿١٠﴾ ﴾ الحشر.

يقصد كل من سبقه من قرون الأمة بالإيمان، وإن كان قد أخطأ في تأويل تَأَوّلَهُ، فخالف السنة، أو أذنب ذنباً، فإنه من إخوانه الذين سبقوه بالإيمان، فيدخل في العموم، وإن كان من الثنتين والسبعين فرقة، فإنه ما من فرقة إلاّ وفيها خلق كثير ليسوا كفاراً، بل مؤمنين، فيهم ضلال وذنب يستحقون به الوعيد كما يستحقه عصاة المؤمنين، والنبي (صلى الله عليه وسلم) لم يخرجهم من الإسلام، بل جعلهم من أمته ولم يقل: إنهم يُخَلَّدون في النار، فهذا أصل عظيم ينبغي مراعاته فإن كثيراً من المنتسبين إلى السنة، فيهم بدعة من جنس بِدَع الرافضة والخوارج، وأصحاب الرسول (صلى الله عليه وسلم) علي بن أبي طالب وغيره، لم يكفِّروا الخوارِجَ الذين قاتلوهم)[١].

ئەمە بە ڕاستی قسەیەکی زۆر بە ڕێ و جێ و بە ئینصافانەو زانایانەیە، دەڵێ: ئەو کەسەی کە تەئویل دەکات {واتە: لەدەقێك تێدەگا بەشێوەیەك کە: لەمانا ڕواڵەتییەکەی خۆی لایدەدا بۆ مانایەکی دیکە، لەبەر هۆیەك کە خۆی قەناعەتی پێی هەیە}، ئەو کەسە کە تەئویل دەکات و بە هەڵەش دادەچێ، مادام مەبەستی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا بێ (صلى الله عليه وسلم) با ئەو تەئویلە پەیوەندیی بە عەقیدەشەوە هەبێ، پێی کافر نابێ[٢]، بەڵکو پێی

---

(١) منهاج السنة النبوية، ج٥، ص (٢٣٩-٢٤٠).

(٢) بەڵام (صالح الفوزان) لە کتێبی: (الإرشاد إلى صحيح الإعتقاد وأثره على أهل الشرك و الإلحاد) ص١٤٠ دا دەڵێ: ئەشاعیرەو ماتۆریدییە، لەبازنەی ئیسلام دەرچوون! ئنجا ئەوانە خۆشیان بە شوێنکەوتووی ئیبنو تەیمییەو، ئیبنو لقەییم دەزانن، بۆیە کە دەگەڕێمەوە بۆ کتێبەکانی ئیبن و تەیمیەو ئیبنولقەییم، زۆر جیان لە هی ئەو جۆرە کەسانەی لافی شوێن کەوتنی وان لێدەدەن! هەروەك کە دەگەڕێیەوە بۆ کتێبەکانی ئیبنو حەنبەل، زۆر جیان لە هی

فاسیقیش نابێ، مادام ئیجتیهاد بکات و نەیپێکێ، ئەمەش لە نێو خەڵکدا دەربارەی مەسەلە کردەییەکان {واتە: بابەتە فیقهییەکان} شتێکی بە ئاشکرا زانراوە، بەڵام لە مەسەلە عەقیدەییەکاندا، زۆر لەخەڵکی ئەوانەی کە بەهەڵەدا دەچن، بەکافریان دادەنێن! کە ئەوەش قسەیەکە لە هیچ کام لە هاوەڵانەوەو، لەوانەش کە بە چاکیی شوێنیان کەوتوون، نەزانراوەو نەبیستراوە {پێشتر باسمان کرد کە ئیبن و عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی شەوڕۆییدا خوای بینیوە، عائیشەش دەڵێ: مووەکانم وەستان، چۆن شتی وا دەبێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوای نەبینیوە، موعاویە دەیگوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجەستەوە سەفەری شەوڕۆیی نەکردوە، ئەوانی دیکە هەموو دەڵێن: نەخێر بە جەستەوە بووە، هەروەها زۆر مەسەلەی دیکەش، کەسیش بەوی دیکەی نەگوتوە: تۆ کافری، بەڵکو کەس بەوی دیکەی نەگوتوە فاسقیشی، گوتوویەتی: وای تێگەیشتووی، من بەجۆرێکی دیکەی تێگەیشتووم، مادام مەجالی تێدا هەیە}، هەروەها ئەمە لەهیچ کام لەپێشەوایانی مسوڵمانان نەزانراوە، کە هەر کەسێك لە مەسەلەیەکی عەقیدەییدا تەئویلێکی هەڵە بکات، بڵێی: کافرە، یان فاسقە، بەڵکو ئا ئەو هەڵسوکەوتە، هەڵسوکەوت و قسەی ئەهلی بیدعەتە، ئەوانەی بیدعەتێکیان داهێناوە، دوایی هەر کەسێك بە دوای ئەو بیدعەتەی وان نەکەوتبێ، بە کافریان داناوە، {واتە: ئەوە هەڵوێستی ئەهلی بیدعەتە}، ئنجا قسەیەك کە بە کوفر لە قەڵەم دەدرێ، کەسێك بە نەزانیی و بەتەئویل ئەو قسەیە بکات، بەکافر لەقەڵەم بدرێ، ئەوە موصیبەتێکی گەورەیە، چونکە چەسپانی کوفر بەسەر کەسێکدا وەك چەسپاندنی هەڕەشەی دوارۆژە بەسەریدا {کە تۆ گوتت: کافرە، مانای وایە حەتمەن لە دۆزەخ دایەو ئەو حوکمەش زۆر قورسە}، حوکمی واش چەند مەرجی هەن دەبێ بێنە دی و، چەندان پەرچی هەن، دەبێ پەرچەکان لابچن، (وەك پێشتر باسمان کرد)، ئنجا ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە کە بە هۆی تەئویلێکەوەو بە هەڵەدا چوونێکەوە شتێك

---

(إبن عبدالوهاب)، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەسی بەکافر دانەناو، لەسەر ئەوەی کە بڵێ: قورئان مەخلووقە، کەچی موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب هەموو دەوڵەتی عوسمانی کافر کردوە بەو یان و پۆڕیەوەو خوێنیشی حەڵاڵ کردوون!!!

دەڵێن: کە کوفرە، یان شیرکە، یا لە بواری عەقیدەشدا بێ، ئەگەر کافر نەبن و مونافیقیش نین، کەواتە: بڕوادارن، بۆیە داوای لێبوردنیشیان بۆ دەکرێ لە لای خواو، کاتێك بڕوادار دەڵێ:

﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾ الحشر.

{واتە: پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایەنەمان ببوورە کە بڕوایان هێناوە}، لەو حاڵەدا هەموو ئەوانەی دەبێ مەبەست بێ، کە لە پێش ئەودا لەسەدەکانی پێشوودا لە ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیمانیان هێناوە {بەڵکو من دەڵێم: دەبێ هی پێش پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) بگرێتەوە، هەر چی ئەهلی ئیمان بێ} با بەهەڵەش دا چووبێ لە تەئویلی شتێکدا کە تەئویلی کردوەو پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ، یان گوناهێکی کردبێ.

{مەبەستی موعتزیلەو خەواریج و ئەشعەرییەکان و قەدەرییەو شیعەو ئەوانەیە، مادام ئەهلی قیبلەن، با لە شتێك و چەند شتێکیشدا بەهەڵە چووبن، کەس بۆی نیە بە کافریان دابنێ} چونکە ئەویش هەر لەو برایانەیەتی کە لەپێش ئەودا ئیمانیان هێناوە، بۆیە دەچێتە نێو ئەو بازنەیەوە، بەڵکو با لەو حەفتاو دوو تاقمەش بێ کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی کردوون، چونکە هیچ کام لەم حەفتاو دووە نیە، کە مسوڵمانان و بڕوادارانێکی زۆریان لە نێودا نەبن، کە کافر نین، بەڵکو بڕوادارن، بەڵێ گوناهیان هەیە، گومڕاییان هەیەو، بەهۆی ئەو گوناح و گومڕاییەوە، شایستەی هەڕەشەی دواڕۆژن، هەروەك چۆن ئەوانەش کە بڕواداری باش بن {واتە: ئەهلی بیدعەتیش نەبن و لەو حەفتاو دووەش نەبن}، ئەگەر گوناهبار بن، هەر شایستەی هەڕەشەی دواڕۆژن، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بازنەی ئیسلام دەری نەکردوون، بەڵکو وەك ئۆممەتی خۆی باسی کردوون، {وەك فەرموویەتی: {تَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً} أخرجه أحمد برقم: (٨٣٧٧) قال: شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن،

واتە: ئۆممەتی ئەون} هەروەها نەیفەرمووە: ئەوانە لە دۆزەخدا هەمیشەیی دەبن، ئەمەش بنچینەیەکی مەزنە، پێویستە ڕەچاو بکرێ، چونکە زۆر لەوانەی کە پاڵ دەدرێنە لای سوننەت، بیدعەتی وایان تێدایە هەر لە شێوە بیدعەتی ڕافیزەو خەواریج و ئەوانی دیکەیە، هاوەڵانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ: عەلی کوڕی ئەبیی تالیب و، غەیری ئەویش، ئەو خەواریجەی کە بەکافریان داناون و لە دژیان جەنگاون، ئەوان بە کافریان دانەناون.



# بنەمای هەژدەیەم

## نواندنی هەڵوێستی هاوسەنگ، لە بەرابنەر حوکمڕانانی لادەرو ستەمکاردا

نواندنی هەڵوێستی هاوسەنگیش لەبەرانبەر حوکمڕانانی لادەرو ستەمکاردا، بنەمایەکی دیکەی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانە.

ئەم مەسەلەیەش کێشەو مشت و مڕێکی زۆری لەسەرە:

حوکمڕانێك هەیە حوکم بە قورئان دەکات، بەڵام لادەرە، ستەم دەکات، خراپە دەکات، شوێن ئارەزووەکانی خۆی دەکەوێ، بەڵام حوکم بەشەریعەت دەکات، دەبێ هەڵوێست لە بەرانبەر ئەو جۆرە حوکمڕانانەدا چۆن بێ؟

زانایان کە قسەیان کردوە، دەربارەی ئەو جۆرە حوکمڕانانە قسەیان کردوە، نەك دەربارەی حوکمڕانێك کە لە ئەسڵدا شەریعەتی لەلا ڕەفزەو، دان بە دینی خوادا ناهێنێ، ئەوەی زانایان لە ڕابردوودا قسەیان لەبارەوە کردوە، ئەو جۆرە حوکمڕانانەیان مەبەست نیە، هەر بۆیە کە زانایانێکی وەك ئەلبانیی، ئیبنو باز، ئیبنو عوسەیمین و غەیری ئەوانەش، دێنن ئەو فەرمایشتانەی کە پێغەمبەر

(صلى الله عليه وسلم) کاتی خۆی فەرموونی، بۆ حوکمڕانانێك کە حوکم بە شەریعەت دەکەن، بەڵام هەڵەو کەم و کوڕییان هەیەو، دەیانەوێ ئەو فەرموودانە بەسەر کەسانێکدا بچەسپێنن، کە جیان لەو حوکمڕانانەی کار بە شەریعەت دەکەن و، هەر دان بە شەریعەت داناهێنن، ئەوە هەڵەیە، دەبێ هەرکەسە وەك خۆی تەماشای بکەین، هەڵبەت من لەو جۆرە کەسانەش نیم هەر خوا خوام بێ، مسوڵمانێك، یان حوکمڕانێك کافر بکەم، بە پێچەوانەوە: خوا خوامە مسوڵمان زۆر بن، بەڵام کەسێکیش کە کوفری ئاشکرای لێ بینرابێ، دەبێ وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکەی، کەسێکیش کە ئیسلام و کوفری تێدابێ، تەماشا دەکەین کوفرەکەی چەندە، ئیسلامەتییەکەی چەندە؟ ئایا کوفرەکەی وایە کە بە تەئویل بێ، بە نەزانین بێ، ئایا یەکێك لەو پەرچانەی هەن، کە پێشتر باسمان کردن؟ چونکە بە ڕاستیی حوکمدان بەسەر خەڵکدا بۆ بردنە دەریان لە بازنەی ئیسلام، ئیشی هەموو کەس نیە، ئیشی زانایان و شارەزایان و پسپۆرانە، ئەوان دەزانن مەرجەکان چۆنن؟ پەرچەکان چۆنن؟ حاڵەتەکان چۆنن؟ هەرچی ڕاست بۆوە بۆی نیە خەڵك بۆ بەهەشت و بۆ دۆزەخ ببا، ئەبو حامیدی غەززالیی دەڵێ: ئەگەر ئینسان بەهەڵەدا بچێ لە بە مسوڵمان دانانی هەزار کافردا، لە لای خوا ئاسانترە کە بەهەڵەدا بچێ لە بەکافر دانانی یەك مسوڵماندا.

ئێستاش با چەند دەقێك لەو بارەوە، بهێنینەوە:

١- خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن و، هی کاربەدەستانێك کە لەخۆتانن و، ئەگەر کەوتنە ناکۆکییەك لە نێو خۆتاندا، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر....

٢- هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾ المائدة.

واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و، هاوکاریی یەکدی مەکەن لە سەر گوناهو دەستدرێژکاریی و، پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا تۆڵەی توندە.

٣- لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بەچەند وشەیەك {هەر وشەیەك ئەرکێکی گرتبووە خۆی}، کاتێك تەواوی کردن، خوا فەرمووی: من دەتکەمە پێشەوا بۆ خەڵك، گوتی: لە وەچەکەشم؟ خوا فەرمووی: ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە.

٤- لە فەرمایشتێکدا هاتوە، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ، وَسَلُوا اللَّهَ حَقَّكُمْ} أخرجه البخاري برقم: (٦٦٤٤)، والترمذي برقم: (٢١٩٠) وقال: حسن صحيح.

واتە: لە دوای من (أَثَرة) دەبینن {مەبەست ئەوەیە کەسێك هەقی خەڵك بۆ خۆی بێنی، پێچەوانەی "إیثار"}، هەروەها چەند شتێك دەبینن کە نکووڵییان لێدەکەن و پێتان خراپن، گوتیان: بە چی فەرمانمان پێ دەکەی، ئەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)؟! فەرمووی: ئەو کاربەدەستانەی وا دەکەن، مافەکەیان پێبدەن و، مافی خۆتان لە خوا داوا بکەن.

واتە: ئەوە مەکەنە بیانووی ئەوەی سەنگەریان لێ بگرن.

٥- فەرموودەیەکی دیکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) کە بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەو فەرموودەی پێشێدا تێك دەگیرێ و، دوایی باسی دەکەین کە ئەوانە چۆن پێکەوە دەگونجێنرێن، کە ئەوە ئیشی ئەهلی عیلمەو، دەبێ ئەو دەقانەی کە بە ڕواڵەت تێك دەگیرێن، چاکیان لێ ورد ببەوە، چونکە ڕەنگە

ئەو دەقانەی کە بە ڕواڵەت تێکدەگیرێن، هەر کامیان باسی لایەك و ڕوویەك لە مەسەلەکە بکات و، بە هەموویان وێنەیەکی تەواوو کامڵ بە دەستەوە بدەن، نەك تێك بگیرێن.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَا مِنْ نَبِيّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي، إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ، يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ} أخرجه أحمد برقم: (٤٣٧٩)، ومسلم برقم: (٥٠).

واتە: خوا هیچ پێغەمبەرێکی لە ئۆممەتانی پێش من نەناردوە، مەگەر لە ئۆممەتەکەی هاوەڵان و کەسانێکی دانستە هەبوون، کە ڕێبازەکەیان دەگرت و شوێن ڕێبازەکەی دەکەوتن، ئنجا دوای وان کەسانێکی خراپ بوونە جێنشینیان، کە ئەوەی دەیانگوت: نەیان دەکردو، شتێکیان دەکرد، کە فەرمانیان پێنەکراوە، {واتە: لە ڕێی ئەو پێغەمبەرە لایان دەدا، یانی: ئۆممەتی منیش لە ڕێی من لادەدەن}، ئنجا هەر کەسێك بە دەست لە دژی ئەوانە تێبکۆشێ بڕوادارەو، هەر کەسێك بە زمان لە دژی ئەوانە تێبکۆشێ بڕوادارەو، هەر کەسێك بە دڵیش لە دژی ئەوانە تێبکۆشێ بڕوادارە، بەڵام لە دوای ئەوە {واتە: بە دڵیش دژیان نەبێ} ئەوە بە ئەندازەی یەك دەنکە خەرتەلە بڕوا لە دڵی دانیە {مادام نە هەڵوێستێکی دەروونیی هەبێ، نە هەڵوێستێکی زمانیی، نە هەڵوێستێکی جەستەیی}.

## دوو قسەی پێکەوە دژو پێچەوانەی، دووان لە زانایان:

دووان لە زانایان، دوو قسەی پێچەوانەی یەکدی دەکەن، کە (إبن تیمیة) و (إبن حزم)ن.

١)- **(إبن تيمية)** دەڵێ: {لهذا كان المشهور من مذهب أهل السنة أنهم لا يرون الخروج على الأئمة وقتالهم بالسيف، وإن كان فيهم ظلم، كما دلّت على ذلك الأحاديث الصحيحة المستفيضة عن النبي (صلى الله علليه وسلم) لأن الفساد في القتال والفتنة، أعظم من الفساد الحاصل بظلمهم بدون قتال ولا فتنة، فلا يدفع أعظم الفسادين بالتزام أدناهما، ولعله لا يكاد يُعْرَفُ طائفة خَرَجَتْ على ذي سلطان، إلا وكان في خروجها من الفساد ما هو أعظم من الفساد الذي أزالته}[(١)(٢)] واتە: بۆیە ئەوەی کە زانراوە لە بۆچوونی ئەهلی سوننەت {واتە: ئەوانەی کە بە دوای ڕێبازی پێغەمبەر کەوتوون}، ئەوە بووە کە پێیان وا بووە: نابێ لە دژی پێشەوایان و حوکمڕانان ڕاپەڕین بکرێ بەشمشێر (بە چەك)، هەرچەندە ستەمیشیان تێدابێ، فەرمایشتە ڕاستەکان کە زۆرن و لە پێغەمبەرەوە هاتوون، ئەوە دەگەیەنن، (دوایی تەعلیلی دەکات، کە بۆچی دەبێ وابێ؟) چونکە ئەو خراپەکاریی و ئاڵۆزییەی کە بەهۆی جەنگ و ئاژاوەوە پەیدا دەبێ، مەزنترە لەو خراپەکارییەی کە بەهۆی ستەمی ئەوانەوە پەیدا دەبێ، بەبێ ئەوەی شەڕ لەگەڵ خەڵك بکەن و ئاژاوە پەیدا بکەن، بۆیە نابێ خراپەکارییەکی گچکەتر بە خراپەکارییەکی گەورەتر پاڵ پێوەبنرێ و، ڕەنگە نەزانرێ هیچ کۆمەڵێك هەبن، لە دژی حوکمڕانێك ڕاپەڕی بن، مەگەر بە هۆی ڕاپەڕین و سەنگەر گرتنی ئەوانەوە، خراپەکارییەك پەیدا بووە، گەورەتر بووە لەو خراپەکارییەی کە لایان بردوە.

---

(١) منهاج السنة النبوية ج٢، ص١٦.

(٢) هەڵبەتە ئەوە ڕای (إبن تيمية)یەو، من بۆخۆم ڕام ئاوا نیە، بەڵام من ڕایەکەی ئەوتان بۆ مانا دەکەم، دوایی ڕای خۆمتان پێ دەڵێم.

**٢)- (إبن حزم)** ڕای پێچەوانەی ئەمەیە، دەڵێ: {إن وقع شيءٌ من الجور وإن قَلَّ، أن يُكَلَّم الإمامُ في ذلك ويمنع منه، فإن امتنع وراجع الحق، وأذعن للقَوَدِ من البشرة، أو من الأَعضاء ولإقامة حد الزنا والقذف والخمر عليه، فلا سبيل إلى خلعه، وهو إمام كما كان، لا يحل خَلْعُه، فإن امتنع من إنفاذ شيء من هذه الواجبات عليه، ولم يراجِعْ، وجب خَلْعُه وإقامة غيره، ممن يقوم بالحق}[١].

دوایی دەڵێ: {هذا هو قول كثير من الصحابة، والتابعين، وهو قولُ: أبي حنيفة ومالك والشافعي، وَشُرَيك وأصحابهم، فإنَّ كلَّ مَن ذكرنا من قديم وحديث، إمّا ناطق بذلك في فتواه، وإمّا فاعل لذلك بِسلِّ سيفه في إنكار ما رآه منكراً}[٢].

واتە: ئەگەر ئەندازەیەك لەستەم لەحوكمڕانێکەوە دەرکەوت، هەرچەندە ئەو ستەمە کەمیش بێ، پێویستە ئەو حوکمڕان و پێشەوایە قسەی لەگەڵدا بکرێ و، دەستی بگیرێ و، ڕێی لێ بگیرێ، ئنجا ئەگەر وازی هێناو گەڕایەوە بۆ حەق و، ملی کەچ کرد بۆ سزای شەرعیی {کە قەمچی لێدرانە، یاخود دەست بڕانە} و ملی کەچ کرد بۆ ئەوەی ئەگەر زینای کردبوو، سزایەکەی لەسەر جێبەجێ بکرێ و، سزای بوختانی داوێن پیسیی و سزای شەڕاب خۆریی لەسەر جێبەجێ بکرێ، مادام ملکەچ بکات بۆ ئەو سزایانە، ئەوکاتە نابێ لەسەر کار لابدرێ، وەك پێشێ لە جێی خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بۆ هەر کامێك لەوانە ملی کەچ نەکردو نەگەڕایەوە، ئەوە پێویستە لابدرێ و، کەسێکی دیکە کە هەق جێبەجێ دەکات، لە شوێنی دابنرێ، ئەوەش قسەی زۆرێك لە هاوەڵانەو، قسەی زۆرێك لە شوێنکەوتووانەو، ئەوە قسەی ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعیی و شورەیك و هاوەڵانیانە، چونکە ئەوانەی کە باسمان کردن، چ لە ئەوانەی پێشێ، چ لە ئەوانی تازە، یان فەتوای داوە بە قسە، یاخود بە کردەوە بۆ خۆی بەشدار بووە لە ڕاپەڕیندا {لە دژی ئەو حوکمڕانە ستەمکارانە}، بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەوەی کە بەناشەرعیی و ناهەقی زانیوە.

---

(١) الفصل في الملل والأهواء والنحل، ج٤ ص ١٧٥-١٧٦.

(٢) ج٤ ص ١٧١-١٧٢.

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەت و فەرموودانە -كە پێشتر هێنامانن- بدەین و تەماشای قسەی ئەو دوو زانایەش بكەین، كە قسەی زانایانی دیكەش زۆرن، بۆمان دەردەكەوێ كە ئەوە بابەتێكی زۆر وردەو زۆر لایەنی هەن و، وا دەردەكەوێ كە تێكگیران هەبێ، لە نێوان هەندێك لە دەقەكاندا.

دیسان ئەگەر تەماشا بكەین: لە هەڵوێستی پێشینی چاكیشماندا، جۆرێك لە ناكۆكیی هەیە:

حەسەنی كوڕی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، صوڵح دەكات لەگەڵ موعاویەدا.

بەڵام حوسەینی كوڕی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، شۆڕش دەكات لە دژی یەزیدو، عەبدوڵڵای كوڕی زوبێر شۆڕش دەكات لە دژی بەنی ئومەییە.

بەڵام عەبدوڵڵای كوڕی عومەر نوێژیان لە دوا دەكات و لەگەڵیان دەسازێ.

هەروەها حەسەنی بەصرایی ڕەخنەی لێگرتوون، بەڵام لێیان ڕانەپەڕیوە، كەچی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەشعەت شۆڕشی كردوەو لێیان ڕاپەڕیوە.

هەروەها جەعفەری صادیق لە زانایانەو شیعەش دەڵێن: ئیمامی حەوتەممانە، بێدەنگ بووەو مودارای كردوە، بەڵام زەیدی كوڕی عەلی، كە ئەویش هەر یەكێكە لە زانایانی ئەهل و بەیت شۆڕشی كردوەو، دوایی سەری خۆشی لەسەر داناوە، دەتوانین زۆر نموونەی دیكەش بێنین، ئنجا ئایا ئەوە چۆن لێك دەدرێتەوە؟

**ڕای بەندە لەبارەی ئەو مەسەلەیەوەو، چۆنیەتی پێكەوە گونجاندنی فەرموودەكان:**

براو خوشكە بەڕێزەكانم!

لە مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی} بەرگی (٢) لاپەڕە (٣٢٥ تاكو ٣٧٥) پەنجا لاپەڕەم لەسەر ئەو مەسەلەیە نووسیوە، بۆیە ئەوەی كە من بە پەنجا لاپەڕە نووسیوومە، ناتوانم لێرە باسی بكەم، هەروەها لە بەرگی حەوتەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، كە لە چاپی دووەمیدا دەبێتە كتێبی یازدەیەم، لەوێشدا باسم كردوە.

ئنجا من بۆچوونەکەی خۆم و چۆنیەتی کۆکردنەوەی ئایەتەکان و قسەی زانایانیش پێکەوە، لە چەند خاڵێکدا پوخت دەکەمەوە:

**یەکەم: هەڵەیەك و دووان جیان، لە بەردەوامیی لەسەر هەڵەو ستەم و گوناح و خراپەو تاوان:**

دیارە ئەمە هیچی لەگەڵ حوکمڕانانی ئێستام نیە، حوکمڕانانی ئێستا ئەوەی کە بڕوای بە شەریعەت نیەو، ئیسلام بە هەڵە دەزانێ، ئەوە حیسابێکی دیکەی هەیە، ئەوە دەبێ جارێکی دی خەڵك تێبگەیەنیەوە کە نابێ بە دوای کەسێکی وا بکەوێ، کە بڕوای بە پێغەمبەرەکەی نیەو، بڕوای بە شەریعەتەکەی نیە، ئەوە حیسابەکەی جیایە، من قسە لە واقیعی پێشێ دەکەم.

کەواتە: ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: ئارام بگرە، ئەگەر حوکمڕان ماڵت ببات و لە پشتیشت بدات! ئەوە مەبەست ئەو کاتەیە کە زوڵمەکە لەتۆو لە یەکێکی دیکە بووە، بەڵام کاتێك کە حوکمڕان ستەم لە هەمووان دەکات، ئا ئەوە فەرموودەکەی دیکە، باسی ئەو حاڵە دەکات، کە دەفەرموێ: هەر کەسێك بە دەست لە دژیان بێ، بە زمان لە دژیان بێ، بە دڵ لە دژیان بێ، ئەوە بڕوادارە، ئەگەرنا ئەوی دیکە، بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان لە دڵیدا نیە.

**دووەم: هەل و مەرجی نەگونجاو بۆ گۆڕانکاریی جیایە، لە هەل و مەرجی گونجاو:**

هەندێك لە پێشینی چاکمان کە ڕاپەڕیون، پێیان وا بووە هەل و مەرجەکە گونجاوە، ئنجا دوایی کە نەیان پێکاوە، ئەوە شتێکی دیکەیە، ئەوانی دیکەش کە گوتوویانە: ڕاپەڕین بە کەڵك نایەت، لەبەر ئەوە بووە، کە پێیان وا بووە کاتەکە گونجاو نیە، بۆ وێنە: لە (جعفر الصادق) ڕیوایەت کراوە گوتوویەتی: بەنو ئومەییە ئەگەر کێویش بە گژیاندا بچێ، لە بن دێ، بە گژیاندا مەچن، تاکو خوا لە بەینیان دەبات، ئەوە بوو کە لە ساڵی (١٣٢ك)دا بەنو ئومەییە دوای نەوەدو دوو (٩٢)[1] ساڵ، حوکمەکەیان کۆتایی پێهات و، عەبباسییەکان هاتنە شوێنیان، کە ئەوانیش لەوانیان چاکتر نەکرد.

---

(١) موعاویە لە (٤٠)ی کۆچییدا بووبە حوکمڕان، هەتا: (١٣٢)ی کۆچیی کەواتە: ٦٠+٣٢= ٩٢ساڵ، یاخود: ١٣٢-٤٠=٩٢.

**سێیەم: هەر بۆیەش هەردوو هەڵوێستەکان هەبوون:**

واتە: ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت، هەردوو لێتێگەیشتنیان لێ دەفامرێنەوە، چونکە خوای پەنهانزان، پاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زانیویانە هەردووك حاڵەتەکە دێنە پێشێ و پێویستە دەقەکانی شەریعەت دەلالەتیان لەسەر بکەن.

**چوارەم: دوای شکست هێنانی هەوڵەکانی شۆڕش کردن و ڕاپەڕین، ئنجا ڕای شۆڕش کردن و ڕاپەڕین، کز بوو:**

بەڵێ لەو کاتەوە زانایان فەتوایانداو گوتیان: ڕامەپەڕن، چونکە زانییان کە سەرکەوتوو نابن، تەماشایان کرد ئەو دەوڵەت و حکوومەتە، سوپاو ئاساییش و پۆلیسی هەیە، هەرچی لێی ڕاست بێتەوە، زەرەر دەکات، گوتیان: وازی لێ بێنن، نەك لەبەر ئەوەی کە دروست نیە لە ئەسڵدا، لەبەر ئەوەی سەرکەوتوو نابێ.

**پێنجەم: زانایان هەر دەڵێن: لەبەر ئەوەی کە ڕاپەڕین زیانی زیاترە، بۆیە نابێ بکرێ:**

ئیبن و تەیمییە دەڵێ: لەبەر ئەوەی زیانی زیاترە، بۆیە واز بێنن لە ڕاپەڕین، هەروەها گوتوویەتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە ویستبێتی خراپەکارییەك لاببات، مەگەر ئەو خراپەکارییەی هاتۆتە جێی، زیاتر بووە لەوەی ویستوویەتی لایبدات، لەبەر ئەوە گوتوویەتی: دەستی لێ مەدەن، وەك دەگوترێ: (چاکی مەکە با خراپ نەبێ)!

ئەم بابەتە وەك گوتم: بەڕاستی باسێکی زۆر بە لق و پۆپ و ئاڵۆزەو زۆر لە زانایانیش تێیدا تووشی بە زایەدان، یاخود تێپەڕاندن بوون، هەبووە تێی پەڕاندوە، کە هەر حوکڕانێك تۆزێکی لادا، دەبێ لێی ڕاپەڕین، خەواریج وایان کردوە، هی واش بووە بەڕاستی تووشی کورتهێنان بووە، کە حوکمڕان هەرچی کردی، دەبێ لێی گەڕێی، ئەو فەرمایشتانەیان زیاتر تەماشا کردوە، کە باسی ئەوە دەکەن: ئارام بگرە، بەڵام مەبەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئارام گرتن بووە

لەسەر هەڵەیەك و دووان و، لەسەر هەندێ زوڵمی جوزئیی، بەڵام کەسێك کە لە بنەڕەتدا شەریعەت هەر وەلا دەنێ، یان کەسێك کە هەر (بیت المال) بەهی خۆی دەزانێ و، کەسێك کە خەڵك بەکۆیلەی خۆی دەزانێ، وەك: بەنو ئومەییەو بەنو عەبباس هەندێکیان وایان کردوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەوانەی نەفەرمووە: لێیان بێدەنگ بن، هەر بۆیەش پێشەوایان و زانایانی بەرجەستە، بێدەنگ نەبوون، ئەوانیش ئەو فەرموودانەیان بینیون، بەڵام زانیویانە مەبەست لە بێدەنگ بوون، بێدەنگ بوون، لە ئاست ئەو حوکمڕانانەدا نەبووە، کە بێتامیان کردوەو، هیچ شتێکیان بۆ کەس نەهێشتۆتەوە.

ئنجا شایانی باسیشە کەلەم ڕۆژگارەماندا، ئەگەر ڕاست بێ دەوڵەت دەوڵەتی دامەزراوەکان (دولة المؤسسات)بێ، ئەوە بێگومان جگە لە پەرلەمان (ئەنجوومەنی نوێنەران) کە کارە سەرەکییەکەی بریتییە لە چاودێری کردنی حکوومەت و ڕەخنە لێگرتنی و، بەرگریی کردن لە ماف و ئازادییەکانی خەڵك و جەماوەرو، پاراستنی ڕێز و کەرامەت و سامان و بەرژەوەندییەکانیان، دەسەڵاتی دادوەریی (السلطة القضائیة)یش هەیەو، دەگونجێ گەلێك دامەزراوەو دەزگای دیکەش دروست بکرێن وەك: داواکاری گشتی (الإدعاء العام) و، دەزگای چاودێریی دارایی (جهاز الرقابة المالیة) و دەستەی دەستپاکیی (هیئة النزاهة) و...هتد.

گرنگ ئەوەیە بەپێی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت، نابێ هیچ دەسەڵاتێك لەسەرووی ئیرادەی ئازادانەی خەڵك و کۆمەڵگای مسوڵمانەوەبێ، کە بڕیاریداوە ژینی بەپێی دینی بەڕێوەبەرێ، هەروەها پێویستە بەرژەوەندیی گشتی خەڵك و جەماوەر، سەنگی مەحەك و پێوەر بێ و، ڕێگا بە هیچ کەس و لایەنێك نەدرێ وەك: تاك، بنەماڵە، هۆز، حیزب، نەتەوە، طائیفە... کە لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی گشتی خەڵك، بەرژەوەندیی تایبەتیی، ناشەرعیی خۆی دابین بکات، ئنجا چ بەرژەوەندیی سیاسیی، چ ئابووریی، چ کۆمەڵایەتیی،... بێ.

# بنەمای نـۆزدەیەم

## باشترین مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵماندا

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیی و هێڵە گشتییەکانی بەرنامەو ڕێبازی زۆربەی مسوڵمانان، ئەوەیە کە: باشترین مامەڵەیان بووە لە چوار چێوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، لەگەڵ نامسوڵماناندا، زۆر لەگەڵیان بە ئینصاف و بە ڕەحم و دادگەر بوون.

با تەماشای چەند دەقێك بکەین:

١- خوای دادگەر لە سووڕەتی (الممتحنة) ئایەتی (٨)دا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة.

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات، کەسانێك کە لە دیندا جەنگیان لە دژ نەکردوون و، لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان نەناون، کە لەگەڵیان چاکەکار بن و، لە ماڵی خۆتان پێیان ببەخشن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆش دەوێن.

زۆر لە تەفسیرەکان وشەی (ٱلۡمُقۡسِطِينَ)یان لێرەدا، بە دادگەران لێك داوەتەوە، بەڵام وەك باسم کردوە لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆمدا، ئەسڵەن ناگونجێ لێرەدا (قسط) مەبەست پێی دادگەریی بێ، چونکە دادگەر بوون لەگەڵ نامسوڵماناندا، هیچ کاتێك قەدەغە ناکرێ، چ ئەوان دژایەتیی دینت بکەن و، لە ماڵ و حاڵ وەدەرت بنێن، چ دژایەتییت نەکەن و، لە ماڵ و حاڵ وەدەرت نەنێن، دەبێ هەر دادگەر بی، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ:

﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ ﴿٨﴾﴾ المائدة.

واتە: با ڕق هەڵسانتان لە کەسانێك کە دوژمنتانن، واتان لێ نەکات کە نادادگەربن، دادگەربن، ئەوە لە تەقواوە نیزیکترە.

کەواتە: ئەوەی کە دەگونجێ قەدەغە بکرێ، بریتیە لەچاکەکاریی مەعنەویی، کە وشەی: (أَن تَبَرُّوهُمۡ) دەیگەیەنێ و، چاکەکاریی و هاوکاریی ماددیی، کە (وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ) دەیگەیەنێ، ئنجا لە ڕووی زمانی عەرەبییشەوە (أَقْسَط) واتە: دادگەریی کرد، بەڵام (أقسط إليه) واتە: بەشێك لە ماڵی خۆی پێدا، واتە: خوای کاربەجێ بە نسبەت مامەڵە لەگەڵ نامسوڵماناندا دەفەرموێ: خوا لێتان قەدەغە ناکات - بە نسبەت نامسوڵمانانەوە - کە لەڕووی مەعنەوییەوە لەگەڵیان هاوکارو چاکەکاربن، لەگەڵیان بەسۆزو بەڕەحم بن، لە ڕووی ماددییشەوە، هاوکاریان بن و، خواش هاوکاران و ماڵ و سامانی خۆ بەخشەرانی خۆشدەوێن.

٢- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾﴾،

واتە: با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك، کە ئێوەیان لە مزگەوتی حەرام گێڕایەوە {نەیانهێشت بچن عومرە بکەن لە ساڵی شەشەمی کۆچیی دا، کە صوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوە، با ئەو ڕقەتان بە هۆی ئەو هەڵوێستەیانەوە بەرانبەرتان}

واتان لێنەکات کە ئێوە دەستدرێژیی بکەنە سەریان، {ئێوەش ئەوان بگێڕنەوە، کە دەسەڵاتتان هەیە نەهێڵن بێن بۆ مزگەوتی حەڕام}، هاوکاریی یەکدیش بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و، هاوکاریی یەکدی مەکەن لەسەر گوناح و دەستدرێژیی.

٣- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٨)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر بۆ خوا شایەدیی بە دادگەرانە بدەن و، با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك واتان لێ نەکات کە نادادگەربن، دادگەر بن، ئەوە لە پارێزکارییەوە نزیکترە، پارێز بکەن، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن، شارەزایە.

٤- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٨٦)دا خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر سڵاوتان لێکرا بەسڵاوێك، بەباشتر لە خۆی یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك لێپرسەرەوەو چاودێرە.

کافرێك، جوولەکەیەك، نەصرانییەك، مولحیدێك، سڵاوت لێ دەکات، دەبێ چی بکەی؟ بەباشتر لەخۆی وەڵامی بدەوە، چونکە حەیفە کافر لەمسوڵمان بەڕێزترو چاکتر بێ و، دەستی چاکەو پیاوەتی بابای کافر، بەسەر مسوڵمانەوە هەبێ! بۆیە بەشێوەیەکی چاکتر لەهی خۆی، وەڵامی بدەوە، بگرە هەوڵ بدە تۆ پێشێ سڵاو لەو بکەی، ئەگەرنا لایەنی کەم وەك خۆی وەڵامی بدەوە.

دیارە لەو بارەوە زانایان مشت و مڕیان بووە، مشت و مڕەکەشیان هەڵقوڵاوی واقیعی خۆیان بووە، فەرمایشتێك هەیە دەفەرموێ: {لَا تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَلَا النَّصَارَى بِالسَّلَامِ فَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ} أخرجه أحمد برقم (٨٥٤٢)،

ومسلم برقم (٢١٦٧)، وأبو داود برقم (٥٢٠٥)، والترمذي برقم (٢٧٠٠) وقال: حسن صحيح.

واتە: بۆ سڵاو کردن لە جوولەکەو نەصڕانییەکان دەستپێشخەر مەبن و هەر کات لە ڕێیەدا بەیەکێکیان گەیشتن، ناچاری قەراغی ڕێیەی بکەن! ڕاستە ئەو فەرموودەیە لە ڕووی سەنەدەوە تەواوەو صەحیحە، بەڵام دەبێ ئێمە هۆکاری گوترانەکەی بزانین: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کاتێ مسوڵمانان دەچوون بۆ خەیبەر، لەبەر ئەوەی جوولەکەکان پەیمانیان شکاندبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بۆ ئەوەی جوولەکەکان بزانن کە ئێوە خاوەن هێزو دەستەڵاتن، لە ڕێیە خۆتانیان لەبەر لامەدەن!! بەڵام ئایا ئەوە بنچینەیەکەو دەبێ هەر ئاوا مامەڵە لەگەڵ ئەهلی کیتابدا بکەین؟ ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ: خوا لێتان قەدەغە ناکات کە لەگەڵیان چاکەکاربن و بەخشندەبن؟! پاشان نابێ هیچ کەس ڕەوشتی لەهی مسوڵمان جوانتر بێ، مانای چییە تۆ پاڵی پێوە بنێی بۆ لاڕێ؟، کەواتە: ئەوە بۆ کاتێکی دیاریی کراوو هەل و مەرجێکی دیاریی کراو بووە، نەك بنچینەیەکی گشتیی بێ[١].

ئنجا هەندێك لە زانایان دەربارەی ئەوە کە: ئایا ئەگەر کافر سڵاوی کرد، دروستە وەڵامی سڵاوەکەی بدەیەوە؟ گوتوویانە: نەخێر، یان گوتوویانە: هەر دەبێ بڵێی (وعليكم)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە جوولەکەکان سڵاویان لێ کردوە، فەرموویەتی: (وعليكم)، ئنجا ئایا ئەمە وایە؟ بێگومان نەخێر.

---

(١) (مسلم) لە (صحيح)ەکەی خۆیدا بە ژمارە: ٥٦٢٧، بەم بێژەیە هێناویەتی: (إذا لقيتم اليهود ...)، کەواتە: ئەوە حاڵەتێکی تایبەت و دیارییکراو بووە، نەك بنچینەیەکی گشتیی و بێگومان هەر کاتیش گێڕاوە (مَرْوِيّ)یەك لەگەڵ قورئاندا دژ وەستا، ناچارین ڕەتی بکەینەوە، چونکە موستەحیلە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێچەوانەی قورئان قسە بکات یان ڕەفتار بکات.

جارێ ئەصڵەن مسوڵمان لەسەری پێویستە، دەست پێشخەر بێ لەچاکەو جوامێریی و ڕێزو حورمەتدا، چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾ البقرة.

واتە: چاکە بکەن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، نەیفەرمووە لەگەڵ کێ؟

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ ﴿٨٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: لەگەڵ خەڵك قسەی چاك بکەن، واتە: بە گشتیی لەگەڵ خەڵکدا وابن.

ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە جوولەکە سڵاویان لێکردوە، فەرموویەتی: {وعليكم} ئەوە هۆکارەکەی دیارە، ئەوان گوتوویانە: {السّام عليك يا محمد!} (سام) یانی: مردن، مەرگ بۆ تۆ، ئەویش فەرموویەتی: بۆ ئێوەش، جارێك گوتیان: {السام عليك يا محمد}، دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ لەوێ بوو، گوتی: {السَّامُ عَلَيْكُمْ يَا إِخْوَانَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِيرِ وَلَعْنَةُ اللَّهِ وَغَضَبُهُ} أخرجه أحمد برقم: (١٣٥٥٥)، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

واتە: مردن بۆ ئێوە، ئەی برایەکانی مەیموون و بەرازان! هەروەها نەفرینی خواو تووڕەیی یەکەی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: {يَا عَائِشَةُ مَهْ! فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَا سَمِعْتَ مَا قَالُوا؟ قَالَ: أَوَمَا سَمِعْتِ مَا رَدَدْتُ عَلَيْهِمْ} ئەی عائیشە! وا مەکە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەتبیست چییان گوت؟ فەرمووی: ئەدی نەتبیست من چۆن وەڵامم دانەوە! ئەگەر سەلامیان ناردوە سەلامیان لێ بێ، ئەگەر مردنیان ناردوە، مردن بۆیان، ئەوەندە کافییە، بەڵام کابرایەکی جوولەکە، نەصرانیی، کەسێك کە بێدینە، یان عەلمانییەکی مەبدەئیی، کە کۆمەڵگاش بە کافری دادەنێ، دێ بۆ لات، سڵاوت لێ دەکات، یان ڕێزت دەگرێ، تۆش دەبێ ڕێزی لێ بگریەوە، وەك ئەم ئایەتە فەرمان دەکات، چونکە لێرەدا صیغەکەی بە بکەر نەزانراو (مجهول الفاعل) هێناوە، لە هەر کەسێکەوە سڵاوتان لێکرا، بە باشتر لە خۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

٥- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ} أخرجه أحمد برقم: (١٣٣٧٢)، والبخاري برقم: (٣٨٥)، وأبو داود برقم: (٢٦٤١)، والترمذي برقم: (٢٦٠٨).

ئەم دەقە بەشێکە لە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە زۆر لە بانگخوازان نازانن، وایان زانیوە ئەوە هەر بنچینەیەکی شەرعییەو زانایان دایان ناوە.

ئەمەش کۆی دەقەکەیە: {لأني أعطيتهم عهد الله على أن لهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين ما عليهم، بالعهد الذي استوجبوا حقَّ الذِّمام، والذَّبَّ عن الحرمة، واستوجبوا أن يُذَبَّ عنهم كلُّ مكروهٍ، حتى يكونوا للمسلمين شركاء فيما لهم، وفيما عليهم}.[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: من پەیمانی خوام پێداون {دیارە کۆمەڵێك نەصرانیی خەڵکی نەجران بوون} هەمان ماف کە مسوڵمانان هەیانە، ئەوانیش هەیانە، {مادام لە کۆمەڵگای ئیسلامیی دان و، لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دان}و هەمان ئەرك کە لەسەر مسوڵمانانە، لەسەر ئەوانیشە، {جگە لەوەی کە لە تایبەتمەندیی دینی مسوڵمانانە، مسوڵمانان نوێژوو ڕۆژوو زەکات و جیهادیان لەسەر فەرزە، لەسەر وان فەرز نیە، تەنیا بەرگریی کردنیان لە وڵاتی مسوڵمانان لەسەر فەرزەو، هێمنیی و ئاسایش بپارێزن، ئەدەبە گشتییەکان بپارێزن و، دڵسۆز بن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی و، ئەگەر کەسێك تاوانێکی کرد دەبێ سزا بدرێ و، ...هتد} بەو پەیمانەی کە پێویستیان کردوە لەسەر مسوڵمانان کە ماڵ و ناموسیان بپارێزرێ و، پێویستیان کردوە لەسەر مسوڵمانان، بە پێی ئەو پەیمانە، کە هەموو خراپەیەکیان لێ دووربخرێتەوە، تاکو ببنە هاوبەش بۆ مسوڵمانان لە سەرجەم مافەکاندا کە هەیانن و، لە ئەرکەکاندا کە لەسەر شانیانن.

---

(١) مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، محمد حميدالله، ص١٨٨، رقم: ٩٧، نسختان من مكتوب النبي صلى الله عليه وسلم إلى نجران.

هەڵبەتە من لە مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی} لە بەرگی چوارەمدا کە هەر بۆخۆی ناوونیشانەکەی ئاوایە: (نامسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا) بە درێژیی باسی ئەوەم کردووەو، لە کتێبی {چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم} لە بەشی یەکەمی دا بە ناوونیشانی: (بنەمایەکانی تەبایی و پێکەوە ژیان لە قورئاندا)و، لە بەرگی هەشتەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)[1]دا، بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە، ئەگەر بتانەوێ بچنەوە بۆ درێژەو تەفصیلی، لەو سەرچاوانەدا هەیە.

ئنجا بەڕاستی براو خوشکان! ئەمە زۆر گرنگە باش سەرنجی بدەین، چونکە هەڵەو پەڵەی زۆر لەوبارەوە هەن.

با لەو بارەوە سەرگوزشتەیەکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە:

کاتی خۆی کە لە گوندی {ئەحمەد ئاوا} بووین، لە مانگی ڕەمەزاندا بوو، ڕۆژێکیان هاتبووین بۆ گوندی (کانی سپیلکە) بۆ تازیە، لە کاتی گەڕانەوەماندا، من دوو سەیارەم لە پێشەوە بوون، هەستم کرد سەیارەی پێش ئێمە، یان سەیارەی پێشتر، مشت و مڕێکی بوو لەگەڵ بازگەی {حیزبی سۆشالیست}دا، منیش بە شوفێرەکەم گوت: لەوێ ڕایبگرە، بزانم چی بووە؟ جامی سەیارەکەم کردەوەو سڵاوم لێکرد، پاسەوانی بازگەکە گوتی: مامۆستا! پرسیارێکم هەیە، گوتم: فەرموو، گوتی: ئایا لە ڕەمەزاندا مرۆڤ نابێ خۆی بپارێزێ لە قسەی ناشیرین؟ گوتم: با، گوتی: بە خوا ئەو شوفێرەی پێشەوەتان ڕای نەگرت و سەرەڕای ئەوەش کە گوتم: تۆزێ هێواش بە! قسەشی پێگوتم، گوتم: ئاوا؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا جەنابت چی دەڵێی؟ گوتم: ئەوە هیچ کە دوایی لێ پێچینەوەی لەگەڵدا دەکەم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم: هەڵوێستەکەی جەنابت ئیسلامییانە بووە، هەرچەندە حیزبی سۆشیالیستی، هەڵوێستەکەی ویش سۆشیالیستانە بووە، هەرچەندە ئیسلامییشە!!، بۆیە دڵی خۆتی زۆر پێ سەغڵەت مەکە! ئەویش پێکەنی و گوتی: زۆر مەمنوون، دوایی کە چووینەوە

---

(١) لە چاپی دووەمیدا بۆتە: کتێبی دوازدەیەم (الكتاب الثاني عشر).

گوتم: فڵانكەس! بۆچی وات كرد؟ گوتی: مامۆستا! پێی گوتم: بۆچی وا بەخێرایی دێی؟ گوتم: ئنجا هەقی نەبووە؟! بێگومان ئەو هەقی بووە تۆ ناهەق بووی!

سبحان الله! مسوڵمانی وا هەیە، هەر لەبەر ئەوەی ناوی مسوڵمانە، پێی وایە هەرچی بكات، هەر هەقیەتی و، نامسوڵمانیش هەرچی بكات، هەر ناهەقیەتی! كە بێگومان وانیە.

مامۆستا مەلا سەعیدی نوورسیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، قسەیەكی زۆر جوانی هەیە، دەڵێ: جاری وایە مرۆڤ مسوڵمانە، بەڵام سیفەتێكی كافرانی تێدایە، یان سیفەتێكی هاوبەش دانەرانی تێدایە، یان سیفەتێكی مونافیقانی تێدایە، جاری واش هەیە، كەسێك كافرە، بەڵام سیفەتێكی مسوڵمانانی تێدایە، یان چەندان سیفەتی مسوڵمانانی تێدان، وەك پێشتر باسم كرد، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (أشجّ عبدالقيس)ی فەرموو: {إِنَّ فِيكَ لَخَصلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ تَعَالَى، الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ} أخرجه مسلم برقم: (١٧)، والترمذي برقم: (٢٠١١).

واتە: بێگومان تۆ دوو خەسڵەتت تێدان، خوای بەرز خۆشی دەوێن: هێدیی و مەندیی و، هێواشیی.

ئێمە هەندێ جار وا دەزانین، چونكە مسوڵمانین، هەرچی بیكەین، هەقی ڤیتۆمان هەیە! بۆیە دەبێ وریا بین لەو جۆرە بیر كردنەوەیە، بە پێچەوانەوە تۆ مادام مسوڵمانی، دەبێ خۆت لە شتی خراپ زیاتر بپارێزی، وەك لە خەڵكی دیكە، بە هەر حاڵ مامەڵە كردن لەگەڵ نامسوڵماناندا، ئەوانەی كە تۆ بە نامسوڵمانیان دەزانی، بەبەڵگەوە، دەبێ باشترین مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ، حەیفە ئەو لەتۆ خۆش خوڵقترو چاكتر بێ.

سەرگوزشتەیەكی دیكە:

جارێكی دیكە لە بازگەیەك ڕاوەستاین، من وەك عادەتی خۆم، ئێستاش هەر وام، سڵاوی گەرمیان لێ دەكەم، پێیان دەڵێم: ماندوو نەبن، چۆنن! باشن!، لە

بازاڕیش دەبێ هەروا بکەین، جارێك ئاوا سڵاوم کرد، یەکێك لە برایانی حیمایە گوتی: مامۆستا! دروستە سڵاویان لێ بکەین؟

گوتم: بەڵێ، بۆچی؟

گوتی: ئەدی فەرموودەیەك نیە کە دەفەرموێ: کاتێك گەیشتنە موشریکەکان ڕوویان لێ گرژ بکەن؟

گوتم: **یەکەم:** چۆن چۆنی حوکمی موشریك بوون بەسەر کەسانێکدا دەدەی، کە لانی کەم بە ڕواڵەت مسوڵمانن و خۆیان بە مسوڵمان دەزانن؟!

**دووەم:** من فەرموودەم بینیوە دەفەرموێ: ڕووت خۆشبێ و دەم بە زەردەخەنەبە، بەڵام هیچم نەبیستوە بفەرموێ: ڕووت مۆن و گرژبێ، ئەوەت لە کوێ هێناوە؟ ئەگەر لە کاتی جەنگ و بەرەنگار بوونەوەدا بێ، بەڵێ، بەڵام لە هەڵسوکەوتدا، نابێ هیچ کەس لە مسوڵمان، ڕووخۆشترو قسە خۆشترو گەشترو بەڕێزتر بێ، چونکە دینەکەی تۆ تەنیا ڕێزو خۆشەویستیی و دڵسۆزیی تێدایە بۆ خەڵك، دوژمنایەتیی و ڕق و بوغزی تێدانیە! ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاە والسلام) هەرگیز لەو ئاستە بەرزەی خۆیان دانەبەزیون، تەنانەت دوای ئەوەی، کە خەڵك قسەی ناشیرینی پێگوتوون و، بە شێوەی نارێك لەگەڵیاندا ڕوو بەڕوو بۆتەوە، پێیان گوتوون: درۆ دەکەن، شێتن، نەفامن، جادووگەرن! ئەوان هەر گوتوویانە: ئێمە دڵسۆزین بۆتان و ئەمینداریین، لەقەدەر پایەی بەرزی خۆیان و بەرنامەکەیان وەڵامیان داونەوە، تۆش دەبێ لە ئاست ئاینەکەی خۆتدا بی.

## بنەمای بیستەم

## هەوڵدان بۆ هێنانەدی بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی دواڕۆژ، بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی

ئەمیش یەکی دیکە لە بنەماو تایبەتمەندییە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانانە و، چەندان دەقی قورئان دەیگەیەنن، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١١٠)دا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴿١١٠﴾ ﴾.

واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن، بۆ مرۆڤایەتیی پەیداکراون و (ئێوەی ئەهلی ئیسلام) فەرمان بە هەرچی شتی پەسەندە دەکەن و، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسەندە دەکەن و، بڕوا بە خوا دێنن.

بۆیە بڕوا بە خوا بوونی خستۆتە دوایی، تاکو بزانین کە بڕوا بەخوا بوونێك بەڕاستیی بڕوا بە خوا بوونە، کە وا لە خاوەنەکەی بکات، فەرمانکەربێ بە شتە پەسەندەکان و، ڕێگربێ لە شتە ناپەسەندەکان.

٢- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٤٣)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:
﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾ ﴾.

واتە: ئاوا ئێوەمان کردوە بە باشترین کۆمەڵ، (یان کۆمەڵێکی میانجیی، نە تێدەپەڕێنن، نە کورتی دێنن) تاکو شایەدو چاودێربن بەسەر خەڵکەوە (بەسەر مرۆڤایەتییەوە)و پێغەمبەریش بەسەرتانەوە چاودێرو شاهێد بێ.

هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: واتە: لە قیامەت ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دێن شایەدیی دەدەن بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، شایەدیی دەدەن، بەسەر ئەو ئۆممەتانەوە، کە نکووڵیی دەکەن لەوەی کە ئەو پێغەمبەرە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون، ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) دێن، دەڵێن: ئێمە شایەدیی دەدەین، کە ئەو پێغەمبەرە پەیامی خوای پێڕاگەیاندوون، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: چۆن دەزانن؟ دەڵێن: خوایە! تۆ لە قورئانەکەی خۆتدا باسی ئەو پێغەمبەرانەت کردوە، کە بەتەواویی پەیامی تۆیان گەیاندوە.

بەڵام بە بۆچوونی من لە پێش ئەوەدا دەبێ ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شایەدو چاودێر بێ بەسەر مرۆڤایەتییەوە، کە زوڵم و ستەم و غەدر نەکات، خراپە نەکات، هەر بۆیەش ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء) کە دەفەرموێ:

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ ﴿٧٥﴾ ﴾.

واتە: بۆچی لە ڕێی خواو لە ڕێی چەوساواواندا تێناکۆشن.

بەڵێ ئەم ئایەتە موبارەکە مسوڵمانان پابەند دەکات، کە لە هەر شوێنێکی دنیادا، ستەم لێکراوێك هەبێ، دەبێ بەرگریی لێ بکەن، ستەم لێکراو کافربێ، یان مسوڵمان بێ، چونکە خوا ئەم مرۆڤانەی دروست کردوون و، لەم سەر زەوییە دایناون، کە ئازادانە بژین و، تاقی کردنەوەی خۆیان بدەن.

ئنجا ئەوەی کە خوا بۆ ئێمەی دیاریی کردوە، تەماشای بکەن و، پاشان تەماشا بکەن! ئێمە لە کوێین؟! خوا دەفەرموێ: دەبێ ئێوە چاودێر بن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، شاهید بن بەسەریانەوە، بەڵگەو شایەدیی ڕاستیی دینی خوابن، بەسەریانەوە، کەچی ئێستا ئەهلی کوفر زۆرجار واقیعی نارێکی مسوڵمانان، دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دینەکەشیان هەڵەیەو بە کەڵك نایەت!!

٣- لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ٧٨﴾

ئەم ئایەتە موبارەکە لە دە (١٠) بڕگە پێکهاتوە، دەگونجێ یەك کتێبی لەسەر دابنێین، هەڵبەتە من بە کورتی بۆتان تەفسیر دەکەم:

واتە: لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، وەك بۆ خوا شایستەیە، خوا ئێوەی هەڵبژاردوە ئەی مسوڵمانینە! لە دینی خۆیدا سەغڵەتیی دانەناوە، (ئەمە) ڕێبازی بابتان ئیبراهیمە، خوا ناوی لێناون مسوڵمان، پێش قورئان و لەم قورئانەشدا {واتە: خوا یەك ناوی بۆ داناون، ناوی دیکە لە خۆتان مەنێن}، تاکو پێغەمبەر بەسەرتانەوە چاودێر بێ و ئێوەش چاودێربن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، بۆیە نوێژ بەرپا بکەن و، زەکات بدەن و، دەست بە دینی خواوە بگرن، خوا باشترین سەرپەشتیاردو باشترین یارمەتییدەرە.

٤- لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (١٠٧)دا، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾

واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی خوا بی، بۆ هەموو جیهانییان.

لە کۆنفراسێکدا[١] باسی ئەوەم کرد، گوتم: بیکەن بە نیشانە هەر کەسێکتان بینی، هەر کۆمەڵێکتان بینی، هەر دەوڵەتێك، مایەی زەحمەت و سەر ئێشە بوون بۆ خەڵك، بزانن لە ڕێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لایانداوە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە کە ڕەحمەت و بەزەیی خوابێ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، واتە: کاتێك شوێنکەوتووانی ئەم پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) دەستەڵاتیان دەبێ، دەبنە مایەی ئاسوودەیی و ئارامیی و ئۆخژن، بۆ ئەو خەڵکەی لە ژێر سایەیان دایە، نەك دارو بەرد لەبەر دەستیان نەحەجمێ، وەك ئەوەی ئەو داعش و گرووپە لادەرانە دەیکەن.

٥-لە سوورەتی (سبأ) ئایەتی (٢٨)دا، خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٨ ﴾ سبأ.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ هەموو خەڵکی دڵخۆشکەرو ترسێنەربی، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، کە هەموو خەڵکی دڵخۆش بکات و هەموانیش وریا بکاتەوە.

٦-لە سوورەتی (ص) ئایەتەکانی: (٨٦-٨٨)دا، خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ٨٦ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٨٧ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ٨٨ ﴾

واتە: بڵێ: کرێتان لێ داواناکەم و، قورساییتان ناخەمە سەر شان {نابمە ئەرك و بار بۆتان}، ئەم قورئانە تەنیا بیر خەرەوەیە بۆ جیهانییان و، دوای ماوەیەکی دیکەش هەواڵەکەی دەزانن.

ئەوەش یەکێکە لە ئیعجازی هەواڵدان (الإعجاز الإخباري) لە قورئاندا، چونکە ئەم ئایەتە کاتێك هاتۆتە خوار لە مەککەدا، کە مسوڵمانان خاوەنی هیچ نەبوون،

---

(١) بڕوانە نامیلکەی: {كلمتان موجزتان عما يجري على الساحة العراقية}.

بێ دەستەڵات و چەوسێنراوە بوون، ئەو کاتە فەرموویەتی: ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ٨٨﴾ واتە: ئەم قورئانە کە ئێوەی خەڵکی مەککە بڕوای پێناهێنن، بۆ هەموو جیهانییان هاتوەو، دوای ماوەیەکی کەمیش هەواڵەکەی دەزانن.

کە هەر واش بوو، دوای ماوەیەکی کەم هەواڵەکەمان زانی.

٧- لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٣)دا، خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردوەو، گێڕاومانن بە چەند گەل و تیرەیەك، تاکو یەك ئاشنابن، بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترینتانە، بێگومان خوا زانای شارەزایە.

لە کۆتایی ئەم بنەمایەشدا، شتێکتان بیر دەخەمەوە:

ئێمە ئەگەر بۆمان بڕواو پێمان بکرێ، دەبێ ئاوا بین، واتە: دەبێ مایەی خێرو ڕەحمەت و ئاسوودەیی و بەرژەوەندیی بین بۆ هەموو کەس، زۆر کەس وا تەصەووڕ دەکات، کە مسوڵمان ئەگەر خێرێکی بێ، بۆ مسوڵمانانە، بەڵام نابێ نامسوڵمان خێری لێ ببینن!! ئنجا تەماشا بکەن! ئەو جۆرە بیرۆکەو بیر کردنەوانە، هەموویان هی کاتی تێکشکان و هەست بە بێهێزیی کردنن، کاتێك مسوڵمانان دەستەڵاتیان هەبوو، ئیمکانەتیان هەبوو، دەوڵەتیان هەبووو سێبەریان هەبوو، دەیانزانی کە پابەند(مُلْزَم)ن بەرگریی لە هەموو کەس بکەن، پابەندن بەوەی هەموو خەڵك لە ژێر سایەی خۆیاندا بحەوێننەوەو، بەرگرییان لێ بکەن و، مافیان بپارێزن، ژیان و کەرامەت و ماڵ و سامانیان بپارێزن، دەوڵەتی ئیسلامیی وا بووە.

با تەماشای یەك هەڵوێستی یوسوف سەلامی خوای لێبێ بکەین، زۆر جار باسم کردوەو جێی هەڵوەستەیە:

دوای ئەوەی برایەکانی ستەمی لێ دەکەن و، دەیخەنە بیرەوە، کاروانچیی دێن دەری دێنن، دەیکەنە کۆیلەو دەیفرۆشن، دەچێتە ماڵی عەزیزی میصر،

لەوێشدا كە گەورە دەبێ و ژنەكەی عەزیزی میصر تەماعی تێدەكات، داوای دەست تێكەڵیی لێدەكات:

﴿ وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴿٢٣﴾ ﴾ یوسف.

واتە: ئەو ژنەی یوسوف لە ماڵەكەیدا بوو، دەرگاكانی گاڵەدان و گوتی: بۆت حازرم و داوای دەست تێكەڵیی لێكرد!

بەڵام یوسوف دەڵێ: ﴿ مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ یوسف.

واتە: پەنا بەخوا، هاوسەرەكەی تۆ خاوەنی منە، گەورەی منەو، ڕێزی لە من گرتوەو منی حەواندۆتەوە، {چۆن من شتی وا دەكەم!!} بەدڵنیایی ستەمكاران بەمراد ناگەن.

ئیدی لەبەر دەستی ڕا دەكات و، ئەویش لە پشتەوە كراسەكەی دەدڕێنێ و، بە هەر حاڵ بەسەرهاتەكەی دیارە لەقورئاندا، ئنجا بەو بەڕائەتەشیەوە، زیندانیی دەكەن، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾ ﴾ یوسف.

واتە: ئنجا بۆیان دەركەوت دوای ئەوەی نیشانەو بەڵگەكانیشیان دیتن - لەسەر پاكیی یوسوف - كە بۆ ماوەیەك زیندانیی بكەن! ئەو یوسوفە بەو تۆمەتباریی و مەزڵوومیی و، بەو هەموو غەدرە كە لێی كراوە، لەو وڵاتەدا، كە میسرە، لەو زیندانەدا كە تێیدایەو، بۆخۆی تاكە بڕوادارە، بەڵگەمان چییە؟ دوو هاوەڵەكەی كە دوایی موناقەشەیان لەگەڵ دەكات، پێیان دەڵێ:

﴿ يَٰصَٰحِبَىِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ ﴾ یوسف.

ئەی دوو هاوەڵەكەی زیندانم! ئایا چەند پەروەردگارێكی جیا جیا باشترە بپەرسترێن، یان خوای تاكی مل پێ كەچكەر؟! دیارە بت پەرست بوون، پادشاو

خەڵکەکە هەموویان بت پەرست بوون، ئنجا یوسوف بەو هەموو ستەمدیدەیی و مەینەتیی و ناسۆرەوە، کاتێك پادشا خەون دەبینێ، تەعبیری خەونەکەی بۆ دەکات و، نەخشەیەکی پازدە ساڵیی ئابووریی بۆ دادەنێ، بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو میسرە، لەو برسیەتیی و قاتیی و قڕییە دەربازبن، بەپێی نەخشەکەی (یوسف) کە بێجگە لەخۆی لەو وڵاتەدا، ئیمانداری‌کی دیکەی تێدا نیە، کەچی ویستوویەتی چاکە بکات لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە تاکە مسوڵمانێکیان تێدا نیە!!

ئنجا ئێوە لێتان وەصیەت بێ: ئینسانی مسوڵمان ئەگەر بۆی بگونجێ، پێویستە چاکە لەگەڵ هەموو کەسدا بکات، هەموو کارێکی چاك لەگەڵ خەڵکدا بکات، جگە لەوەی کە دوژمنایەتیی دەکات و سەنگەری لێ دەگرێ، قورئانیش ئاماژە بەوە دەکات، وەك یەکەم ئایەت کە هێنامەوە، دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة.

بۆچی بە (لَّا يَنْهَىٰكُمُ) دەستی پێ کردوە؟! چونکە ئەو کاتە جەو، جەوی ململانێ و دژایەتیی بووە لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا، بۆیە دەفەرموێ: خوا لێتان قەدەغە ناکات، ئەوانەی کە دژی دینتان نین و، دژی ژینتان نین، کە لەگەڵییاندا چاکەکارو بەخشندە بن.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەهلی ئیسلام دەبێ هەوڵبدەن سوود بە مرۆڤایەتیی بگەیەنن، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاە والسلام) وا بوون، ئەوانە سەرمەشقی ئێمەن، خوای پەروەردگار یارمەتییمان بدات، ئێمەش بچینە ئەو ئاستە بەرزەی کە پێغەمبەران لەسەری بوون و، خۆمان بەو ڕەوشتە بەرزانە بڕازێنینەوە، کە ئەوان لەسەریان بوون، تاکو ئێمەش شایستەی ئەوەبین: شوێنکەوتووی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) بین و، نوێنەری ئیسلام بین، لەم سەردەم و ڕۆژگارەی خۆماندا.

# بەرایی

**خوێنەری سەنگین!**

دوای خستنە ڕووی {تایبەتمەندییە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانان} لەبەشی یەکەمی ئەم تەوەرەی دووەمەدا، لە دوو توێی بیست (٢٠) باسدا، خوا پشتیوان بێ، لەم بەشی دووەمەدا لە میانی حەڤدە (١٧) باسدا {تایبەتمەندییە عەقیدەیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان} دەخەینە ڕوو.

هەڵبەتە لەم بەشەدا جەخت لەسەر ئەو بنەماو بابەتانە دەکەینەوە کە تایبەتمەندیی جەماوەری مسوڵمانانن لە بواری ئیمان و عەقیدەو فیکردا، نەك ئەو بنەماو بابەتانەی کە خاڵی هاوبەشی نێوان تێکڕای مسوڵمانانی ئەهلی قیبلەن، چ ئەوانەی کە پەیڕەوانی ڕێبازی هەق بوون، کە جەماوەری مسوڵمانانن و، چ ئەوانەش کە هەڵەو لادانیان هەبووە، لە کۆمەڵ و تاقمە خاوەن ناوو نیشانە جۆراو جۆرەکان: خەواریج، شیعە، مورجیئە، جەهمییە، موعتەزیلە، قەدەرییە، جەبرییە.. کە بە (أهل البدع) و (أهل الأهواء) ناسراون.

بۆ وێنە: پایەکانی ئیمان (أركان الإيمان) کە لە قورئانێدا پێنج (٥)ن و، لە سوننەتدا بڕوا بەقەدەریشیان خراوەتە پاڵ و بوونە شەش (٦) پایە.

ئنجا با لەو بارەوە، سەرنجی ئایەتێکی قورئانی بەرزو بەپێزو، فەرمایشتێکی پێغەمبەری بەڕێزمان (محمد) (صلى الله عليه وسلم) بدەین:

١- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٧٧)دا، خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴿١٧٧﴾ ﴾.

واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە کە ڕووی خۆتان بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکەکاریی سیفەتی کەسێکە، حاڵی کەسێکە: ئیمانی هێناوە بەخواو، بەڕۆژی دوایی و، بە فریشتەکان و، بەکتێب (کتێبی خوا) و، بەپێغەمبەران.

٢- پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {...قال أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانُ، قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَبِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ} أخرجه الترمذي برقم (٢٦١٠) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٤٩٩٠)، ومسلم برقم (٨)، وأبو داود برقم (٤٦٩٥).

واتە: ئیمان ئەوەیە کە بڕوا بە خوا بێنی و، بە فریشتەکانی و، بە کتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی و، ئیمان بە ئەندازە گیریی خوا بێنی، ئەوەی کە پێت خۆشەو ئەوەشی کە پێت ناخۆشە {یاخود ئەوەی کە بەچاکی دەزانی ئەوەشی کە بە خراپی دەزانی} کە هەمووی لە خواوەیە.

بەڵێ ئەوانە خاڵی هاوبەشی نێوان جەماوەری مسوڵمانان و تێکڕای گرووپ و تاقمەکانن و، لێرەدا باسی ئەوانە ناکەین، بەڵکو تەنیا باسی تایبەتمەندییە ئیمانیی و عەقیدەییەکانی جەماوەری مسوڵمانان دەکەین، لە حەڤدە (١٧) باسدا، بەڵام وەك پێشتریش گوتوومانەو لێرەش دووبارەی دەکەینەوە: مەرج نیە کۆمەڵ و تاقمەکانی دیکەش کە بە (الفِرَق) و (أهل البدع) و (أهل الأهواء) ناسراون، هیچ پشك و بەشیان لە هیچ کام لەو تایبەتمەندییە ئیمانیی و عەقیدەییانەدا نەبێ! نەخێر، بەڵام بە گشتیی ئەو تایبەتمەندییانە، ئیمتیازو نیشانەکانی جیاکەرەوەی، زۆربەو جەماوەری مسوڵمانی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵانی دڵسۆزی و بنەماڵەی بەڕێزی بە گشتیی و، بەتایبەت خەلیفە ڕاشیدەکانی.

**تایبەتمەندییە ئیمانیی و عەقیدەیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان:**

١- پێناسەی ئیمان.

٢- خوا سبحانه و تعالى، تەنیا خۆی بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوە (أَلله هو الخالق، والرب، والإله الوحيد).

٣- ناوو سیفەتەکانی خوا: چەسپاندن و بەپاکگرتن (إثبات مع تَنْزيه).

٤- قورئان فەرمایشتی خوایەو سیفەتی خوایە.

٥- بینینی خوای بەرزو مەزن، لەبەهەشتدا.

٦- قۆناغی بەرزەخ و پاش خرانە نێو گۆڕ.

٧- قەدەرو قەزا (القدر والقضاء).

٨- وێکڕا خۆشویستنی هاوەڵان و خزمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ.

٩-هەڵوێستی {جەماوەری مسوڵمانان} دەربارەی خزمان و نزیکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

١٠- ڕێز لێنانی خوا بۆ دۆستانی (كرامة الأولياء).

١١- هاوسەنگیی لە نێوان عەقڵ و نەقڵ دا.

١٢- وەرگرتنی هەواڵی جۆری (الآحاد) مادام ئۆممەت قبووڵی کردبێ، لەبواری عەقیدەدا.

١٣- قورئان هەمووی ڕوونەو دەگونجێ مرۆڤ لە هەمووی تێبگات.

١٤- هۆکارەکان کاریگەرییان هەیە، لەکارتێکراوەکانیاندا، بە مۆڵەتی خوا (الأسباب لها تأثير في مُسَبَّباتها، بإذن الله).

١٥- چاکیی و خراپیی لە کردەوەکاندا، هەم بە عەقڵ دەرك دەکرێن، هەم بە شەرع، بەڵام پاداشت و سزا، تەنیا لە ڕێی شەرعەوە دەزانرێ.

١٦- وەحیی ڕاست لەگەڵ عەقڵی تەواو، هەردەم پێکەوە گونجاون.

١٧- موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری کۆتایی خواو، گەورەترین ڕەوانەکراوی و ڕووناکیی هەرە تەواویەتی.

یەکەم

# پێناسەی ئیمان

زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان کە بە {ئەهلی سوننەت} ناسراون، ئاوا پێناسەی ئیمانیان کردوە: {الإيمان: قول وعمل، يزيد بالطاعة، وينقص بالمعصية}، واتە: ئیمان قسەو کردەوەیە، بەفەرمانبەریی زیاد دەکات و، بەسەرپێچیی کەم دەکات.

ئەمەش چەند ئایەتێکی قورئان و دەقی سوننەت لەو بارەوە، وەك نموونە:

١- خوا سبحانه و تعالی لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتەکانی: (٢و ٣و ٤)دا، پێناسەی بڕواداران دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: بێگومان بڕواداران تەنها ئەوانەن کە: هەر کاتێك باسی خوا کرا، دڵیان ڕادەچڵەکێ و[1]، کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێنرانەوە، ئیمانیان زیاد دەکات و، پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، لەلای پەروەردگاریان چەندان پلەیان هەن و، لێبوردن و بژیوێکی پڕ ڕێزو حورمەت.

٢- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ} أخرجه أحمد برقم (١٠٤٣٨)، ومسلم برقم (٦٧).

واتە: دوو سیفەت لە خەڵکیدا هەن، کە ئەو دوو سیفەتە کوفرن تێیاندا: تانەدان لە ڕەچەڵەك و، شین گێڕان لەسەر مردوو (یانی: یەخە دادڕین و، پێدا هەڵگوتن و ....هتد).

٣- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {لَيْسَ بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الْكُفْرِ أَوْ الشِّرْكِ، إلاّ تَرْكُ الصَّلَاةِ} أخرجه مسلم برقم: (٨٢).

واتە: لەنێوان بەندەو کوفر یان شیرکدا، جگە لە وازلێهێنانی نوێژ، شتێکی دیکە نیە.

واتە: هەر کەسێك وازی لە نوێژێ هێنا، دەچێتە نێو بازنەی کوفرەوە، یان دەچێتە نێو بازنەی شیرکەوە.

٤- هەروەها پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا

---

(١) واتە: لە هەندێ حاڵەتی تایبەتدا، کە حاڵەتی پەرستشە، مەبەستم ئەوەیە لەخۆتان نەکەونە گومان، ئەگەر هەر ناوی خوا هات، دڵتان ڕانەچڵەکی، نەڵێن: ئێمە مسوڵمان نین! مەبەست ئەوە نیە، بەڵکو مەبەست هەندێ حاڵەتی تایبەتە، کە جێی ئەوە بێ دڵت ڕابچڵەکێ و مچوڕکەت پێدابێ.

وَهُوَ مُؤْمِنٌ} أخرجه مسلم برقم (٥٧)، وأبو داود برقم (٤٦٨٩)، والترمذي برقم (٢٦٢٥) وقال: حسن صحيح غريب، وأخرجه أيضا: أحمد برقم (١٠٢٢٠)، والبخاري برقم (٦٤٢٥)، وابن حبان برقم (٤٤١٢).

واتە: کەسێك کە زینا دەکات، لەکاتی زینا کردنەکەیدا ئیماندار نیەو، کەسێك دزیی دەکات، لەکاتی دزیی کردنەکەیدا بڕوادار نیەو، کەسێك شەڕاب دەخواتەوە، لەکاتی شەڕاب خواردنەکەیدا بڕوادار نیە.

وەك پێشتر باسمان کرد: مەبەست لەو کوفرە، کوفری گچکەیە، کە دەفەرموێ: ئیماندار نیە، واتە: ئیمانی تەواوی نیە، بەتەئکید ئەگەر ئینسان ئیمانی تەواوی هەبێ، لە گوناهە گەورەکان دەیگێڕێتەوە، بەڵکو ئەگەر ئیمانی تەواوی هەبێ، لە گوناهە بچووکەکانیشی دەیگێڕێتەوە.

بەڕێزان!

پێویستە بزانرێ کە جۆری تێگەیشتنی مرۆڤ لە (ئیمان)و جەوهەرو نێوەڕۆکەکەی، کاریگەری گەورەو گرنگی لەسەری هەیەو، لێرەوە ئینسان یان ڕێی ڕاست دەگرێ، یاخود ڕێگای هەڵە دەگرێ، وەك دوایی باسی دەکەین، بۆ وێنە: مورجیئە کە گوتوویانە: لەگەڵ ئیماندا هیچ گوناهێك زەرەری نیە، ئنجا بۆیەش ناونراون (مرجئة) چونکە کردەوەیان لە ئیمان دواخستوە، ئەو جۆرە تێڕوانینە بۆ ئیمان، هیچ گومانی تێدا نیە، کە کاریگەریی زۆر نەرێنیی هەبووە لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەوە کە تۆ پێت وابێ: هەر لەبەر ئەوەی کە پێت دەڵێن: مسوڵمان، ئەگەر هەزار گوناه بکەی، ئیمانت وەك ئیمانی ئەبو بەکرو عومەر وایە!!

ئنجا بەبارێکی دیکەدا ئەوەش کە خەواریج گوتوویانە، هەر کەسێ یەك گوناح بکات، پێی کافر دەبێ، موعتەزیلەش گوتوویانە: نە مسوڵمانەو نەکافرە، بەڵکو هەڵواسراوە! ئەو جۆرە بیرۆکانە، بەباری تێپەڕاندن یان بەباری کورتهێناندا، بەتەئکید کاریگەریی خراپی زۆریان بووە لەسەر ئۆممەت، بۆیە جێی خۆیەتی ئێمە بابەتی ئیمان باش ساغ بکەینەوە، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین ئیمان چۆنەو

چییە؟ با تەماشای ئەم قسانەی خوارەوە بکەین، وەك چەند نموونەیەك لە بیروڕای زانایانی ناوداری ئیسلام لە بارەوەی ئیمانەوە:

١)- (الشافعي) دەڵێ: {الإيمان قولٌ وعملٌ، يزيد وينقص، يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية، ثم تلا (ويزداد الذين آمنوا إيماناً) المدثر (٣١)}[١]، واتە: ئیمان قسەیەو کردەوەیە، زیاد دەکاو کەم دەکات، بەفەرمانبەریی زیان دەکاو، بەسەرپێچیی کەم دەکات، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ويزداد الذين آمنوا إيماناً)، {واتە: ئەو حەقیقەتە کە باس کرا، کە نۆزدە فریشتە، دۆزەخەوانن، زانینی ئەو حەقیقەتە، دەبێتە هۆی زیاد کردنی ئیمان، لەلای ئیمانداران، کەواتە: ئیمانیان هەیە، بەڵام زیاد دەکات}.

٢)- (الحسن البصري) دەڵێ: {لَيْسَ الْإِيمَانُ بِالتَّحَلِّي وَلَا بِالتَّمَنِّي، وَ لَكِنْ مَا وَقَرَ فِي الْقُلُوبِ وَصَدَّقَتْهُ الْأَعْمَالُ}[٢]، واتە: ئیمان بە قسەی شیرن و خۆزگە خواستن نیە، بەڵکو ئەوەیە کە لەدڵدا دەچەسپێ و، کردەوەکانیش پشتڕاستی دەکەنەوە.

٣)- (أحمد بن حنبل) دەڵێ: {الإيمان يزيد وينقص، فزيادته بالعمل، ونقصانه بترك العمل}[٣]، واتە: ئیمان زیادو کەم دەکات، بە کردەوەی باش زیاد دەکات و، بە واز لێهێنانی کردەوە کەم دەکات.

٤)- (البخاري) دەڵێ: {لقيت أكثر من ألف رجل من أهل العلم: أهل الحجاز ومكة والمدينة والكوفة والبصرة وواسط وبغداد والشام ومصر، .. فما رأيت واحداً منهم يختلف في هذه الأشياء: أن الدين: قولٌ وعَمَل}[٤]، واتە: گەیشتووم بە هەزار پیاو لە زانایان، لە خەڵکی: حیجازو مەککەو مەدینەو کوفەو بەصرەو واسط و بەغدادو شام و مصر، هیچ کام لەو زانایانە ڕاجیاییان نەبووە لەم شتانەدا، یەکەمیان ئەوەیە کە دین بریتیە لە قسەو لە کردەوە.

---

(١) فتح الباري ج١ ص٦٢.

(٢) إقتضاء العلم العمل، الخطيب البغدادي ص ٥٦.

(٣) شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، من الكتاب والسنة، وإجماع الصحابة، والتابعين، اللالكائي، ج١، ص ١٧٢-١٧٦.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥)- (إبن تيمية) دەڵێ: {أَنَّ الدِّينَ وَالْإِيمَانَ: قَوْلٌ وَعَمَلٌ، قَوْلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ، وَعَمَلُ الْقَلْبِ وَاللِّسَانِ وَالْجَوَارِحِ، وَأَنَّ الْإِيمَانَ يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَةِ}[1]، واتە: دین و ئیمان: هەم قسەیە، هەم کردەوەیە، قسەی دڵ و زمان و، کردەوەی دڵ و زمان و ئەندامەکانی، {جێبەجێ کردنیشە بە ئەندامەکان}، هەروەها ئیمان بە فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بەسەرپێچیی کەم دەکات.

### سێ ئەنجامگیریی گرنگ لە بارەی ئیمانەوە:

ئنجا ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەگەینە سێ ئەنجامگیریی گرنگ لە بارەی ئیمانەوە:

**یــەك:**

ئیمان چەند پایەیەکی هەن، کە بەبێ وان نایەتە دی و، چەند فەرزێکی هەن، کە بەبێ وان تەواو نابێ و، چەند شتێکی خۆشویستراوو پەسەندیشی هەن، کە بەبێ وان نابێتە تەواوترین، وەك چۆن نوێژیش هەندێ شتی واجبن و، هەندێ شتیشی سوننەتن و، حەج و عومرەش هەروان و، هەر کام لە زەکات دان و ڕۆژوو گرتنیش هەروان.

**دوو:**

ئیمان بە گشتی سێ پلەی هەن:

أ- (إيمان السّابقين المقرّبين): ئیمانی پێشکەوتووە نزیکخراوەکان، ئەویش ئەوەیە کە خاوەنەکەی: هەم ئەرکەکانی ئیمان دێنێتە دی، هەم خۆشویستراوەکان (مُستحبّات)ی ئیمان، چ پەیوەندییان بە کردەوەوە (عمل)ەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە وازهێنان و (ترك)ەوە هەبێ. (ئەرکێك کە دەبێ جێبەجێ بکرێ و، گوناهێك کە دەبێ وازی لێ بهێنرێ).

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٣ ص ١٥١.

**ب-** (إيمان المقتصدين، أصحاب اليمين): ئیمانی میانجییەکان، ئەویش ئەوەیە کە خاوەنەکەی ئەرکەکانی ئیمان جێ بەجێ بکا، چ پەیوەندییان بە ئەنجامدانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە وازهێنانەوە هەبێ.

**ج-** (إيمان الظالمين): ئیمانی ستەمکاران، مەبەست لە ستەمکاران، ئەوانەن کە ستەم لە خۆیان دەکەن و گوناهبارن، ئەوانەی کە هەندێ لە ئەرکەکان واز لێ دەهێنن، یان هەندێ لە گوناهەکان ئەنجام دەدەن، یاخود لەوەش خراپتر: هەندێ لە واجبەکان دەچوێنن و، هەندێ لە قەدەغەکانیش دەشکێنن.

بەڵگەشمان لەسەر ئەو پۆلێن کردنەی سەرەوە ئەوەیە، کە خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

١- ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾ فاطر.

واتە: دوایی کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمانبژاردوون، (هەموویان هەڵبژێردراون و، ئەهلی ئیمانن)، ئنجا هەیانە ستەمی لەخۆی کردوە (بەهۆی ئەوەوە کە هەندێ لە ئەرکەکانی چواندوون، یان هەندێ لە قەدەغەکانی شکاندوون) و هەیانە میانجییە (زۆر دوا نەکەوتووەو زۆریش پێش نەکەوتوە)و، هەشیانە لە چاکەکاندا پێش خەڵك کەوتۆتەوە.

**٢-** بەڵگەش لەسەر ئەوە کە ئیمان چەند بەشێکەو، هەر یەك شت نیە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبة، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَن الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَة مِنْ الْإِيمَانِ} أخرجه أحمد برقم (٩٣٥٠)، ومسلم برقم (٣٥)، وأبو داود برقم (٤٦٧٦)، والنسائي برقم (٥٠٠٥)، وابن ماجه برقم (٥٧)، وابن حبان برقم (١٦٦).

واتە: ئیمان حەفتاو ئەوەندە، یان شەست و ئەوەندە بەشە، باشترین بەشی گوتنی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه)یە، بچووکترین بەشی لابردنی ئازارێکە لەسەر ڕێگاو، شەرم و شکۆش بەشێکە لە ئیمان.

وەك تەماشا دەکەین: ئیمان، هەم خوا بەیەکگرتن دەگرێتە خۆی، هەم گوێڕایەڵیی دەگرێتە خۆی و، هەم ڕەوشتیش دەگرێتە خۆی.

٣- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدْ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ} أخرجه أبو داود برقم (٤٦٨١)، قال الألباني: صحيح، في السلسلة الصحيحة.

واتە: هەرکەسێك لەبەر خوا خەڵکی خۆش بوێ و، لەبەر خوا ڕقی لە خەڵك بێ و، لەبەر خوا ببەخشێ و، لەبەر خوا نەبەخشێ، ئەوە ئیمانەکەی تەواو کردوە.

ئەوە بەنسبەت پێناسەی ئیمانەوە، کە زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان و زانایان و پەیڕەوانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و خەلیفە ڕاشیدەکان و هاوەڵانی، لەسەر ئەو جۆرە پێناسەیەی ئیمان کۆك بوون.

**ســێ:**

ئیمان بەبێ کردەوە نایەتەدی، پێکهێنەری بێ، یان بەرهەمی:

ئەمیش ئەنجامگیرییەکی دیکەی ئەوەیە کە لەبارەی ئیمانەوە باسمان کرد، چونکە لەبارەی پەیوەندیی نێوان ئیمان و کردەوە، لەنێوان زانایاندا، ڕاجیاییەك هەیە، ئەبو حەنیفە بۆچوونێکی هەیە دەڵێ: کردەوە پێکهێنەری ئیمان نیە، بەڵکو بەرهەمی ئیمانە، یانی: کردەوە بەشێکی پێکهێنەری ئیمان نیە، بەڵکو بەشێکی تەواوکەری ئیمانە، یاخود بەرهەمی ئیمانە، ئەو ڕاجیاییە هەیە لەنێو هەندێ لە زانایانی {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}دا، بەڵام پێم وایە ئەنجامی هەمووی دەبێتەوە بەیەك، چونکە ئەگەر کردەوە بەرهەمی ئیمانیش بێ، کەواتە: ئیمانێك کردەوە بەرهەم نەهێنێ، ئەو ئیمانە نیە کە خوا ویستوویەتی، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن: کردەوە تەواوکەری ئیمانە، نەك پێکهێنەری، من پێم وایە کە

نەیانپێکاوە، چونکە بەپێی ئەوە کە دەردەکەوێ لە ڕواڵەتی قورئان و سوننەت، خوای پەروەردگار وا باسی ئیمانی کردوە، کە دەبێ ئەو کردەوانە لە خاوەنەکەیدا بێنێتە دی، ئەوجار خوای زانا فەرموویەتی ئەوانە بڕوادارن، وەك لە ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (الأنفال)دا خوا ڕایگەیاندوە کە: ئیماندارانی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن کە خاوەنی کردەوە باشەکانن، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَـٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

دووەم

## خوا سبحانە و تعالی، تەنیا خۆی بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوە (أَللە هو الخالق، والرب، والإله الوحيد)

لەوانەیە یەکێ بڵێ: ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، بەڵام نەخێر لە هەندێ شتدا لێك جیا دەبنەوە، بەڵێ مسوڵمانان هەموویان دەڵێن: خوا بەدیهێنەرەو پەروەردگارەو پەرستراوە، بەڵام دوایی هەندێکیان لە هەندێکیان جیا دەبنەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

سەرەتا با سەرنجی ئەم دەقانە بدەین:

١- لە سوورەتی (الأعــراف) ئایــەتی (٥٤)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾.

واتە: بێگومان پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا {واتە: لەشەش قۆناغدا} هێناونە دی، پاشان چۆتە سەر عەرش (وەك

بۆ خوا شایستەیە)، بەشەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بەخێرایی شوێنی دەکەوێ و، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان ڕام کراون بە فەرمانی خوا، ئاگاداربن، دروست کردن و، فەرمان، تەنیا هی خوان، بەرزیی و مەزنیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

٢- لە سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی (١٧)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ١٧ ﴾.

واتە: بە دڵنیایی لە سەرووی ئێوەوە حەوت چینمان دروست کردوون، (واتە: حەوت ئاسمانی لەسەر یەك)و، ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێ ئاگا نین.

٣- لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی (٦٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ ﴾.

واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرو ئاگادارە.

٤- لە سوورەتی (الزمر) ئایەتەکانی: (٦٤و٦٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ٦٤ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٥ ﴾.

واتە: بڵێ: ئەی نەفامەکان! ئایا فەرمانم پێ دەکەن کە جگە لە خوا بپەرستم!! پێت ڕاگەیەنراوە بەتۆش و بەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوبەش (بۆ خوا) دابنێی، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو لە زیانباران دەبی.

بەڕێزان! وەك گوتم: بڕوا بە خوا هێنان وەك تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراو، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، بەڵام دوایی لە هەندێ شتی ورددا، جەماوەرو زۆربەی مسوڵمانان، لە تاقمە داهێنەرەکان جیا دەبنەوە، بۆ وێنە:

**١- کردەوەکانی مرۆڤ لەنێوان دروستکران و وەدەستهێناندا:**

موعتەزیلە گوتوویانە: (الإنسان خالق أفعاله)، مرۆڤ بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، لەبەرانبەر ئەواندا جەبرییە گوتوویانە: نەخێر، خوا بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤەو، مرۆڤ هیچ کارە نیە، یەکێ تێیپەڕاندوە، یەکێ کورتی هێناوە، بەڵام جەماوەری مسوڵمانان گوتوویانە: بەڵێ خوا بەدیهێنەری کردەوەکانە، بەڵام کردەوەکانیشی پاڵ داوەتە لای مرۆڤەکان خۆیان، کەواتە: مرۆڤەکان خۆیان کردەوەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن.

ئنجا من ئەم مەسەلەیەم هەم لە ڕوونکردنەوەی عەقیدەی {طحاوي}داو، هەم لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا باس کردوە، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی خۆمەوە گەیشتوومەتە چارەسەرێك، من پێم وایە: کردەوەکانی مرۆڤ، نەخوا دەیانخوڵقێنێ، نە مرۆڤ، چونکە ئەصڵەن کردەوەکانی مرۆڤ هەر درووستکراو نین، تاکو پێویستییان بە دروستکەر هەبێ، کردەوەکانی مرۆڤ ئەنجام دراون و، وە دەست هێنراون و، کراون و، تەنیا پێویستییان بە (جاعل) و (کاسب) و (فاعل)ێك هەیە، پێویستییان بە (عامل) هەیەو، پێویستییان بە بەدیهێنەر (خالق) نیە، ئنجا ئەو بابەتەم لەو دوو سەرچاوەیەدا کە باسم کردن، بە تەفصیلْ خستۆتە ڕوو، بەو شێوەیەش هەم دەربازمان دەبێ لە ڕای موعتەزیلەو، هەم جەبرییە، (معتزلە)ش بۆیە وایان گوتوە، کە بەحیسابی خۆیان: بەرگریی لە دادگەریی خوا بکەن، گوتوویانە: ئەگەر خوا کردەوەکانی مرۆڤ بهێنێتە دی، مرۆڤ هیچی بۆ نامێنێتەوە!

ئەبو حەسەنی ئەشعەریی ڕەحمەتی خوای لێبێ ویستوویەتی: چارەسەرێکی میانجیی ببینێتەوە، گوتوویەتی: مرۆڤ کردەوەکانی خۆی بەدی ناهێنێ، خوا دروستیان دەکات، بەڵام مرۆڤیش بەدەستیان دێنێ، ئنجا زانایان لەبارەی شتێکەوە کە زۆر لێی ورد بیتەوە، گوتوویانە: (هذا أدق من كسب الأشعري)، چونکە: ئەگەر خوا کردەوەکانت بۆ دروست بکات، تۆ چیت بۆ ماوەتەوە؟!

بەبۆچوونی من، هیچ نامێنێتەوە، بۆیە موعتەزیلە تێیان پەڕاندوە کە دەڵێن: ئینسان کردەوەکانی خۆی بەدی دێنێ و، لە دروستکردن (خلق)دا ئینسان دەبەنە ئاستی خوا! جەبرییەکانیش کورتیان هێناوە کە دەڵێن: مرۆڤ هیچ کارە نیەو، وەك پەڕە مریشکێك کە (با) دەیجووڵێنێ، ئاوا ویستی خوا دەیجووڵێنێ! ئنجا وەك گوتم: ئەبو حەسەنی ئەشعەریی ویستوویەتی: چارەسەرێکی میانجیی بکات، بەڵام بەبۆچوونی من، تێیدا سەرکەوتوو نەبووە، چونکە وەدەستهێنان (کسب) ەکە، دیار نیە چییە؟ وەختێ خوا شتێك بخوڵقێنێ، تازە ئەوە خوڵقاندی، ئیدی (کسب)ی مرۆڤ لە کوێ دایە؟!

بۆیە من پێم وایە: دەبێ بگوترێ: {کردەوەکانی مرۆڤ دروست کراو نین}، تاکو پێویستییان بەبەدیهێنەر هەبێ، لە ڕاستییدا ئەو بۆچوونەشم لە کتێبی دیکەدا نەبینیوە، بەڵام لە کاتی مانەوەم لە گرتووخانەدا، لەئەنجامی تێڕامانەوە، هەندێ بیرۆکەم بۆ دروست بوون، کە ئەم مەسەلەیە یەکێکیانەو کەسێکیش بەبەڵگەوە بۆم ڕاست بکاتەوە، زۆر سوپاسی دەکەم، بەڵێ گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتە کە کردەوەکانی مرۆڤ، ئەصڵەن دروستکراو نین، کەسێك نوێژ دەکات، چ شتێك پەیدا بووە؟ مرۆڤەکە هەر خۆیەتی، هەر هەندێ جووڵەو قسان دەکات، هیچ شتێك پەیدا نەبووە، تاکو حەوجێی بەدیهێنەر بێ و لە نەبووەوە هاتبێتە دی، هەروەها مرۆڤ هەرچی دەیکا، هەر بەم شێوەیە، هیچ شتێکی پێ نایەتە دی، کە نەبووبێ، بەڵکو تەنیا شتەکان دەگۆڕێن، یانی: کردەوەکانی مرۆڤ (جَعْلي) ن و (خَلْقي) نین، خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا جیاوازیی کردوە لە نێوان (خلق) و (جعل)دا، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ النحل.

واتە: هەروەها خوا ماڵەکانتانی بۆ گێڕاون بە هۆکاری ئۆقرە گرتن و، لە پێستی ئاژەڵانیش ماڵ و جێگای بۆ ڕەخساندوون، کە لە کاتی بارو سوارو نیشتەجێ بوونتاندا، سووکبارن، هەروەها لە خوریی و تووك و موویان، کەل و پەل و پێداویستیی گوزەران وەدەست دێنن.

هەروەها خوا لەو شتانەی دروستی کردوون، سێبەری بۆ ڕەخساندوون و، لە چیاو کێوەکانیشدا حەشارگەی بۆ هێناونەدی، هەروەها پۆشاکی وای بۆ ڕەخساندوون کە لە گەرما (وسەرما) دەتانپارێزێ و، پۆشاکی واش کە لە زەبری کاتی جەنگتان چەپاڵەتان دەدات، بەو شێوەیە (خوا) چاکەکانی خۆیتان لەسەر تەواو دەکات، بەڵکو (بۆ خوا) ملکەچ بن.

وەك دەبینین:

ئەو شتانەی کە لە نەبوون (عَدَم) وەدیهێنراون، خوا وشەی (خَلق)ی بۆ بەکار هێناون، بەڵام ئەو شتانەی وەدی نەهێنراون و، لە ئەنجامی گۆڕانکارییەکانی سروشت، یان دەستکاریی مرۆڤدا پەیدا دەبن، وشەی (جعل)ی بۆ بەکار هێناون.

واتە: هەر شتێك کە بەدیهێنراو بێ، خوا بەدی دەهێنێ، بەڵام شتێك بەدیهێنراو نەبێ، بەڵکو بەدەستهێنراو بێ، ئەوە دەگونجێ مرۆڤ بەدەستی بهێنێ و، دەگونجێ ئاژەڵ بەدەستی بهێنێ، یان شتێکی دیکە بەدەستی بهێنێ.

**٢)- زانیاریی خوا لەنێوان ڕەها بوون و سنووردار بوون دا:**

ئەمیش مەسەلەیەکی دیکەیە کە زۆربەی مسوڵمانان تێیدا لە موعتەزیلە جیا دەبنەوە، موعتەزیلە گوتوویانە: خوای پەروەردگار زانیاریی نیە بە وردەکارییەکان (جزئیات) بۆ وێنە: ئەو کردەوانەی ئێمە دەیانکەین، خوا نایانزانێ، تاکو ئەنجامیان نەدەین! بە حیسابی خۆیان بەرگرییان لە دادگەریی خوا کردوەو گوتوویانە: ئەگەر بڵێین: خوا دەیانزانێ، کەواتە نووسیویشنی، ئنجا مرۆڤ چی بۆ دەمێنێتەوە؟ ئیدی بۆ ئەوەی بەرگریی لە دادگەریی خوا بکەن، لە زانیاریی

خوایان کەم کردۆتەوە، (جەبرییە)ش بۆ ئەوەی بەرگریی لە دەستەڵاتی خوا بکەن، لە دادگەریی خوایان کەم کردۆتەوە، بەڵام جەماوەری مسوڵمانان هەموو سیفەتەکانیان بۆ خوا جێگیر کردوون و، هیچیان لەگەڵ هیچیان تێك ناگیرێنن.

## ٣)- تەنیا خـوا پـەرسـتـران:

هەندێ لە تاقمەکان جۆرێك لە پەرستنیان بۆ غەیری خوا داناوە، بۆ وێنە: شیعە وەك زۆر جار گوتوومە: لەبەر حوسەین فریای عەلییش نەکەوتوون و، لەبەر عەلی بە فریای پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نەکەوتوون، لەبەر پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەفریای خوا هەر نەکەوتوون، بۆ لێ پاڕانەوە[1]، ئەهلی تەصەووفیش ئەوە دیارە، مەگەر کەسانێك باش تێگەیشتبن و پابەند بن بە شەریعەتەوە، ئەگەرنا شیرك و بیدعەتیان زۆرە! کە پێم وایە لەڕێی

---

(١) هەر بۆ خۆشی ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە: لە ساڵی (١٩٩٦)دا سەفەرێکی حەجمان کرد، لە شوێنێك خەڵکی شیعەی لێبوو کە دەمناسین، لە: (حزب الدعوة) و (منظمة العمل) و (المجلس الأعلى) گوتیان: شێخ! ئێمە شەوانە دانیشتنمان هەیە، پێمان خۆشە جەنابیشت بێیە لامان، بەناچاریی گوتم: باشە، دوو ڕەفیقیشم لەگەڵدا بوون، شەوێکیان چووم، دیارە ئەوەیان کە قسەی دەکرد، وەعزی بۆ دەدان، لە خەڵکەکە توورە بوو، گوتی: ئێوە دەڵێی بۆ خەوو خواردنێ هاتوون، بۆ حەج هاتوون یان بۆ خەوو خواردن! لەمەودوا شەوانە دەبێ زیکری حوسەین بکەین، بۆ ئەوەی بەرۆژ کە لە گۆڕستانی بەقیع گەڕاین، بەڵکو گۆڕێکی ئال و بەیتمان دەست بکەوێت و، بۆخۆمان سەرفراز بین، دوایی گوتیان: شێخ! تۆ بۆچوونت چی بوو؟ گوتم: حەج خوا پەرستییەکە، بەئیمتیاز خوا بەیەکگرتنی تێدا بەرجەستە دەبێ، ئینسان تەواو بۆ خوا خۆی ساغ دەکاتەوە، بەڵام ئێوە بۆ حەجێ هاتوون، کەچی شەوێ زیکری حوسەین دەکەن، لەجیاتی زیکری خوای بکەن، بەڕۆژێش لە قەبرستانی دەگەڕێن، ئەدی کەی دەپرژێنە سەر خوا؟! خۆشیان تۆزێ پێکەنین و، گوتیان: بڵێین چی؟ گوتم :چۆن بڵێین چی! خوا بپەرستن.

پیاوێکی دیکەم بینی بەرامبەر کەعبە دانیشتبوو لە ئیمامەکان دەپاڕایەوە، منیش گوتم: کاکە تۆ بەرامبەر کەعبە دانیشتووی، هەر بەلای کەم، لێرە لە خوا بپاڕێوە، ئنجا گوتم: تۆ برۆ (الصحیفة السجادیة)ی خۆتان بخوێنەوە، ئیمامەکانتان بەس لە خوا پاڕاونەتەوە.

شیعەگەریی و سۆفیگەرییەوە لیتەو لاڵێکی زۆر هاتۆتە نێو ئیسلام، بەڵام خەڵکی باشیش هەیە لە نێو ئەهلی تەصەووفدا، بەڵام بێگومان لەو دوو ڕێیەوە، دانانی بەشێك لە پەرستن بۆ غەیری خوا، دزەی کردۆتە نێو ئەهلی ئیسلامەوە، هەرچەندە وەك (إبن تيمية) گوتوویەتی: هەر کەسێ شیرکمان لێی بینی، ناڵێین موشریکەو، لەبازنەی ئیسلام بەدەرە، لەبەر ئەوەی تێنەگەیشتوە، یان لە تەئویلدا بەهەڵە داچووە.

کەواتە: تەنها خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراو بوون، پێم وایە تەنها جەماوەری مسوڵمانان بەتەواویی حەقیان پێداوە، هەرچەندە ئەوەش خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، بەڵام لە هەندێ وردەکارییدا، خەڵکێك بەم لاولادا لایداوە.

# سێیەم

## ناوو سیفەتەکانی خوا: چەسپاندن و بەپاکگرتن
## (إثبات مع تنزيه)

ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا، پێویستە بیانچەسپێنین، بەڵام هاوکاتیش خوا بە پاك بگرین و، خۆمان بپارێزین لەوەی خوا سبحانە و تعالی بشوبهێنین بە غەیری خوا، یان بەپێچەوانەوە.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین:

١- لە سوورەتی (الشورى) ئایەتی (١١)دا خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١١﴾.

واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیەو، خوا بیسەری بینەرە.

٢- لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٨٠)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ١٨٠﴾.

واتە: خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن، بەو ناوە چاکانەی لێی بپاڕێنەوەو، واز لەوانە بێنن کە لادەدەن لە ناوەکانی خوادا، لەمەودوا سزای ئەو کردەوە خراپانەیان دەدرێ.

٣- لە سووڕەتی (الروم) ئایەتی (٢٧)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٧ ﴾.

واتە: وەسفی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەویدا تەنها هی خوایەو، خوا زاڵی کاربەجێیە.

براو خوشکە بەڕێزەکان!

بە نسبەت ناوو سیفەتەکانی خواوە: بەرگی سێیەمی مەوسووعەی: {ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی}م بۆ تەرخان کردوەو لێرە ناتوانین هەقی خۆی بدەینێ، بەڵام زانایان لەو بوارەدا دوو بنچینەیان داناون:

أ- {أَمِرّوها كَما جاءَت} یانی: ئەو ناوو سیفەتانەی کە خوا خۆی پێ وەسف کردوون، یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوای پێ وەسف کردوون، چۆن هاتوون، ئاوا بیانڕۆێنن و دەستکارییان مەکەن، تەئویلیان مەکەن.

ب- {إثباتٌ بلا تكييف، وتنزيهٌ بِلا تَعْطيل}، واتە: چەسپاندن بەبێ وێچواندن و، بە پاکگرتن بەبێ پەکخستن.

دەبێ ناوو سیفەتەکان بۆ خوا بچەسپێنی، بەڵام وریا بی لە وێچواندن (تشبیه)، هەندێك لە حەنبەلییەکان - وەك دوایی بۆتان باس دەکەم - تێیان پەڕاندوە، بەتایبەت لە سیفەتە خەبەرییەکاندا، تاکو گەیاندوویانەتە وێچواندن، ئەگەر تەماشای هەندێ لە کتێب و قسەی هەندێ لە حەنبەلییەکان بکەین، خوای پەروەردگار وەك بەشەرێك دێتە بەرچاو لەسەر کورسییەك چوارمەشقی لێی دانیشتوە!! هەڵبەتە ئەوەش زیاتر بەرانبەر زێدەڕۆیی و کورتهێنانی جەهمییەو هەندێ لە ئەشاعیرەو ماتوریدییەکانە، کە ئەوانیش بەبیانووی بەپاکگرتنی

خواوە، سیفەتەکانی خوایان، پەك خستوون، تەنانەت جەهمی كوڕی صەفوان گوتوویەتی: دروست نیە بڵێی: خوا (عالم)ە، یان (قدیر)ە، یان (سمیع)ە، یان (بصیر)ە، بێگومان مسوڵمان بووە، بەڵام ئایا بۆچی وای گوتوە؟

هەرچەندە هەندێ بە كافری دادەنێن، بەڵام من پێم وایە مسوڵمان بووەو وەك زانایان گوتوویانە: بەتەئویل وای گوتوەو گوتوویەتی: ئەگەر بڵێی: خوا (علیم)ەو (قدیر)ەو ... هتد، ئەوە دەكاتە (تَعَدُّد) و ئەویش دژی یەكبوون (وحدانیة)ی خوایە! بە حیساب بەرگریی لە بەیەكگرتنی خوا كردەوە، گوتوویەتی: نابێ خوا بە هیچ سیفەتێك وەصف بكرێ، هەندێكیان گوتوویانە: خوا (علم و سمع و بصر)ی هەیە، بەڵام دروست نیە بڵێی: (عالم)ەو، (سمیع)ە، هەندێكی دیكەش بە پێچەوانەوەیان گوتوە، یانی: خوا (عالم و قدیرو سمیع...)ە، بەڵام نابێ بگوترێ: (علم و قدرەو سمع و بصر ...)ی هەن! بەڵام بۆچوونی ڕاست، هەر ئەوەیە كە ئێمە ناوو سیفەتەكانی خوا، بۆ خوا دابنێین، بەڵام وریابین لە وێچواندن (تشبیه) هەروەها خوا بەپاك بگرین، بەڵام وریا بین لە پەكخستن (تعطیل)ی سیفەتەكانی خواو، داڕنینی ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەكان لە خوای تاك و پاك.

# چوارەم

## قورئان فەرمایشتی خوایەو سیفەتی خوایە

زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان گوتوویانە: {القرآن: کلام الله، منه بدء وإليه يعود، وصفة الله غير مخلوق} قورئان فەرموودەی خوایە، لەخواوە هاتووە، بۆ لای خوا دەچێتەوەو، سیفەتی خوایەو دروستکراونیە.

خوشك و برایانی بەڕێزم!

بابەتی ئایا قورئان دروستکراو (مخلوق)ە، یان دروستکراو نیە؟ کاتی خۆی کێشەو مشت و مڕێکی زۆری لەسەر بووە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەسەر ئەوەی نەیگوتوە: قورئان دروستکراو (مخلوق)ی خوایە، سجن کراوەو هەزار قامچی لێدراوەو، چەند زانایەك لە زانایان لەسەر ئەوە کوژراون، هەروەها شافیعیی لەسەر ئەوە عێراقی بەجێ هێشتوەو چووە بۆ میصر، گێڕراوەتەوە: بانگیان کرد گوتیان: قورئان مەخلووقە یان نا؟ ئەویش گوتی: (صحف) و تەورات و زەبوورو ئینجیل و قورئان، ئەم پێنجە مەخلووقن، زانیشیان ئەوە فێڵێکی تێدایە، بەڵام گوتیان: بڕۆ، ئەو مەبەستی لەو پێنجە، پێنج پەنجەکەی خۆی بوون، کە ئاماژەی پێ کردن، دیارە زانایان دەڵێن: دروستە لەو کاتانەدا، ئینسان بە کینایە خۆی دەرباز بکات.

بەڵێ ئەو مەسەلەیە کێشەو مشت و مڕێکی زۆری لەسەر بوو، ئایا: (علم العقیدة، علم التوحید، علم أصول الدین) بۆچی ناوی (علم الکلام)ی بەسەردا زاڵ بوو؟

هەر لەبەر ئەو کێشەیە، کە ئایا قوڕئان کە (کلام الله)یە، مەخلووقە یان مەخلووق نیە؟ هەڵبەتە وەك گوتم: زۆربەی هەر زۆری زانایان گوتوویانە: قوڕئان سیفەتی خوایە، فەرمایشتی خوایە، سیفەتی خواو فەرمایشتی خواش لەگەڵ خوایەو، خوای پەروەردگار پێش ئەوەی (صحف) بۆ ئیبراهیم بنێرێ، بەڵکو پێش ئەوەی فەرمایشت لەگەڵ ئادەمدا بکات، سیفەتی فەرمایشتکردن (تکلّم)ی هەر هەبووە، بەڵام ئایا بۆچی خوا هەر کام لە کتێب و فەرمایشتەکانی لەو کاتانەدا کە دایبەزاندوون بۆ پێغەمبەرانی سەلامی خوایان لێبێ ناردوون؟! وەڵامەکەی هەر ئەوەیە کە خوا هەر شتێك کە دەیکا، لەو کاتەدا کە خۆی بەچاکی دەزانێ، دەیکات، ئەگەرنا سیفەتەکانی خوا لەگەڵ خوادا ئەزەلیین و لەنێویاندا سیفەتی فەرمایشت کردن، کە قوڕئانی خواش فەرمایشتی خوایە.

ئێستاش با چەند ئایەتێکی قوڕئان و فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە بارەی (قوڕئان) کۆتا فەرمووده (کلام)ی خواوە، بخەینە ڕوو:

١- ﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: هەروەها خوا بە فەرمایشتکردن فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کرد.

کەواتە: فەرمایشت کردن (تکلّم) سیفەتی خوایە.

٢- ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴿٦﴾ ﴾ التوبة.

واتە: هەر کات یەکێك لە هاوبەشدانەران داوای پەنادانی لێکردی، پەنای بدە تاکو گوێبیستی فەرمایشتی خوابێ.

کەواتە: قوڕئان فەرمایشت (کلام)ی خوایە.

٣- خوا سبحانه و تعالی ئاوا پێناسەی قورئانمان بۆ دەکات: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ ص.

واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی بە پیت و پێزە، دامانبەزاندوە بۆ سەرتۆ، تاکو لە ئایەتەکانی ورد بنەوەو، بۆ ئەوەی خاوەن عاقڵان پەندی لێ وەربگرن.

٤- لە سوورەتی (الشوری) ئایەتی (٥٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٢ ﴾.

واتە: ئاوا بەو شێوەیە {وەك چۆن وەحییمان بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ ناردوە}، ڕووحێکیشمان بە فەرمانی خۆمان بۆ تۆ ناردوە، کە تۆ پێشتر نەتدەزانی نە کتێب چییەو نە ئیمان چییە؟ بەڵام قورئانمان کرد بە ڕۆشناییەك کە هەر کەسێك بمانەوێ لەبەندەکانی خۆمان، پێی ڕێنمایی دەکەین و، تۆش بەرەو ڕاستەڕێ (خەڵك) ڕێنمایی دەکەی.

٥- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ} أخرجه أحمد برقم (٢٣٢)، والدارمي برقم (٣٣٦٥) ومسلم برقم (٨١٧)، وابن ماجة برقم (٢١٨)، وابن حبان برقم (٧٧٢).

واتە: خوا بەم کتێبە کەسانێك بەرز دەکاتەوەو، کەسانێکی پێ نزم دەکاتەوە.

ئایا کێ بە قورئان بەرز دەبێتەوە؟ ئەو کەسەی ئیمانی بە قورئان بێ و، لێی تێبگاو، پێوەی پابەند بێ و، کارلێکی لەگەڵدا بکات، پێی بەرز دەبێتەوە، تەماشای مێژوو بکەن! بەدرێژایی مێژوو کێ لەگەڵ قورئاندا هاوڕێتر بووبێ و، هاوەڵتر بووبێ و، چاکتر کارلێکی لەگەڵ کردبێ، زیاتر پێی بەرز بۆتەوە، لەلای خواو خەڵك، هەڵبەتە کەسێکیش پشت لە قورئان بکات، خوای دادگەر نزمی دەکاتەوە.

٦- لە سووڕەتی (الواقعة) ئایەتەکانی: (٧٥-٨٠)دا، خوا ئاوا پێناسەی قورئانمان بۆ دەکات، دەفەرموێ:

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠ ﴾.

واتە: نەخێر {وەك ئێوە دەیڵێن وا نیە، ئەی کافرەکان}! سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان و، ئەگەر ئێوە بزانن و زانستتان هەبێ، ئەوە سوێندێکی مەزنە، ئەمە قورئانێکی بەخشندەیە، یاخود قورئانێکی بەڕێزە {(كَرِيمٌ ) هەم بەمانای بەخشندەو هەم بەمانی بەڕێزیش دێ}، لە کتێبێکی شێردراوە دایە {کە عیلمی ئەزەلیی خوا یان (اللوح المحفوظ)ە}، جگە لە پاککراوەکان {واتە: فریشتە پاکەکان} هیچکەس دەستی نایگاتێ، {چونکە کافرەکان پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) بەوە تاوانبار دەکرد، کە شەیتانەکان قورئانیان بۆ ناردوە}[1]، لەلایەن پەروەردگاری جیهانییەکانەوە دابەزێندراوە.

---

(١) کەواتە: ئەوانەی بە پشت بەستن بەم ئایەتە، پێیان وایە بەبێ دەست نوێژ دروست نیە دەست لە قورئانێ بدەی، تێی نەگەیشتوون، جارێ ئەمە سووڕەتێکی مەککەییەو مەبەستیش لەو قسانە: بەرپەرچدانەوەی تۆمەتێکی کافرانە، کە دەیانگوت: شەیتانەکان قورئان بۆ موحەممەد دێنن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: فریشتە زۆر پاکەکان نەبێ، دەستیان ناگاتە قورئان، هەڵبەتە ئەگەر بەڵگەی دیکە هەبن لەسەر ئەوەی کە دروست نیە، بەبێ دەست نوێژ دەست لە قورئان بدەی، ئەوە لەجێی خۆیدایە، بەڵام ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ، من ڕاشم وایە بۆ دەست لە قورئان دان، دەست نوێژ بەمەرج نەگیراوە، بەڵام وا باشترەو ئەوەش ڕای زۆرێك لە زانایانە.

پێنجەم

## بینینی خوای بەرزو مەزن لە بەهەشت دا

زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان {جەماوەری مسوڵمانان - جمهور المسلمين} ڕایان وایە کە: خوا لە دنیادا نابینرێ، بەڵام بڕواداران لە بەهەشتدا دەیبینن، ئەوەش لەخۆڕا نەگوتراوە، هەندێ لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە: خوامان بینیوە، ئنجا ئایا بەهەڵەدا چوون، یان ویستوویانە خەڵك هەڵخەڵەتێنن، گرنگ ئەوەیە ئەو قسانە کراون، بۆیەش {جەماوەری مسوڵمانان} گوتوویانە: خوا لە دنیادا نابینرێ، بەڵام لە خەوندا دەبینرێ، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام) دا، کە دوایی کراوە بە نامیلکەیەکیش باسم کردوە، کە بینینی خوا لەخەوندا، لەنێو زانایاندا، شتێکە وەك ئەلیف و بێ وایە، کە خوا لەخەوندا دەبینرێ، ئنجا هەر لەوێدا لەو بارەوە نۆ (٩) فەرمایشتی پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) هێناون و، ناوی بیست (٢٠) زانام لەو بارەوە هێناوە، بۆیە هەر کەسێك لەوەدا ئیشکالی هەبێ، شارەزا نیە، نە شارەزای سوننەت و، نە شارەزای قسەی زانایان و، نە شارەزای تەعبیریشە.

بەڵام بڕواداران لە بەهەشتدا خوای بەرزو مەزن بە چاوی سەر دەبینن، چۆنی دەبینن؟ ئێمە نازانین.

ئەوەش چەند دەقێکی شەریعەت لەو بارەوە:

١- خوا سبحانە و تعالی بە نسبەت نەبینرانی خواوە لە دنیادا، لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٠٣)دا، دەفەرموێ:

﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾.

واتە: چاوەکان نایبینن و ئەو چاوەکان دەبینێ و، ئەو زۆر پەنهانکاری شارەزایە.

٢- بە نسبەت بینرانی خواوە لە دوا ڕۆژدا، لە سوورەتی (القيامة) هەر دووك ئایەتی (٢٢و٢٣)دا، خوای پاك و تاك دەفەرموێ:

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾.

واتە: لەو ڕۆژەدا چەند ڕوویەك هەن گەشاوەن، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن.

٣- فەرمایشتی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە زۆرن، یەکێك لەوانە دەفەرموێ: {فَإِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ} أخرجه أحمد برقم (١٩٢١٣)، والبخاري برقم (٥٢٩)، ومسلم برقم (٦٣٣)، وأبو داود برقم (٤٧٢٩)، والترمذي برقم (٢٥٥١)، وابن ماجه برقم (١٧٧)، وابن حبان برقم (٧٤٤٢).

واتە: بێگومان ئێوە پەروەردگارتان دەبینن، وەك چۆن مانگ لە شەوی بەدر {چواردەو پازدە}دا دەبینن و، زیانتان پێ ناگات بەهۆی بینینی {خوای پەروەردگار}ەوە، یاخود کەم و کوڕییەك ڕووتان تێ ناکا، یاخود لە بینینەکەیدا تەم و مژێکتان نایەتە بەرچاوو بەڕوونیی دەیبینن.

شایانی باسیشە هەندێك لە گرووپ و تاقمە لادەرو داهێنەرەکان - بەتایبەت موعتەزیلەو شیعەی دوازدەیی (المعتزلة والشيعة الإثنا عشرية) - پێیان وایە لەڕۆژی دواییشدا ناگونجێ خوا ببینرێ! بەڵام ئێمە لە تەفسیری ئایەتی (١٠٣)ی (الأنعام)دا، بەرپەچێکی باشی ئەو بیرۆکەیەمان داوەتەوە.

شەشەم

## قۆناغی بەرزەخ و پاش خرانە نێو گۆڕ

{جەماوەری مسوڵمانان} لەسەر هەبوونی ژیانی قۆناغی بەرزەخ و دوای مردن یەکدەنگن و، دەڵێن: هەرچی لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە هاتوە، مادام لە ڕێیەکی ڕاستەوە هاتبێ، بڕوامان بە هەمووی هەیە، هەرچەندە لە قورئانیشدا - وەك ئێستا دێینە سەری - باسی ژیانی قۆناغی بەرزەخ و ژیانی دوای خرانە نێو گۆڕ، یان دوای مەرگ کراوە، بەڵام ئەوەی کە وردەکارییەکانی باس کردوون، سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بەڵام لە قورئاندا بە شێوەی گشتی ئاماژەی پێ دراوە، با سەیری ئەم چەند دەقە بکەین:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی ژمارە (١٠٠)دا، دەفەرمووێ:
﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتە: لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی کە تێیدا زیندوو دەکرێنەوە.

واتە: پەردەیەك، نێوانێك هەیە كە جیایان دەكاتەوە لە ژیانی دنیا، یانی: قۆناغێكی ڕاگوزەرە (إنتقالي)ە، لەنێوان ژیانی دنیاو دوارۆژدا.

٢- لە سەرەتای سوورەتی (الواقعة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾﴾.

لێرەدا خوا سبحانه و تعالى باسی ئاخیر زەمان (الساعة) دەكات و، دواییش باسی هەڵسانەوە (قیامة) دەكات، زۆر جار باسم كردوە: كە (ساعة) واتە ئاخیر زەمان، ئەو قۆناغەی كە ئەم ژیانەی ئێستای تێدا كۆتایی پێ دێ، (قیامة) ش واتە: هەڵسانەوە بۆ قۆناغی ڕۆژی دوایی، ئنجا ئەم ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی (الواقعة) باسی هەردووك قۆناغی: (الساعة والقیامة) دەكەن، بە تێكهەڵكێشی: سەرەتا لە ئایەتەكانی: (١-٦)دا باسی ڕووداوەكانی ئاخیر زەمان (ساعة) دەكات.

واتە: هەر كات كارەسات قەوما. هیچكەس نیە بە ڕوودانەكەی بێبڕوا بێ و بەدرۆی دابنێ.

{بۆ بێبڕوایان} نزمكەرەوەو {بۆ بڕواداران} بەرزكەرەوەیە.

هەر كات زەمین بە ڕاشڵەقێنران ڕاشڵەقێنراو، چیایەكانیش بە وردەخاش كران هاڕڕان، یەكسەر بوونە تۆزو گەردی پرژو بڵاو.

پاشان دەگوازێتەوە بۆ قۆناغی هەڵسانەوە (قیامة)و لێپرسینەوە (حساب) و سزاو پاداشت و دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً﴾ ئێوە دەبنە سێ پۆل.

ئنجا باسیان دەكات و دەفەرموێ:

﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ ﴾

دوایی خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی پاداشت دانەوەی: (ٱلسَّٰبِقُونَ) (ٱلۡمُقَرَّبُونَ) دەكات.

دوایی باسی چۆنیەتی پاداشت دانەوەی (أصحاب اليمين)، یان (أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ) دەكات.

پاشان باسی سزای: (وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ) (أصحاب الشمال)یش دەكات، ئەوە بە نسبەت سزاو پاداشتێك كە بەدوای هەردووك قۆناغی (الساعة، والقيامة) دادێ.

بەڵام لە كۆتایی ئەم سوورەتەدا، خوا سبحانە وتعالى جارێكی دیكە هەمان بابەت باس دەكات، ئنجا ئەوە هەڵهێنجانی خۆمە كە ئەوەی دوایی مەبەست قۆناغی بەرزەخە، ڕەنگە لە تەفسیرەكانیشدا هەبێ، بەڵام من نەمبینیبێ، بەڵگەشم ئەوەیە كە: خوای كاربەجێ لە ئایەتەكانی سەرەتای سوورەتەكەدا، چ بۆ (ٱلسَّٰبِقُونَ) و (ٱلۡمُقَرَّبُونَ)، چ بۆ (أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ) و (أصحاب اليمين)، پاداشتەكەیان بەتەفصیلْ باس دەكات، هەروەها بۆ (أصحاب الشمال) و (وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ)ش سزایەكەیان بە تەفصیلْ باس دەكات.

دوای لە ئایەتەكانی كۆتایی سوورەتی (الواقعة)دا،باسی ئەو سێ كۆمەڵەو پاداشت و سزایەكانیان دووبارە دەكاتەوە، بەڵام زۆر بە كورتیی، هەڵبەتە لە قورئاندا هیچ دووبارەیەكی بێ حیكمەت نیە، ئنجا لەدوای گیان كێشرانیش باسی دەكات، بۆیە دەزانین ئەوەی پێشێ، كە لە دوای ئاخیر زەمان (ساعة) باس دەكرێ، مەبەست پێی ڕۆژی دوایی و قیامەت و لێپرسینەوە و سزا و پاداشتی كۆتاییە، بەڵام ئەوەی دووەم، كە ئاوا دەست پێ دەكات دەفەرمویٚ:

﴿ فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الواقعة.

ئەوە دیارە باسی سەرەتای مەرگە:

واتە: نەخێر {ئەوەی ئێوە دەیڵێن وا نیە}، هەر کاتێك ڕووح[1] گەیشتە گەروو، {کەواتە: ڕووح لەنێو جەستەدایەو لە جەستە دەردەهێنرێ، هەتا دەگاتە گەروو، کە لە گەرووش چووە دەر، دیارە حاڵەتی مەرگ ڕوو دەدات} ئێوەش لەو کاتەدا تەماشا دەکەن، {ئەو مرۆڤە دەکەوێتە حاڵەتی سەرەمەرگ و گیانەڵا، ئێوەش بەدەوریەوەن و تەماشای دەکەن}، ئێمەش لە ئێوە لێی نزیکترین بەڵام ئێوە نابینن، {یانی: فریشتەکانمان، چونکە خوا بەزۆریی کە لە قورئاندا ڕاناوەکانی: (إنا، نحن) بەکار دەهێنێ، مەبەستی پێ فریشتەکانە، خوای پەروەردگار هەمیشە فریشتەکان لەگەڵ خۆیدا باس دەکات، چونکە فریشتەکان چی خوا بفەرمووێ، وا دەکەن و، فەرمانەکانی خوا جێ بەجێ دەکەن، هەموو شتێ بە ئیرادەو ویستی خوایە، بەڵام خوا سبحانە و تعالى کارو باری بوونی بە فریشتان سپاردوە}، ئنجا ئەگەر ئێوە مل کەچ نین و لەژێر ڕکێفی خوا دانین، ئەو ڕووحە کە گەیشتۆتە گەروو، بیگێڕنەوە بۆ نێو جەستەو مەهێڵن دەربچێ، ئەگەر ڕاست دەکەن {ئنجا دیسان سێ کۆمەڵەکان باس دەکاتەوە} ئەگەر ئەو کەسە {کە خاوەنی ئەو ڕووحەیە}، لە خوا نزیکان بێ، ئەوە پاداشتەکەی: فەرەحنایی و میوە، یان بۆنی خۆش و، باغێکی پڕ لە نازو نیعمەتە، بەڵام ئەگەر لە هاوەڵانی لای ڕاست بێ {ئەوانەی کە بەدەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە} ئەوە لەلایەن منەوە، سەلام لە هاوەڵانی لای ڕاست بێ، بەڵام ئەگەر لە بەدرۆ دانەرانی گومڕا بێ، {واتە: (أصحاب الشمال) بێ} ئەوە میوانداریی دەکرێ لەنێو ئاوێکی داغ و کوڵیوداو، دەشبرژێنرێ و ئاگری بەردەدرێتێ {کڵپە سەوزەکەی ئاگر}، دوایی دەفەرموێ: بێگومان ئەوەی کە باس کرا، حەقێکە جێی دڵنیایی، تۆش ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە.

---

(١) وشەی (ڕوح) یان (نەفس) نەهاتوە، بەڵام ڕاناوی (ت)ی سەر وشەی (بلغت) دەیگەیەنێ، {(إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ) ئەم ڕاناوی (ت)ی سەر (بَلَغَتِ) کە بۆ مێینە (مؤنث) ە، بەتەئکید دەچێتەوە بۆ ڕووح، یان بۆ (نفس) ئەویش بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ئەگەرنا پێشتر باس نەکراوە}.

کەواتە: ئەوەی پێشێ مەبەست پێی سزاو پاداشتێکە، کە لە قیامەتدا دێ، ئەمەش مەبەست پێی سزاو پاداشتێکە، کە بەتەئکید لەدوای گیان کێشرانەوەیە، ئەویش بریتیە لە پاداشت و سزای قۆناغی بەرزەخ.

٢- هەروەها لەو بارەوە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆرن، بۆ نموونە: {لَوْلَا أَنْ لَا تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ} أخرجه أحمد برقم (١٣٩١٥)، ومسلم برقم (٢٨٦٨)، والنسائي برقم (٢٠٥٨)، وابن حبان برقم (٣١٢٦).

واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە یەکدی نەشێرنەوە {لەترسی سزای گۆڕ}، لەخوا دەپاڕامەوە کە ئەوەی من دەیبیستم، {لە سزای گۆڕ}، ئێوەش بیبیستن.

دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند دەنگێکی بیستوون، کە بەتەئکید ئێمە نایانبیستین، وەك: (دەنگی جبریل، دەنگی سزای گۆڕ)، کە لەچەندان فەرمایشتدا هاتوون.

٣- لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، إِنَّهُ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ، فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ} أخرجه مسلم برقم (٢٨٧٠).

هەر کاتێ بەندە خرایە گۆڕەکەیەوەو، هاوەڵەکانی ڕۆیشتن، دەنگی پێڵاوەکانیان دەبیستێ، کە دەڕۆن {دەنگی پێیەکانیان دەبیستێ}، دوای ئەوە دوو فریشتە دێنە لای.

پێویستە بگوترێ: کە هەندێ لەو پێڕو تاقمانەی لە ڕاستە شەقامی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکان لایانداوە، نکووڵییان کردوە لە سزاو پاداشتی دوای خرانە گۆڕو گوتوویانە: تاکو قیامەت، هیچ شتێك لەئارادا نیە، کە بە تەئکید وا نیەو، بە بۆچوونی من وەك دواتریش بە درێژیی باسی دەکەم، لەتەوەری پێنجەمدا، هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو جۆرە بیرۆکانە ئەوەیە کە هەڵگرانیان وەك پێویست پشت بە نەقڵ نابەستن و، زیاتر

پشت بە عەقڵ دەبەستن، هەڵبەتە عەقڵیش دەبێ پشتی پێ ببەسترێ، بەڵام لە بواری خۆیداو بە ئەندازەی خۆی، ئنجا ئەوان هەر دەقێك لەگەڵ عەقڵدا نەگونجا، دەیانەوێ یان تەئویلی بکەن، یاخود نکوولّیی لێ بکەن، کە بەتەئکید ئەوە هەڵوێستێکی هەڵەیە، چونکە عەقڵ هەتا مەودایەك دەڕواو لەدوای ئەوە، توانای نیە، چی دیکە ناتوانێ بڕکا.

کەواتە: نابێ چاو لەسەر عەقڵ چڕ دابگرین، هەرچی ئەو نەیسەلماند، یان هەرچی ئەو تێینەگەیشت، بڵێین: بوونی نیە، وەك زانایان بنچینەیەکیان داناوە دەڵێن: (إنَّ عَدَمَ العِلمِ لا يَستلزم علمَ العَدَمِ)، زانیاریی نەبوون بە شتێك، مانای نەبوونی ئەو شتە نیە، جاری وایە ئینسان زانیاریی بە شتێك نیەو شتەکەش هەیە، وەك پێشتریش باسم کردوە: بەر لەوەی (لویس باستۆڕ) میکرۆسکۆب دروست بکات، ئەو زیندەوەرە بچووکانەی وەك ڤایرۆس و بەکتریا، هەبوون و خەڵکیش نەیدەزانی هەن، ئنجا ئایا نەبینرانیان و نەزانینیان، بەڵگە بووە لەسەر نەبوونیان؟! بەتەئکید نەخێر، ئنجا بە چ مەعلووم، ئەگەر زانیاریی بەرەو پێشەوە بچێ، شتی دیکەشمان بۆ ئاشکرا نابێ!

## پەیوەندییەکانی ڕووح بە جەستەوە:

زانایان دەڵێن: ڕووح پێنج جۆرە پەیوەندیی هەن بە جەستەوە:

١- پەیوەندیی یەکەم: کاتێ کە کۆرپەلەیە، لە سکی دایکیدا.

٢- پەیوەندیی دووەم: لەکاتی ژیانی دنیادا.

٣- پەیوەندیی سێیەم: لەحاڵەتی خەودا.

٤- پەیوەندیی چوارەم: لە قۆناغی بەرزەخدا دوای مەرگ، ئەوە پەیوەندییەش ئێمە نازانین چۆنە، بەڵام نزیکە لەو پەیوەندییەی ڕووح بە جەستەمانەوە، لە کاتی خەودا.

٥- پەیوەندیی پێنجەم: لە قیامەتدا، جۆرێکی دیکە لە پەیوەندیی هەیە، کە دیارە مرۆڤ بە ڕووح و جەستەوە، یان دەچێتە بەهەشت، یان دەچێتە دۆزەخ.

**ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی چۆنیەتی سزا و نیعمەتی بەرزەخەوە:**

لە بواری مەسەلەی سزای گۆڕو پاداشتی گۆڕدا، وەك چۆن پێویستە خۆمان لە کەمتەرخەمیی و بەزایەدان بپارێزین و، ئەو دەقانەی کە هەن مادام لە ڕێیەکی ڕاستەوە پێمان گەیشتبن، با عەقڵیش دەرکی نەکات چۆنە؟ هەر دەبێ وەك ڕاستییەکی ئیمانیی قبووڵیان بکەین، چونکە ئیمان ئەوەیە کە تۆ شتێك نابینی و بۆت بەرهەست (محسوس) نیە، بەڵام بڕوات پێیەتی، ئیمان بە غەیب هەر ئەوەیە، نازانی خوا چۆنە؟ بەڵام ناوو سیفەتەکانی خوا، لە دروستکراوەکانی دا دردەوشاونەتەوە، ئێمە لەڕێی عەقڵەوە پەی بە خوای پەروەردگار دەبەین، هەروەها فریشتەکان و بەهەشت و دۆزەخ، لە ئێمە پەنهان و غەیبن، ئنجا نیعمەت و عەزابی دوای گۆڕیش بەهەمان شێوە، پەنهان (غیب)ە، ئنجا ئێمە دەبێ عەقڵی خۆمان هێندە پێ زل نەبێ، پێمان وابێ هەموو شتێك تێدەگات و، هەرچی عەقڵ تێینەگەیشت، ڕەتی بکەینەوە، چونکە ئەو کاتە عەقڵی خۆمان دەپەرستین، نەك خواو، بەدوای عەقڵ دەکەوین، نەك بەدوای وەحیی!

بەڵام بەبارێکی دیکەشدا: دەبێ خۆمان لە تێپەڕاندنیش بپارێزین، تێپەڕاندن ئەوەیە، زیاد لەوەی دەقەکانی وەحیی گوتوویانە، بیڵێین و لێیان تێپەڕێنین، یاخود دەقەکانی وەحیی بە شێوەیەکی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی بەبێ قووڵ بوونەوە، لێ تێبگەین و بەکار بێنین.

بۆوێنە: یەکێك بۆی گێڕامەوە گوتی: خزمێکمان مردبوو گەنجێکی (سەلەفیی ناو) لەوێ بوو گوتی: دەبێ قەبرەکەی قووڵ بکەن، گوتمان: بۆچی؟ گوتی: بۆ ئەوەی کە دوو فریشتەکە هاتن پرسارو وەڵامی لێبکەن، بتوانێ دابنیشێ، چونکە فەرموودەکە دەڵێ: دایدەنیشێنن، دەبێ بتوانێ

دابنیشێ!! گوتی: شوێنەکەش زۆر سەخت بوو، گوتمان: ئاخر زەحمەتە، گوتی: نەخێر دەبێ ئیللا وا بێ! {هەڵبەتە لەو جۆرە کەسانە بووە، کە تەنها تەماشای ڕواڵەتی دەقەکان دەکەن، بەبێ بەکار هێنانی عەقڵ و لێ ورد بوونەوە}، گوتی: بەهەر حاڵ قەبرەکەمان بەو جۆرە هەڵکەند کە گوتی، بەڵام خزمێکیان لەوێبوو گوتی: باشە ئەوە ئەو گرفتەمان چارەسەر کرد، بەڵام ئەو هەموو کەسانەی پێشتر مردوون، چۆن بتوانین دەریان بێنین و قەبرەکانینان بۆ قووڵ بکەین، تاکو بتوانن دابنیشن!!

فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: فریشتەکان دایدەنیشێنن و لێی دەپرسن، بەتەئکید مەبەست ئەوە نیە کە جەستەکەی دادەنیشێنن، چونکە ئایا ئەو کەسەی هەر بەبن گڵی دەخەن، یان دەسووتێنرێ، یان هەر نانێژرێ، چۆنی دابنیشێنن؟! هەزاران کەس هەر ناخرێنە گۆڕەوە! بەڵکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ویستوویەتی ئێمە حاڵی بکا کە ئەو مرۆڤە پرسیارو وەڵامی لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام جارێکی دیکە ڕووح بچێتەوە نێو جەستە، هیچ دەقێکی لەسەر نیەو، ئەگەر دەقێکی واش هەبێ دەبێ تەئویل بکرێ، چونکە ئەو جەستەیەی ڕووحی لێ چووە دەر، تازە بەکەڵکی ئەوە نایەت ڕووح بچێتەوە نێوی، تاکو ڕۆژی قیامەت، ڕووح ناچێتەوە نێو جەستە، بەڵام جۆرێك لە پەیوەندیی لەگەڵ ئەو جەستەیەدا دەبێ، تاکەی ئەو پەیوەندییە هەیە؟ ئێمە نازانین، بەڵام جۆرێك لە پەیوەندیی لەگەڵیدا هەیە، چونکە فەرموودەکان ئاماژە بەوە دەکەن و، خەونیش لەو بارەوە هێندە زۆر بینراون، کە دەگەنە ڕادەی تەواتور، (إبن القیم)یش لە کتێبی (الروح)دا لەو بارەوە شتی زۆری باسکردوە.

منیش لەو بارەوە بەسەرهاتی زۆرم لەلان، کە بۆ نموونە یەکێکیان باس دەکەم:

دایکم - بەڕەحمەت بێ - لە ساڵی ١٩٨٢ز دا بۆی گێڕامەوە، گوتی: دایکم - واتە: نەنکم خوا لێی خۆشبێ- بە ماوەیەك پاش مردنی، هاتە خەونم دیتم سەرو پرچی تەڕ بووەو پێشانی دام، وەك سکاڵا کردن کە پێم بڵێ: وەرە قەبرەکەم ئاوی دەچێتە نێو، چاکی بکە، گوتی: کە چووم بینیم گۆڕەکەی

لەلای سەریەوە کونێکی تێ بووبوو، وەرزی زستانیش بوو، باران دەباری و جۆگەلەی ئاو دەچووە نێو گۆڕەکەیەوە!

کەواتە: جۆرێك لە پەیوەندیی لە نێوان ڕووح و جەستەی بابای مردوودا هەیە، بەڵام چۆن و هەتا کەی بەردەوام دەبێ؟ نازانین! گرنگ ئەوەیە مرۆڤ دوای ئەوەی ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوەو، دەچێتە قۆناغی بەرزەخەوە، پرسیارو وەڵام هەیە، سزاو پاداشت هەیە، لەقەدەر ئەو قۆناغە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی لە قیامەتێ؟ دەڵێین: دیارە پرسیارو وەڵامێکی لەقەدەر ئەو قۆناغە دەکرێ، هەروەها سزاو پاداشتەکەش بەهەمان شێوە، ئنجا هی وا هەیە لە ئەنجامی سزای قۆناغی بەرزەخدا پاك دەبێتەوەو، ئەو گوناهانەی کە کردوونی و ئەو سزایەی کە لە سەریەتی، بە قۆناغی بەرزەخ لەسەری لادەچێ، بگرە هەیە بە نارەحەتییەکانی کاتی گیانەڵا لەسەری لادەچێ و، هەیە دەمێنێ تاکو ڕاوەستان لە ڕۆژی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەدا، هەشە تاکو ئەو کاتەی بەسەر پردی سەر پشتی دۆزەخدا تێدەپەڕن و، بەهۆی نارەحەتیی تێپەڕینیەوە، پاك دەبێتەوەو، هەشە پاك نابێتەوەو، سزای خۆی لە دۆزەخدا دەچێژێ و، دوایی دێنەوە دەرێ، مادام ئیمانی هەبێ.

# حەوتەم

## قەدەر و قەزا (القدر والقضاء)

بەکورتی دەڵێین: ڕای ڕاست کە {جەماوەری مسوڵمانان} لەسەری کۆبوونەوە، دەربارەی قەدەرو قەزا، ئەوەیە کە بڕوایان بە قەدەری خوا هەیە، بە هەموو پلەکانیەوەو، بە هەموو پێکهاتەکانیەوە.

ئنجا ئەگەر تێبینییتان کردبێ، من قەدەرم پێش قەزا خست، چونکە قەدەر یانی: ئەندازەگیریی و، قەزا یانی: جێبەجێ کردن، بەڵام وشەکە وا هاتوە دەڵێن: قەزاو قەدەر، ئەگەرنا لە ڕاستییدا (قدر) ئەندازەگیریی و نەخشەدانانەو، (قضاء)یش جێبەجێ کردنە، کەواتە: ئەندازەگیریی لەپێش جێبەجێ کردنەوەیە، ئێستاش با تەماشای چەند دەقێك بکەین کە خوای زاناو توانا تێیاندا بۆمان باسی پلەکانی، یان پێکهاتەکانی ئیمان بە قەدەر دەکات و، لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەس وشەی (قەدەر)ی بەکار هێناوە.

## پلەو پێکهێنەرەکانی ئیمان بە قەدەرو قەزا:

### ١- زانیـاریی (العلم):

واتە: خوا سبحانە و تعالی زانیاریی بە وردو درشتی دروستکراوەکانی خۆی هەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ١٧٦﴾ النساء.

واتە: خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئەمە چەندان جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە: {خوا بە هەموو شتێك زانایە}، کە ئەمە لە بەڵگە نەویستەکانە لە ڕووی شەریعەتەوە، بەڵام موعتەزیلە پێیان وایە: خوا وردەکارییەکان نازانێ! بۆچی وایان گوتوە؟ گوتوویانە ئەگەر بڵێین: خوا وردەکارییەکانی کردەوەکانی مرۆڤەکان دەزانێ، کەواتە: خۆی نووسیونی، ئینسانەکانیش شتێك کە خوا دەیزانێ و نووسیویەتی، ناتوانن لێی لا بدەن، کەواتە: حاڵەتی جەبر ڕوودەدات، ئنجا بۆ ئەوەی بەرگریی بکەن لە دادگەریی خوا، نکووڵییان کردوە لە زانیاریی خوا بە وردەکارییەکان، گوتوویانە: خوا زۆر لەوە گەورەترە ئەو شتە وردانەی مرۆڤ دەیانکەن، بیانزانێ، خوا زۆر لەوە گەورەترە شتی گچکەو ورد بزانێ![1]، هەڵبەتە ئەو فیکرەیە لە فەیلەسووفەکانی یۆنانەوە هاتوە، بەڵام نەخێر، خوا هەموو شتێك دەزانێ، ئەصڵەن ئەوە بۆ خوا تەواویی (کمال)ە، کە هەموو شتێك بزانێ.

---

(١) دەڵێن: جارێك کابرایەك ئیشێکی هەبوو، چووە بۆ لای پیاوێکی گەورە، پەندەکە بە عەرەبی هاتوە، پیاوە گەورەکە پێی دەڵێ: فەرمووە؟ کابرا دەڵێ: {لی حُوَيْجَة}، واتە: ئیشۆکەیەکم هەیە؟ پیاوە گەورەکەش پێی گوت: {إلتمس له رُجَيْلاً}، واتە: مادام ئیشۆکەیەکت هەیە، پیاویلکەکەیەکی بۆ بدۆزەوە، من پیاوێکی گەورەم، ئیشی گەورە دەکەم، ئنجا موعتەزیلە پێیان وا بووە: ئەگەر بێت و خوا شتی وردو گچکە بزانێ، ئەوە پێیان کەم و کورِییە بۆ خوا!!

٢- نووسین و سەرژمێر (الكتابة والإحصاء):

پلەی دووەم و پێکهاتەی دووەم لە پێکهاتەکانی قەدەر، بریتییە لە نووسین و سەرژمێر کردن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾﴾ يس.

واتە: هەموو شتێکمان لە پێشەوایەکی ڕۆشن {یان ڕۆشنکەرەوە}دا سەرژمێر کردوە.

کردەوەکانی مرۆڤ، هەڵسوکەوتەکانی، هی ژیانداران بەگشتیی: ئینس و جینن، فریشتەکان، دروستکراوەکانی دیکەی خوا، خوا هەموویانی سەرژمێر کردوون، چونکە دەفەرموێ: هەموو شتێکمان سەرژمێر کردوە.

٣- ویستن (المشيئة):

ئەمیش پلەو پێکهاتەی سێیەمی ئیمان بەقەدەرە، خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ التكوير.

واتە: ئێوە ناتانەوێ، مەگەر خوای پەروەردگاری جیهانییان بیەوێ.

واتە: خوا ویستوویەتی ئێمە ویستێکمان هەبێ، ڕووی پێ بکەینە ئەو کردەوانەی کە دەمانەوێ ئەنجامیان بدەین، چاك بن یان خراپ.

ئاوا بە وردیی لێی تێ بگەن! ئایەتەکە مەبەستی ئەوە نیە کە خوا پێتان دەکات، وەك جەبرییەکان دەڵێن، بەڵکو واتە: ئێوە ناتوانن شتێکتان بوێ، مەگەر خوای پەروەردگار ویستبێتی، خواش ویستوویەتی: ئێوە بتوانن شتتان بوێ.

٤- هێنانەدیی، یاخود پەیدا کردن (الخلق):

وەك خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ القمر.

واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروست کردوەو هێناوەتە دی.

ئەم ئایەتە هەم هێنانەدی دەگەیەنێ، هەم ئەندازەگیریی.

٥- جێ بەجێ کردن، (التنفیذ):

خوا فەرمووبەتی: ﴿ وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ۝٥٠ ﴾ القمر.

واتە: (جێ بەجێکردنی ) فەرمانی ئێمە تەنیا یەك شتە، وەك چاو تروووکانێك.

٦- حیکمەت، (الحکمة):

واتە: خوا سبحانە و تعالی هەرچی ئەندازەگیریی بۆ کردوەو دەیهێنێتە دی، هەمووی بەو پەڕی لێزانیی و کارامەییە، خوا فەرموویەتی:

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ۝١٧ ﴾ النساء.

واتە: خوای هەمیشە زانای کارزان بووە.

٧- دادگەریی (العــدل):

یانی: خوای کاربەجێ خاوەنی ئەوپەڕی دادگەرییە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ۝٩٠ ﴾ النحل.

شایانی باسیشە: کە لە هەر کام لە مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ) و، ئەو مەوسووعەیەی کە لە سجندا نووسیومەو[١]، لە (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طحاوي)دا، بە تەفصیلْ باسی ئیمان بە قەزاو قەدەرم کردوە.

بەڵام لێرەدا دەمەوێ شتێك شیبکەمەوە، کە خەڵکی لێیان بۆتە ئیشکال، ئەویش ئەوەیە، ئایا ئەو کردەوانەی ئێمە دەیانکەین، ئەگەر خوای پەروەردگار هەموویانی زانیبن و، هەمووشیانی سەرژمێر کردبن و، هەموویانی نووسرابن و تۆمار کرابن، ئایا چی بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە؟!!

---

(١) {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}. {الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وحديث مختصر حول القدر}.

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە خوا هەموو شتێکی زانیوەو، لەنێو ئەو شتە زانراوانەشدا، کردەوەکانی مرۆڤـ، خوا زانیویەتی ئەو مرۆڤە بە ویستی ئازادانەی خۆی ئەو کردەوانەی ئەنجام دەدا، واتە: زانیاریی خوا، دەرخەر (کاشف)ەو پەیداکەر (مُنشِيء) نیە، بەڵکو زانیاریی خوا، بەدوای ویستی مرۆڤـ دەکەوێ، خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتی: ئەو مرۆڤەی کە دروستی دەکات، بە ویستی ئازادانەی خۆی ئەو کردەوانە ئەنجام دەدات، ئەگەر چاك، ئەگەر خراپ، من لەبەرگی پێنجەمی ئەو مەوسووعەیەی خۆم: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا، چەند وێنەیەکم هێناونەوە، لێرەش ئاماژە بەدوو وێنە دەکەم:

**یەك:** ئەگەر کورسییەکی کارەبایی هەبێ، کەسێك کە کارپێکردنی ئەو کورسییەی بەدەستە بڵێ: هەر کەسێ سواری ئەو کورسییە دەبێ، سووکانی کورسییەکە بەدەست خۆیەتی، بەڵام دوگمەی کار پێکردنەکەی لەدەستی من دایە، سووکانەکە بەدەست ئەو کەسەیە کە سواری کورسییەکە دەبێ، دەچێ بۆ شوێنی باش، یان خراپ، بەکەیفی خۆیەتی، من تەنها ئەوەم لەسەرە، کورسییەکەی بۆ ئیش پێ بکەم، ئایا ئەو کەسەی کورسییەکەی بۆ کار پێکردوە، هیچ جەبری لێ کردوە؟! نەخێر، چونکە بابای سەر کورسیی، سووکانەکە بەدەستی خۆیەتی.

**دوو:** ئەگەر مامۆستایەك لە سەرەتای دەست پێکردنی ساڵی خوێندنەوە، تەماشای قوتابییەکانی بکات و لەدەفتەری تێبینییەکانی خۆیدا بنووسێ: فڵان قوتابی یەکەم دەبێ، فڵان دووەم دەبێ، فڵان لە دوو دەرسان دەکەوێ، فڵان دەرناچێ، لەلای خۆی بیاننووسێ و، لە کۆتایی ساڵدا، هەمان ئەو ئەنجامگیرییەی کە مامۆستاکە نووسیویەتی، وا دەربچێ، ئایا نووسینەکەی مامۆستا بۆتە هۆی ئەوەی ئەویان یەکەم و، ئەویان دووەم و، ئەوی دیکەیان دەرنەچێ؟! بەتەئکید نەخێر، چونکە ئەو تەنیا تەماشای حاڵ و واقیعی قوتابییەکانی کردوەو، گەیشتۆتە ئەو ئەنجام گیرییە، تەماشای کردوە: فڵان باش گوێ دەگرێ و، دەرسەکانی باش ئامادە دەکات، ئەوی دیکە بە شێوەیەکی دی، بەو جۆرە بۆی دەرکەوتوە کە ئەو ئەنجامگیرییە لەلای خۆی بنووسێ.

ئنجا لە ڕاستییدا زانیاریی خواش (ولله المثل الأعلى) بەو شێوەیە، خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتی ئەو مرۆڤانە چۆنن، بەڵام زانیاریی خوا نەبۆتە هۆی ئەوە

کە هەندێکیان چاك بن و هێندێکیان خراپ بن، ئەوە کردەوەکانی خۆیانن، چاك یان خراپیان دەکەن، ئنجا خوا کە بەدیهێنەرە هەر دەبێ بزانێ، مامۆستایەك کە مەخلووقێکە دەتوانێ پێشبینیی بکات کامە قوتابیی دەردەچێ و کامەیان دەرناچێ! ئنجا ئایا ئەو پێشبینییەی ئەو مامۆستایە، بۆتە هۆی ئەوەی جەبر لە قوتابییەکانی بکات؟! بەتەئکید نەخێر.

کۆتایی باسی قەدەر بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دێنین، کە فەرموویەتی: {عَن عُبَادَةِ بْنِ الصَّامِتِ قالَ: سَمِعْتُ رسولَ اللهِ صلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلّم، يقول: (إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ قَالَ: رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)} أخرجه أبو داود برقم (٤٧٠٠)، والبيهقي برقم (٢٠٦٦٤)، والضياء برقم (٣٣٦) وأخرجه أيضا: الطبراني في الشاميين برقم (٥٩)، قال الألباني: صحيح، في سنن أبي داود.

واتە: عوبادەی کوڕی (صامت) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، دەیفەرموو: یەکەمین شتێك کە خوا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، گوتی: چی بنووسم؟ فەرمووی: ئەندازەی هەموو شتەکان بنووسە، تاکو ئاخیر زەمان دێ.

ئنجا بەبۆچوونی من: دەگونجێ قەڵەم هەبێ و شتەکانی هەموو نووسیبن، دەشگونجێ ئەوە تەعبیرێك بێ بۆ نزیك خستنەوە لە عەقڵی ئێمە، کە خوا هەموو شتێکی ئەندازە گیریی کردوە، یان کە باسی نووسین دەکرێ، نووسینی: ئەجەل و ژیان و ڕزق و ...هتد، دەگونجێ فیعلەن بنووسرێ، دەشگونجێ ئەوە تەعبیرێکی ڕەمزیی بێ، دیارە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بەپێی عەقڵی ئێمە ئێمەی دواندوە، وەك چۆن تۆ شتێك دەنووسی، لێت تێکناچێ، زانیارییەکانی خواش ئاوان، هیچ شتێکی لێ تێك ناچێ، بۆیە باسی قەڵەم و نووسین کراوە، دەشگونجێ هەم قەڵەم و هەم نووسینیش هەبن، ئنجا ئەم مەسەلەیە بە نسبەت (لوح المحفوظ)یشەوە هەر وایەو، لێرەدا تەئویل کردن زیانی نیە، مادام تۆ دان بەوەدا بێنی کە خوا هەموو شتێك دەزانێ، وەك نووسیبی و تۆماری کردبێ.

## هەشتەم

## وێکڕا خۆشویستنی هاوەڵان و خزمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ

ئەمیش یەکی دیکەیە لە تایبەتمەندییە فیکریی و ئیمانیی و عەقیدەییەکانی {جەماوەری مسوڵمانان}، کە جیاوازیی ناخەنە نێوان هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خزمەکانی و هەردووکیان خۆش دەوێن، هەڵبەتە هاوەڵان (صحابة) یانی ئەوانەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆیشتوون و بەردەوام بوون، چونکە هەشیانبووە، هەڵگەڕاوەتەوە، وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت هەندێك لە هاوەڵانم دیانەوێ بێن لەسەر حەوزی کەوسەر ئاو بخۆنەوە، فریشتەکان وەك چۆن ئاژەڵێك کە ڕەگەڵ ئاژەڵی دیکە دەکەوێ و، هی خاوەن ئاژەڵەکە نیە دەردەکرێ، ئاوا فریشتەکان دەریان دەکەن و ناهێڵن ئاو بخۆنەوە، منیش دەڵێم: ئەوانە هاوەڵانی منن، لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێ: (أصحابی! أصحابی!)، هاوەڵەکانم! هاوەڵەکانم! لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێ: (أُصَيْحابي، أُصَيحابي)، هاوەڵۆکەکانی من! هاوەڵۆکەکانی من! {یان لەبەر خۆشەویستیی وا بچووکیان دەکاتەوە، یان لەبەر ئەوەی چاکیی

بەدوای نەکەوتوون}، دەفەرموێ: فریشتەکانیش دەڵێن: تۆ نازانی لەدوای تۆ چییان کردوە[1]؟!

ئنجا شیعە فەرموودەیەکی ئاوا دێنن و، دەیکەنە بیانووی ئەوەی کە هەموو هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، بخەنە ژێر نیشانەی پرسیار! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە بیانوو پێ گرتنە، ئەگەرنا ئەوانەی کە هەڵەو پەڵەیان بووەو لایانداوە، دیارن و بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، ئەوانی دیکەش هەموو ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە لەسەر ڕێبازی ئەو ڕۆیشتوون، ئەوە دیارن، دەشگونجێ مەبەست ئەو مونافیقانەبن، کە لە مەدینە لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابوون، ئەوانەیان کە تەوبەیان نەکردوەو بە نیفاقەوە مردوون.

با تەماشای چەند دەقێك بکەین، دەربارەی هاوەڵان و لە برگەی نۆیەمیشدا باسی بنەماڵەو خزمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەین:

١- خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٠٠)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی باش شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازیین، چەند باغێکی بۆ داناون، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، تێیاندا هەمیشەیین، ئەوەش سەرکەوتنی مەزنە.

ئاشکرایە ئەم ئایەتە بەپێزە وێڕای جیلی شوێنکەوتووان (تابعين) هەموو جیلەکانی دیکەی ئوممەتیش دەگرێتەوە، ئەوانەی چاك شوێن کۆچکەران و پشتیوانان دەکەون.

---

(١) صحيح البخاري: رقم ٢٣٠٤.

٢- لە سوورەتی (الحدید) ئایەتی (١٠)دا، خوای بەرزو مەزن فراوانتری دەکات و دەفەرمویّ: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾.

واتە: ئەوانەتان کە پێش (فتح)، {واتە: پێش ئازادکرانی مەککە}، سامانیان بەخشیوەو جەنگیان کردوە {لە پێناوی خوادا}، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا کە دوایی مسوڵمان بوون، یەکسان نین، ئەوانە پلەیان مەزنترە، لەوانەی دوایی ماڵی خۆیان بەخشیوەو جەنگاون {لە پێناوی خوادا}، بەڵام بۆ هەر کامێکیان خوا گفت و موژدەی هەرە باشی پێداون و، خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

٣- لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی (١٨)دا، پۆلێکی دیکە لە هاوەڵان دێنیّ، کە ئەوانیش هەموو ئەوانەی کە کۆمەڵێکی لاڕیّ و ڕێی ڕاست هەتلە کردووی وەك شیعە، دژایەتییان دەکەن، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، دەفەرمویّ:

﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾

واتە: بە دڵنیاییەوە خوا ڕازیی بوو لەو بڕوادارانە کە پەیمانیان لەگەڵ تۆ دەبەست لەژێر درەختەکەدا، خوا دەزانیّ چییان لە دڵدا هەیە، ئارامیی ڕژاندە سەر دڵیان و سەرکەوتنێکی نیزیکی کردە پاداشتیان.

خوا زانی چییان لەدڵدا هەیە! (واتە: دڵسۆزیی و پاکیی و چاکیی و، بەندایەتییان بۆ خوا لەدڵدا هەیە، بۆیە خوا لێیان ڕازی بوو)[1].

ئەگەر تۆ ئیمانداری، دەبیّ هەرچی خوا لێی ڕازییە، تۆش لێی ڕازیی بی، لێڕازییبوونی خواش، مانای ئەوە نیە ئەو هاوەڵانە لە هەڵە پارێزراو (معصوم)

---

(١) یەکیّ لە زانایان دەڵیّ: سەیر ئەوەیە خوا بەو هەموو گەورەییەی خۆیەوە بڵیّ: لەوانە ڕازییم، کەسانیّ هەڵسنەوە بڵێن: ئێمە لێیان ڕازیی نین، بەڵکو قسەشیان پیّ بڵێن، ئەوە ئەوپەڕی گومڕایی و بەدبەختییە!

بووبن، بەڵام بە گشتی باشترینی جیلەکانی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون.

٤- پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن، وەك دەفەرموێ: {لَا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} أخرجه مسلم برقم (٢٤٩٦).

واتە: هیچ کام لەوانەی لەژێر درەختەکەدا پەیمانیان بەست {لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)} ناچنە نێو ئاگر.

ئاشکراشە کە هەر سێ خەلیفە ڕاشیدەکەی - خوا لێیان ڕازیی بێ - (أبو بکرو عمرو علي) لەوێ بوون و، بەڵام عوسمان لەوێ نەبوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عوسمانی ناردبوو بۆ لای قورەیش بۆ ئەوەی پێیان بڵێ: کە ئەوان بۆ شەڕ نایەن، کەچی مسوڵمانان هەواڵیان پێگەیشت کە قورەیش عوسمانیان گرتوە، هەندێ گوتیان: کوشتوویانە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: وەرن بەیعەتم پێ بدەن، ئەگەر عوسمانیان کوشتبێ کە نوێنەری ئێمەیە، ئێمە شەڕیان لەگەڵدا دەکەین، هەموو بەیعەتیان پێدا تەنها یەك نەفەر نەبێ، خۆی لە حوشترەکەی گرتبوو، بۆ ئەوەی پەیمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) نەبەستێ، ئەویش دیارە مونافیق بوو، ئنجا خوا بەدەقی ئایەت دەفەرموێ: بەدڵنیاییەوە خوا لەو بڕوادارانە ڕازیی بوو کە بەیعەتیان بەتۆدا لەژێر درەختەکەدا، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: هیچ کام لەوانەی لەبن سێبەری درەختەکەدا، پەیمانیان لەگەڵ مندا بەست، ناچنە نێو ئاگر، وەك گوتمان: عوسمان لەوێ نەبوو خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: عوسمان لێرە نیە، ئەوە دەستی من لەجیاتی وی، بەیعەتی بەخۆیدا، ئنجا دوایی ئەوانەی لە عوسمان هەڵگەڕانەوە، تەشقەڵەیان پێ کردو دواییش شەهیدیان کرد، یەکێ لە بیانووەکانیان ئەوە بوو دەیانگوت: تۆ بەر ئەو موژدەیە نەکەوتووی کە خوا دەفەرموێ: خوا لەو کەسانە ڕازییە کە لەژێر درەختەکەدا پەیمانیان بە پێغەمبەر

(صلى الله عليه وسلم) داوە! ئەویش گوتی: بەخوا دەستی پێغەمبەری خوا، زۆر لە دەستی خۆم چاکترە، ئەو بیانووەشی بڕین، دیارە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەتەئكید خوا پێی ڕاگەیاندوە، کە ئەو بیانووانە بە عوسمان دەگرن، بۆیە ئەو دووربینییەی کردوە.

٥- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ} أخرجه مسلم برقم (٢٥٤٠)، وابن ماجه برقم (١٦١)، وأخرجه أيضا: الطبراني في الأوسط برقم (٦٨٧).

واتە: جنێو بە هاوەڵانم مەڵێن، جنێو بە هاوەڵانم مەڵێن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێ، ناگاتە مستی یەکێکیان و نیو مستیش {نە دەگاتە مستێکی، نە دەگاتە نیو مستی}.

یەکێکیان، کە مستە گەنمێك یان مستە زێڕێکی بەخشیوە، یاخود نیو مستیش، چونکە ئەوەی ئەوان کردوویانە بەو صافیی و ساغیی و لەو کاتە سەغڵەتیی و تەنگانەیەدا، پاشان ئەوان هەرچی ئۆممەت دەیکات، بەپێی ئەو بنچینە شەرعییەی کە فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ الدَّالَّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ} أخرجه الترمذي برقم (٢٦٧٠)، وقال: غريب.

واتە: کەسێك کە هۆکارو ڕێنیشاندەرە بۆ چاکەیەك، وەك خۆی خێرەکەی ئەنجام دابێ ئاوایە.

هەروەها بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێ: {مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ} أخرجه أحمد برقم (١٩١٧٩)، ومسلم برقم (١٠١٧)، والترمذي برقم (٢٦٧٥)، والنسائي برقم (٢٥٥٤)، وابن ماجه برقم (٢٠٣)، وابن حبان برقم (٣٣٠٨) وأخرجه أيضا: ابن أبى شيبة برقم (٩٨٠٣)، والطبراني برقم (٢٤٣٧)، والبيهقي برقم (٧٥٣٠).

واتە: هەرکەسێك لە ئیسلامدا کارێکی باش بکات، پاداشتی خۆیشی و پاداشتی هەموو ئەوانەشی هەیە، کە کار بەو کردەوەیە دەکەن، بێئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە.

کەواتە: لەسەردەمی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، هەتا دنیا بەکۆتایی دێ، هەرکەسێك چاکەیەك بکات، هاوەڵان پشك و بەشیان تێیدا هەیە، بۆیە لە هەمووان پاداشتیان زیاترە، هیچ کەس پاداشتەکەی ناگات بەهی ئەوان.

لێرەدا دەمەوێ مەسەلەیەك باس بکەم:

شتێك لە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکەوە دەگێڕنەوە، کە گوایە پرسیاری لێکراوە دەربارەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو موعاویە، خوا لێیان خۆش بێ و لێیان ڕازی بێ، بە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکیان گوتوە: چۆن تەماشای ئەو دووانە دەکەی؟

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك گوتوویەتی: ئەو تۆزەی نێو لووتی ئەسپەکەی موعاویە، لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چاکترە! کە من پێم وایە ئەوە قسەیەکی عاتیفییەو هیچ نیە، چونکە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە بۆچوونی من لەلای خوا، زۆر لە موعاویە چاکترە، چونکە موعاویە ڕەنگێکی خراپی ڕشت، هەڵبەتە شتی چاکیشی هەن و حورمەتی خۆی هەیە، هاوەڵ (صحابي)ەو پێشم وا نیە درۆی بەدەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کردبێ، لەو ڕووەوە دەڵێین: دادگەرە، بەڵام لە ڕووی حوکمڕانییەوە، ڕەنگێکی خراپی ڕشت، بەڵام عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەماوەی سی (٣٠) مانگدا، هەرچی لادانێك موعاویەو بەنو ئومەییە کردبوویان، بەپێی توانای خۆی ڕاستی کردەوە، (إبن تيمية) دەڵێ: دوایی (بنو أمية) دەرمانداویان کرد، ئنجا ئەو عومەرە لە حوکمڕانییدا، چۆن لەگەڵ موعاویەدا بەراورد دەکرێ، با هاوەڵیش بێ! ئێمە نابێ بە سۆزو عاتیفەوە تەماشا بکەین، دەبێ وەك قورئان و سوننەت و شەریعەت تەماشای شتان و کەسان بکەین، کێ زیاتر سوودی بووە بۆ مسوڵمانان و بۆ ئیسلام، ئەوەیان لەلای خوا بە حورمەت ترە، با لەدواییشدا بێ، ئەوەی

دیکە با لەپێشەوەش هاتبێ، مادام چاکەکانی وەك هی وی نەبن، دەکەوێتە دوا (الفضل لمن صَدَق لا لمن سبق) فەزڵ هی ئەو کەسەیە ڕاستتری کردوە، نەك هی کەسێك کە پێشتر بووە، بەڵام ئەگەر پێشێش بووبێ و ڕاستیشی کردبێ، ئەوە بەتەئکید کەس ناگاتە پلەی ئەوان، موعاویەش دیارە حورمەت و ڕێزمان بۆی هەیە، بەڵام نە ئەویش و نە هیچ کام لە هاوەڵان پارێزراو نەبوون لە هەڵە.

هەڵوێستی ڕاست و دروست ئەوەیە کە ئێمە ئەو هەموو ئایەتانەی هەن لە مەدحی هاوەڵاندا بەگشتیی، ئێمە ئەو ئایەتانە ئاوا تەماشا بکەین، هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە بە تەئکید زانیویەتی کەسانێك دەبن، قسە بە هاوەڵان دەڵێن، بۆیە فەرموویەتی: جنێویان پێ مەڵێن، ئێوە ناگەنە ئاستی ئەوان، ئا ئەوە هەڵوێستی ڕاستە، بەڵام بە بیانووی ئەوەی کە فلان کەس و فلان کەس هاوەڵن، تۆ بێی هەڵەکانیشیان بۆ پینە بکەی و، سەرەنجام ئیسلام خوارو لار بێتە بەرچاو، وەك ئێستا هەندێك لە حوکمڕانانی هەندێك لە وڵاتانی ئیسلامیی وا دەکەن، کتێبم بینیوە دەربارەی یەزیدی کوڕی موعاویە، گوتوویانە: (أمير المؤمنين، رضي الله عنه)، بەخوا نە خوا لێی ڕازیی بووە، نە ئەمیری ئیماندارانیش بووە، بابی بەزۆر بەیعەتی بۆ وەرگرتوە، چوار ساڵ حوکمی کردو لە کۆتاییدا بەسەرخۆشیی مرد، وەك (الذهبي) لە کتێبی (سِيَرُ أعلام النبلاء)دا هێناویەتی و پێشتر بۆم باس کردن.[1]

ئیمام ئەحمەدیش ئەو پیاوە گەورە، کە زۆر خۆی پاراستوە، عەبدوڵڵای کوڕی لێی دەپرسێ: بابە! ڕەحمەتی خوا بۆ یەزید بنێرم، دەڵێ: (لا ولا كرامة) نەخێر هیچ حورمەتێکی ناگرم، دەڵێ: ئەدی بابە بۆچی لەعنەتی لێ ناکەی؟ دەڵێ: بابی خۆت دیوە لەعنەت لەکەس بکا؟ دەڵێ: نەخێر، دەڵێ: بۆیە لێی ناکەم.[2]

---

(١) لە کتێبی یەکەم، تەوەری یەکەم دا.

(٢) (ابن كثير) لە کتێبی (البداية والنِّهاية) ج٨ ص٢٢٣ دا لە کاتی قسەکردندا لەبارەی فەرموودەی: (من أخاف المدينة ظلماً، أخافَهُ الله وعليه لعنة لله..) وە، گوتوویەتی: (وقد استدل بهذا الحديث وأمثاله من ذهب إلى الترخيص في لعنة يزيد بن معاوية، وهو رواية عن أحمد بن حنبل اختارها الخلال و أبوبكر عبدالعزيز والقاضي أبو يعلى...).

یانی: لەعنەتم لە کەسێ بکردایە، لەویم دەکرد، وریابن! زۆر جاران دەستی سیاسی دەچێتە پشت ئەو مەسەلانەوە: یەزید کە بەرجەستەکەری حوکمڕانیی ستەمکارانەی میراتیی و بنەماڵەییە، حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی دیفاع دەکات لە یەزیدو لە بەنی ئومەییە، ئنجا بابای حوکمڕانی میراتیی و بنەماڵەیی ئێستا، بۆیە بەرگریی لە هەڵوێستەکەی موعاویەو حوکمڕانیی یەزیدی کوڕی دەکات، بۆ پاساودانەوەی حوکمەکەی خۆی، تاکو بڵێ: ڕاست نیە حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی شتێکی ناشەرعیی بێ، ئەوە نیە موعاویەش کە هاوەڵ بووەو یەزیدی کوڕیشی کە کوڕە هاوەڵە، ئنجا ئەو هەموو هاوەڵەش لەوێ بوون و، موعاویەش بەپێی حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی، یەزیدی کوڕی لە شوێنی خۆی دانا! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، چونکە ئەو هاوەڵانە هەموویان بێچارە کرابوون و فشارو هەڕەشەیان لەسەر بوو.

سەیید قوتب جوان دەڵێ: (بەرگریی کردن لە کەسەکان، نابێ ببێتە هۆی بێزراندن و تێکدان و شێواندنی بەرنامە)[1] نابێ بەرنامە بشێوێنی تاکو بەرگریی بکەی لەکەسێکی لادەری خوارو خێچ و لادانەکەشی هەر بۆ بشەرعێنی، چونکە دوایی شەرعەکە لارو خوار دێتە بەرچاو.

**چەند سەرنج و ئاگادارییەکی گرنگ لە بارەی هاوەڵانەوە:**

**یەکەم:** هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، تووشی شەڕو کێشەو کوشتار بوون لە نێو خۆیاندا، ئەوە دیارە، بەڵام ئەوەندە بزانن هەندێك شت گوتراوە و دەگوترێ، کە زێدەڕۆیی زۆری تێدا هەیە، هەتا هەندێك لە زانایانی هاوچەرخیش، یەکسەر لە هەندێك لەو سەرچاوانەوە کە گومانیان تێدا هەیە، یان ئەو سەرچاوانەی کەزۆر شتیان ڕوون و ساغ نەکردۆتەوە، قسەیان لێوە نەقڵ دەکەن، بۆ وێنە: دەڵێن لە شەڕی (جَمَلْ)دا سی هەزار (٣٠٠٠٠) کەس کوژراوە، یان پەنجا هەزار

---

(١) (إن تبرئة الأشخاص لا تساوي تشويه المنهج)، بڕوانە: (العدالة الإجتماعية في الإسلام)، ص١٥٥، ط/ دار الشروق، ١٩٩٥م.

(٥٠٠٠٠) کەس لە شەڕی (صِفِّين)دا کوژراوە! بەڵام ئەو زانیارییانە ڕاست نین و، لەگەڵ ڕێژەی بەشدار بووان لەو جەنگانەدا، لە لایەن مسوڵمانانەوە، هاوەڵان و غەیری هاوەڵان، تێك ناکەنەوە.

**دووەم:** هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لەو ڕووەوە کە فەرموودەیان لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئێمە نەقڵ کردوە، مەگەر یەکێك لە هاوەڵان بە بەڵگە ساغ بێتەوە، کە درۆیەکی کردوەو شتێکی هەڵبەستوە، ئەگەرنا هاوەڵان لەو ڕووەوە کە بەناوی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) درۆیان نەکردوە، یەکدەنگیی زانایانی {جەماوەری مسوڵمانان} کە بە {ئەهلی سوننەت و جەماعەت} ناسراون، لەسەر ئەوە هەیە، واتە: یەکێ لە هاوەڵان ئەگەر هەڵەیەکیشی بووبێ کەم و کوڕییەکیشی بووبێ، بەڵام لەو ڕووەوە کە بە ناوی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) درۆیان نەکردوەو، لەو شتانەدا کە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاویانەتەوە، جێی متمانەن، زانایان لەسەری کۆدەنگن.

**سێیەم:** بە نسبەت ئەوەوە کە هەندێکیان لادان و کەم و کوڕیی و هەڵەو تاوانیان بووە، کە بەتەئکید بووە، بەڵام نابێ بگشتێنرێ بەسەر هەموویانداو، پێویستە هەر کەسە وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بێگومان بناغەو ئەسڵ لە هەر مرۆڤێکدا ئەستۆ پاکیی (براءة الذمة)یە، هەتا بەبەڵگەی ڕوون و بێ چەندو چوون، شتێکی لەسەر ساغ دەکرێتەوە، چ جای هاوەڵان (صحابة) کە خوا بە گشتیی ستایشی کردوون!!.

**چوارەم:** جەنگ و کوشتاری نێوانیان، مەرج نیە هەمووی بە ئیرادەو ویستی خۆیان بووبێ، دەستی پیسی تێدا هەبووە، بۆ وێنە: جەنگی (جَمل) کە تەرەفێکیان دایکمان عائشە خوا لێی ڕازی بێ و تەڵحەو زوبەیر خوا لێیان ڕازی بێ، سەرپەرشتیی ئەو سوپایەیان کرد کە لە مەدینەوە هات بۆ بەصرە، تەرەفەکەی دیکەش دیارە عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە خەلیفەی چوارەمی

پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) خوا لێی ڕازی بێ، لەگەڵ ئەوانەی کە لە خزمەتی دا بوون، ئنجا کۆمەڵی عائیشەو تەڵحەو زوبێر خوا لێیان ڕازی بێ، هاتبوون دەیانگوت: دەبێ ئەوانەی عوسمانیان کوشتوە بە زوڵم، تۆڵەیان لێ بسێندرێتەوەو داوایان لە عەلی دەکرد: تۆڵە لەوانە بستێنەوە، مادام خەلیفەی مسوڵمانانی، کە بە تەئکید ئەویش نکوولّیی نەدەکرد لەوە کە تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە! بەڵام قسەیەکی جوانی دەکرد دەیگوت: (یملکوننا ولا نملکهم) ئێستا ئەوان ئێمەیان بەدەستە، ئێمە ئەوانمان بە دەست نیە، واتە: ئەوان ژمارەیان زۆرە، چونکە دەوری دە هەزار (١٠٠٠٠) کەس دەبوون، ڕۆژێك عەلی خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەوانەتان کە عوسمانیان کوشتوە بەزوڵم، با بێنە ئەم لایە، گوتیان: (کُلُّنا قتل عثمان) هەموومان عوسمانمان کوشتوە!!

ئیدی سەرەنجام گەیشتنە ڕێککەوتن و قەرار بوو بەیانی ئەوانەی کە لە مەدینەوە هاتوون بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، (عەلی)یش خوا لێی ڕازی بێ بگەڕێتەوە بۆ کووفەو پایەتەختی دەوڵەتەکەی و، ئەو شەڕە ڕوو نەدا، بەڵام ئەوانەی کە دەستیان هەبوو لە کوشتنی عوسماندا دوو سەد، (٢٠٠) کەسیان هێنا، سەد (١٠٠) کەس لەولاو، سەد (١٠٠)یش لەولا، لە تاریکیی شەودا شەبەیخونیان کردە سەر یەکدی، دیارە هەر دووسەد (٢٠٠) کەسەکەش هەر هی خۆیان بوون، بەڵام سەد (١٠٠)یان لە تەڕەفی سوپایەکەی عەلییەوە، هێرشیان کردە سەر ئەوانەی تەڕەفی بەصرەو سەدە (١٠٠)ەکەی دیکەش، لەو لایەوە هێرشیان کرد، خەبەریان دایە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، کە ئەوە ئەهلی بەصرە هێرشیان کردە سەرمان! گوتی: ئاخر وا قەرار نەبووو ڕێککەوتنمان کردوە کە نابێ شەڕ بێ! هەروەها هەواڵیشیان دا بە دایکمان عائیشەو تەڵحەو زوبێر، گوتیان: لە لایەن سوپای عەلییەوە هێرشمان کرایە سەر! گوتیان: بڕیار وا نەبوو! گوتیان: بڵێین چی تازە شەڕە بە ملمانەوە بووە! ئیدی بەو شێوەیە شەڕەکە دروست بوو، ئاوا بە دەستی پیس، مەبەستم ئەوەیە کە ئینسان مێژوو چۆنە، با ئاوا بیبینێ.

**پێنجەم:** هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، نابێ زوڵمیان لێ بکەین و، نابێ زوڵمیشیان بۆ بکەین، هەر کەسێکیان کە هەڵەیەکی بووەو لەسەری چەسپاوە، ئەوە هەڵەیە، بەڵام دەبێ وەك خۆی تەماشا بکرێ و، کەسایەتیی و ئیعتیباری ئەو کەسە بە هۆی ئەو گوناح و هەڵەیەوە، نابێ لەبەرچاو ببیزێنرێ، وەك شیعە وا دەکەن، غەڵەتی شیعە (شیعەی دوازدە ئیمامیی) لەوەدایە کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، هەموویان، یاخود زۆربەی هەرە زۆریان، دەخەنە ژێر نیشانەی پرسیارو قسەی هەڵەیان پێ دەڵێن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە: بە دوای هەڵەو کەم و کوڕییاندا دەگەڕێن، باشە ئایا هیچ کەسێکت دەست دەکەوێ هەڵەی نەبووبێ! ئایا عەلی خوا لێی ڕازی بێ هەڵەی نەبووە؟! ئایا ئەوانەی کە شیعە بە پارێزراویان دادەنێن، هەڵەو کەم و کوڕییان نەبووە؟! ئەگەر بڵێن: کەم و کوڕییان نەبووە، دیارە هەموویان پێغەمبەر و مەلائیکەت بوون!! کە بە تەئکید وا نەبووەو کەم و کوڕیی هەر دەبێ، بەڵام دەبێ هەرکەسە کەم و کوڕییەکەی بە قەبارەی خۆی تەماشا بکرێ و، بە هۆی ئەوەوە کە کەم و کوڕییەکیشی هەیە، ئەو هەموو کردەوە باش و خەسڵەتە پەسندانەی، نادیدە نەگیرێن.

# نۆیەم

## هەڵوێستی {جەماوەری موسوڵمانان} دەربارەی خزمان و نزیكانی پێغەمبەر[1] (صلی الله علیه وسلم)

جەماوەری موسوڵمانان باشترین و هاوسەنگترین هەڵوێستیان لە بارەی بنەماڵەو خزم و نیزیكانی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) هەیە با لەو بارەوە تەماشای ئەو دوو كۆمەڵە ئایەتە بكەین:

١- لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتەكانی ژمارە (٣٢ و ٣٣)دا، خوا سبحانه و تعالى هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوا لێیان

---

(١) دوو وشە هەن: ١- (أهلُ البيت)، ٢- (آلُ البيت)، كە لە قورئان و سوننەتدا (آل البيت) نەهاتوە، بەڵكو (آل النبي) هاتوەو، (أهلُ البيت)یش هاتوە، ئنجا (أهلُ البيت) واتە: خزمان و نیزیكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كە لە بنەماڵە و لە چوار چێوەی ماڵی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) خۆیان دەبیننەوە، بەڵام (آل النبي) ئێمە لە (تَحيّات)دا دەڵێین چی؟ (اللهم صلِّ على محمد وآلِ محمد)، ئایا دەڵێین: (وآل بيتِ محمد)؟ (آل) پاڵ دەدرێتە لای كەس (شخص) وەك: (آل محمد)، (آل فرعون)، (آل موسى)، (آل فلان)، بەڵام (أهل) واتە: هاوسەرو خێزان، بۆیەش پاڵدەدرێتە لای ماڵ (بيت) {أهل البيت} بەڵام (آل) یانی: شوێنكەوتووان (أتباع) بۆیەش پاڵدەدرێتە لای شەخس.

ڕازی بێ، دایکانی بڕواداران، دەدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ٣٣ ﴾.

واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)! (ئافرەتانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) ئێوە وەك هیچ كام لە ئافرەتان نین، ئەگەر پارێزكار بن، قسەی نەرم و بەناز مەكەن، كە سەرەنجام ئەوەی دڵی نەخۆشیی تێدا هەیە، تەماعتان تێ بكات و، قسەی باش بكەن و، لە ماڵەكانی خۆتاندا نیشتەجێ بن و، وەك سەردەمی نەفامیی خۆتان مەڕازێننەوە {دیارە ئافرەت لە ماڵێدا خۆی نارازێنێتەوەو، ئەگەر لە ماڵێدا خۆی بڕازێنێتەوە بۆ هاوسەری خۆی، لێی قەدەغە نیە، كەواتە: یانی: بە زۆریی لەماڵەكانی خۆتاندا نیشتەجێ بن و، ئەگەر چوونە دەرێش، وەك سەردەمی نەفامیی خۆتان مەڕازێننەوە}و نوێژ بەرپا بكەن و زەكات بدەن و فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بكەن، بێگومان ئەی ئەهلی بەیت! ئەی خاوەنانی ماڵ! خوا (سبحانه و تعالى) دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ {گوناح و خراپەتان لێ لابەرێ}و بە پاككردنەوە پاكتان بكاتەوە.

هەر بە ئاشكرا دیارە دواندن (خطاب) تایبەتە بە هاوسەرانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، ئەمە شوێنی یەكەم لە قورئاندا كە وشەی (أهل البيت)ی تێدا هاتوە.

٢- شوێنی دووەم لە سوورەتی (هود)دایە، لە بەسەرهاتی ئیبراهیمدا سەلامی خوای لێبێ، كە فریشتە هەواڵی پێدەدەن: هاتوون گەلی لووت بفەوتێنن و، موژدەشی پێدەدەن كە ئیسحاقیان دەبێ و دوای ئیسحاق، یەعقووبیش لە ئیسحاق دەبێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾.

واتە: ژنەکەی (هاوسەری ئیبراهیم کە سارا خاتوونە) وەستا بوو پێکەنی {کە موژدەماندا بەوەی هاتووین گەلی لووت بفەوتێنین}، ئێمەش موژدەمان پێدا کە ئیسحاقیان دەبێ و لە دوای ئیسحاق یەعقووبیشیان دەبێ (واتە: جووتە موژدەیەکیان پێدرا)، ئافرەتەکە گوتی: ئەی هاوار بۆمن! ئایا منداڵم دەبێ کە من بوومە پیرەژن و پیاوەکەشم پیرەو کەوتۆتە تەمەنەوە؟ گوتیان: ئایا لەفەرمانی خوا سەرت سوڕدەمێنێ؟ بەزەیی و بەرەکەت و پیِزی خوا لەسەر ئێوە بێ، ئەی خاوەنی ئەم ماڵە، بە دڵنیایی ئەو (خوا) ستایشکراوی شکۆدارە.

کەواتە: (أهل البيت) بە پلەی یەکەم واتە: ژن و منداڵ، چونکە (أهل) یانی: خاوەن، ئنجا ئایا کێ خاوەنی ماڵەو کێ لە ماڵدایە بە زۆریی، کێ ئیشی ماڵێ دەکات، کێ کابانی ماڵە؟ بێگومان ژن، بۆیە (أهل البيت) بە پلەی یەکەم واتە: ژن و هاوسەر، بەپێی قورئان بێ (أهل) یانی: ژن، هاوسەر، یانی: منداڵ و خزم و کەس و ئەوانەش ناگرێتەوە!

ئنجا ئەوە بۆیە ئاوا بەوردیی باسی دەکەم، چونکە شیعە دەڵێن: لێرەدا (أهل البيت) مەبەست پێی (آل البيت)ە! کە ئەم وشەیە هەر نەهاتوە لە قورئاندا.

**٣-** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکی خۆیدا فەرموویەتی: {أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ تَعَالَى فِي أَهْلِ بَيْتِي} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٢٨٥)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٣٣١٦)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (٢٦٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٢٣).

واتە: خواتان دەخەمەوە یاد دەربارەی نیزیکانی من، ئەوانەی لە چوار چێوەی ماڵی مندان {سێ جاران ئەمەی دووبارە کردەوە}.

شیعە وشەی (آل مُحَمَّد)، - واتە: شوێنکەوتووانی موحەممەد - یان لەگەڵ (أهل مُحَمَّد)دا، - واتە: هاوسەرو خێزانی موحەممەد - تێکەڵ کردوە، ئنجا

هەندێك لە زانایانی {جەماوەری مسوڵمانان}یش کەوتوونە نێو ئەو هەڵەیەی شیعەوە، هەروەك لە شتی دیکەشدا تێیکەوتوون، بۆ وێنە: گوێتان لە کەس بووە بڵێ: ئیمام ئەبو بەکر، هەر دەڵێن: ئیمام عەلی، دەزانن ئەوە لە چییەوە هاتوە؟ شیعە هێندەیان گوتوە: عەلی ئیمامەو ئیمامەو ئیمامە، سێیەکەی دیکە ئیمامەتیان لێ داگیر کردوە! هەندێ لە زانایانی دیکەش، هەر لە خۆوە کەوتوونە ژێر هەژموونی ئەو فیکرەیەو هەر دەڵێن: ئیمام عەلی، ئایا ئەبو بەکر ئیمام نیە، عومەر ئیمام نیە؟ عوسمان ئیمام نیە؟! عەلییش لەسەر سەرمانی دادەنێین و ئیمامە، بەڵام ئیمامی چوارەم و جێنشینی چوارەمی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بۆیە من هەر دەڵێم: عەلی خوا لێی ڕازی بێ، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان، خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە ئەگەر بڵێی: ئیمام، دەبێ بۆ هەموویان وا بڵێی.

بەڵێ وشەی (أهل) واتە: خاوەن ماڵ، کە زیاتر هاوسەر دەگرێتەوە، کوڕو کچیش دەگرێتەوە، بەڵام لە پەراوێزی هاوسەردا.

بەڵام وشەی (آل) لە (آل يؤول أولاً) هاتوە، یانی: (رجع يرجع رجوعاً)، ئنجا (آلْ) بە مانای کەسانێك کە سەر بە کەسێکن، وەك پێشتر گوتم: (أهل) پاڵ دەدرێتە لای (بيت)، بەڵام (آل) پاڵ دەدەرێتە لای شەخص، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾ غافر.

واتە: ڕۆژێك کە ئاخیر زەمان (ساعة) دێ، ئالی فیرعەون بخەنە نێو سزایەکی زۆر بە ئێشەوە.

کەواتە: (آل) واتە: (أتباع)، (خاصة)، (آل الرجل: أتباعه وخاصَّتهُ) واتە: خەڵکە دانسقەکە، کە چاك بەدوای دەکەون و تایبەتن بەوەوە.

شاعیرێکیش لەوبارەوە زۆر جوانی گوتوە:

آلُ النَّبِيِّ هُمو أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ ... مِنَ الأَعَاجِمِ وَالسُّودَانِ وَالْعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إلاَّ قَرَابَتَهُ لَصَلَّى ... الْمُصَلِّي عَلَى الطَّاغِي أَبِي لَهَبِ

واتە: ئالی پێغەمبەر، نیزیکانی و شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەیینی
له عەجـەم و ڕەش پێســتەکان و لە عــــەرەب

ئەگەر ئالی ئەو تەنیا خزمە نزیکەکانی بوونایە (کە بەگۆشت وخوێن دەچنەوە سەری) ئەوە بابای صەڵەواتدەر، صەڵەواتی بۆ ئەبو لەهەبی یاخییش دەنارد!

چونکە (أبو لهب) مامی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) و خزمی نیزیکیەتی.

قسەکەی زۆر ڕاستە، ئالی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوانەن کە شوێنی کەوتوون، ئنجا ئەو خزمانەی باش شوێنی کەوتوون، ئەوە ئەهلیشن و شوێنکەوتووشینی.

ئەگەر تێبینییتان کردبێ، من لە دەرس و وتارەکانمدا دەڵێم: (وصلى الله على محمد وآله أجمعين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين)، کە ئەوە شێوازێکە بۆ خۆم دامهێناوە، کە دەڵێم: (آله أجمعين) هەموو ئەوانە دەگرێتەوە: هاوسەرەکانی و هاوەڵەکانی و، خزمەکانی و شوێنکەوتووانی، هەموویان ئالی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم)، یانی هەر کەس باش شوێنی بکەوێ، ئەوەخەڵکی دانسقە (خاصّة)ی ویە.

پرسیار لە (جعفر الصادق) کراوە، دەربارەی ئەوە کە ئایا ئالی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خزمەکاننی؟ گوتوویەتی: واشەو واش نیە، گوتوویانە: چۆن؟ گوتوویەتی: لە خزمەکانی ئەوەی چاکی شوێن بکەوێ، ئەوە ئالیەتی و ئەوەی چاکی شوێن نەکەوێ، ئالی ئەو نیە، بەڵێ خزمیەتی بەڵام ئالی ئەو نیە[1]!.

ئنجا دەبێ خزمانی سەیدو شێخیش لەوەدا چاو بەخۆیاندا بگێڕنەوە، هی وایان هەیە هەر لە ڕێوە: خۆی بۆ بەهەشتێ داناوە! دەڵێ: چونکە من خزمی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم)، بەڵێ: خزمی وی، بەڵام ئایا شوێنکەوتوویشی و بە نەسەبی تەقواش دەچییەوە سەری؟ ئەگەر وایە زۆر باشە، بەڵام زۆر چاك

---

(١) معجم مفردات القرآن، راغب الأصفهاني، لفظ (آل)، ص٩٨.

بزانە خزمایەتییەکەت سوودت پێناگەیەنێ، ئەگەر شوێنی نەکەوی، ئەوەی کە شوێنیشی بکەوێ، با خزمیشی نەبێ، زیانی پێناگات، بۆیە مسوڵمانان پێش هەموو کەس (أبو بكر)یان دانا، لە جێی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە هۆزی (بني تَيْم) بوو، کەچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە هۆزی (بني هاشم) بوو، پاشان عومەریان دانا، ئەویش خزمی نەبوو، لە هۆزی (بني عَدِي) بوو، دوایی عوسمانیان دانا، کە لە هۆزی (بني أمية) بوو، واتە: ئەو سێیە کە پێش عەلی ئامۆزای خران، هیچیان خزمی نەبوون، بەڵام دیارە لە ڕووی شوێنکەوتن و پەیڕەویی لێکردنەوە، ئەو سێ کەسە، مسوڵمانان بە نزیکتریان زانیون لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ئامۆزەکەی کە عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، خوا لە هەمووان ڕازیی بێ.

ئنجا کۆتایی ئەم باسە، بەم شیعرەی شافیعیی[1] ڕەحمەتیی خوای لێ بێ، دێنم:

إِذَا نَـحنُ فَضَّـلْنَا عَلِـيّاً فـإِنَّنا روافضُ بالتَّفضيلِ عـندَ ذوي الجَهلِ

وفَـضْلُ أَبـي بَكْـرٍ إِذَا مَـا ذَكَرْتُهُ رُمِيـتُ بنـصْبٍ عِنْـدَ ذِكريَ للفَـضْلِ

فَلاَ زِلْتُ ذَا رَفْضٍ وَنَصْبٍ كِلاَهُمَا بِـحُبِّيْهِما حَـتَّى أُوسَّـدَ فِـي الـرَّمْلِ

واتە:

ئەگەر باسی فەزڵی عەلی بکەین، ئەوا ئێمە لەلای خەڵکی نەفام بە خاوەن ڕەفز (رافضة) دادەنرێین و، ئەگەر باسی فەزڵی ئەبو بەکریش بکەم، ئەوە بە

---

(١) بۆ زانیاریتان لەبەر ئەوەی شافیعی لە باپیرەی دووردا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە یەمەن بووە، لەوێڕا کەلەپچەی دەکەن و دەیهێنن بۆ بەغداد، لەسەردەمی عەباسییەکانداو گوتوویانە: بیستوومانە لەبەر ئەوەی تۆش خۆت بە خزمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەزانی، خەریکی ڕاپەڕینی! ئیدی ئەوانەی لەگەڵی بوون، هەموویان کوشتن، بەڵام شافیعیی گوتوویەتی: دەستم بکەنەوە با دوو قسان بکەم، خەڵکێکیش لەوێ گوتوویانە: ئەوە پیاوێکی زۆر زاناو شارەزایە، بیری شیعەگەریی نیە، بەهەرحاڵ دەربازی دەبێ و دواییش دەچێ بۆ میصر.

ئەهلی نەصب (ناصبة)م دادەنێن، بۆیە من بەردەوام بە هۆی خۆشەویستیمەوە بۆ هەردووکیان، تاکو دەخرێمە ژێر لم، هەر بەخاوەن (رفض) و (نصب) دادەنرێم.

کەواتە: هەڵوێستی ڕاست لە بەرانبەر هاوەڵان و خزمانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە: کە ئێمە هەرکام لە هاوەڵان و خزمانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) خۆشبوێن، ئنجا هاوەڵان و خزمەکانی، ئەگەر چاك شوێنی بکەون، ئەوە ئالی پێغەمبەرن.

ئنجا بە دڵنیاییەوە کە شیعە زۆر باسی (أهل البيت) دەکەن، ئەوەش دەستێکی سیاسی لە پشتەوەیە: کاتی خۆی دوای ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفات دەفەرموێ و، مسوڵمانان ئەو چوار خەلیفە ڕاشیدانە هەڵدەبژێرن، دواتر کێشە پەیدادەبێ، چونکە بەنو ئومەییە دەمارو نەعرەی نەفامیی زیندوو دەکەنەوەو، ئەوە زۆر زەق بووەو، لەسەردەمی بەنو ئومەییەدا لە دیوەخانی کاربەدەستاندا شیعری سەردەمی نەفامیی زۆر ڕەواجی هەبوو، هەروەها دووبەرەکیی نێوان هەردووك هۆزی قەیسی و یەمانیی، پاشان کێشەی نێوان (بنو أمية) و (بنو هاشم) دوایی کە عەبباسییەکان شۆڕشیان کرد دژی بەنو ئومەییە، ئنجا کێشە کەوتە نێوان (بنو علي) و (بنو عباس) یان عەلەویی و عەبباسیی، ئنجا عەبباسییەکان لە ئومەوییەکان زیاتر عەلەوییەکانیان دەچەوساندنەوە، ئیدی لێرەوە نەعرەی نەفامیی و خۆهەڵکێشان بە عەشیرەت و بنەماڵەوە، سەری هەڵداو، کەم و زۆر هەمووشیان پێوەی گیرۆدە بوون، چونکە هەندێك لە زانایانی (أهل البيت)یش کە شۆڕشیان بەرپا کردوە لە دژی (بنو أمية)، گوتوویانە: ئێمە گەورەترین، لەبەر ئەوەی نەوەو ڕۆڵەی فلان کەسین! واتە: ئەوانیش هەر گەڕاونەوە بۆ بنەماڵەو خزمایەتیی، عەبباسییەکانیش گوتوویانە: نەخێر، عەبباس مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە، بەڵام عەلی ئامۆزایەتی و مام لەپێش ئامۆزاوەیە! هیچیان نەچوونەوە سەر ئەوەی کامەیان لە ڕووی پابەندیی بە شەریعەتەوە، باشترە! هەموویان کەوتوونە ژێر کاریگەریی ڕەچەڵەك و نەسەبەوە، ئاستی کۆمەڵگا ئەو کاتە وابووە!

دواییش دەبێ سەرنج بدەین: ئایا حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی بۆچی چەسپی؟ ئەو کاتە لە هەموو دنیادا هەر وابوو، لەڕۆم هیرەقل دەمرد، کوڕەکەی لە شوێنی دادەنیشت، لەولا کیسرا دەمرد، ئەگەر کوڕی نەبووایە، کچەکەی لە شوێنی دادەنیشت، کاتی خۆی کیسرا کوڕی نەبوو، {بوران} کە کچی بوو لە شوێنیان دانا، ئنجا ئەوە بوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: {لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٥٣٦)، وَالبُخَارِيّ برقم: (٦٦٨٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٦٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٣٨٨).

واتە: خەڵكێك كە ئافرەتێكیان كردوە بە سەركردەی خۆیان، سەرفراز نابن.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست ئەوە نەبووە، چونكە ئافرەتیان كردۆتە سەركردە، بەڵكو مەبەستی بە دیاریی كراوی گەلی فارس بووە كە سەر فراز نابن، یانی: حوكمی بنەماڵەیی و میراتیی و خێڵەكیی بە گشتیی لە دنیادا هەبووەو، مسوڵمانانیش كارتێكراو بوون بەو عادەت و نەریتەی لە دنیادا باو بووە، دوای ئەوەی ئومەوییەكان كەش و هەوای كۆمەڵگای ئیسلامییان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە گۆڕی.

دەیــەم

## ڕێز لێنانی خوا بۆ دۆستانی (کرامة الأولیاء)

(کرامات) کۆی (کرامة)یە، واتە: ڕێز لێنان، (أولیاء)یش کۆی (وليّ)، واتە: دۆست، نزیك، هەڵبەتە زاراوەکە وا هاتوە، ئەگەرنا ئەو تەعبیرە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتوە، بەڵێ هەر کام لە وشەی: (أولیاء) و (کرامة) لە قورئاندا هاتوون، بەڵام بەم تەعبیرە نەهاتوون: (کرامات الأولیاء).

لەو بارەوەش {جەماوەری مسوڵمانان} ڕێز لێنانی خوا بۆ دۆستەکانی بەگشتیی، بەڕاست دەزانن، کە ئەوانەی دۆستی خوابن، خوا ڕێزیان لێ دەنێ، بەچی ڕێزیان لێ دەنێ؟ بەوەی کە هەندێ شت دەزانن و دەتوانن، کە خەڵکی ئاسایی نایانزانێ و نایانتوانێ.

خوای بەرزی مەزن لە سوورەتی (یونس)دا لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾.

واتە: ئاگاداربن! دۆستانی خوا نەترسیان لەسەرە، نەپەژارە دادەگرن، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو پارێزیان دەکرد، لە ژیانی دنیادا موژدەو دڵخۆشییان بۆ هەیەو لە دوارۆژیشدا، وشەکانی خوا گۆڕانیان بەسەردا نایەت، ئا ئەوە سەرکەوتنی هەرە مەزنە.

لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، لەبەر تیشکی ئەم ئایەتانەدا، باسێکی تێرو تەسەلم کردوە دەربارەی (کرامات أولیاء الله)، هەروەها لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون) و لە کتێبی (گیانی ژیان)یشدا، لەو بارەوە قسەو باسم هەیە.

ئیبنو تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: (وَمِنْ أُصُولِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ : التَّصْدِيقُ بِكَرَامَاتِ الْأَوْلِيَاءِ، وَمَا يُجْرِي اللَّهُ عَلَى أَيْدِيهِمْ مِنْ خَوَارِقِ الْعَادَاتِ، فِي أَنْوَاعِ الْعُلُومِ وَالْمُكَاشَفَاتِ، وَأَنْوَاعِ الْقُدْرَةِ وَالتَّأْثِيرَاتِ، كَالْمَأْثُورِ عَنْ سَالِفِ الْأُمَمِ فِي سُورَةِ الْكَهْفِ وَغَيْرِهَا، وَعَنْ صَدْرِ هَذِهِ الْأُمَّةِ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَسَائِرِ قُرُونِ الْأُمَّةِ، وَهِيَ مَوْجُودَةٌ فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)[1].

واتە: لە بنچینە ئیمانیی و عەقیدەییەکانی {زۆرینەی مسوڵمانان} بە ڕاست دانانی کەرامەتەکانی دۆستانی خوایەو، ئەوەی کە لەسەر دەستیان دەبینرێ لە یاسا دڕەکان {(خوارق العادات) کۆی (خارق العادة)یە، ئەوەی کە شتی ئاسایی نیە} لە جۆرەکانی زانیاریی و بۆ شت دەرکەوتن و لە جۆرەکانی کاریگەرییەکان، وەك ئەوەی کە لە ئۆممەتانی پێشوو گێڕدراوەتەوە، کە لە سوورەتی (الکهف) و غەیری ویشدا هاتوە، هەروەها لە سەرەتای پێشینی ئەم ئۆممەتەش لە هاوەڵان و لە شوێنکەوتووانیان و سەدەکانی دیکەی ئۆممەت و، هەتا ڕۆژی قیامەتیش ئەوە هەر دەبێ.

مەبەست پێی ئەوەیە کە: ئەوانەی دۆستی خوابن و لە خوا نزیك بن، دەگونجێ هەندێ شت بزانن، کە لەڕێی ئاساییەوە نەزانرێ و، دەگونجێ هەندێ شت بتوانن، کە خەڵکی دیکەی ئاسایی نەیتوانێ.

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٣ ص١٥٦.

شایانی باسیشە دۆستانی خوا (أولیاء الله) نە لە توێژێکدان، نە بەرگێك و شێوەیەکی تایبەتییان هەیە بەڵکو: (مَنْ كَانَ مُؤْمِناً تَقِيّاً كَانَ للهِ وَلِيّاً) واتە: هەر کەسێك بڕوادارو پارێزکار بێ، دۆستی خوایە، بەئەندازەی ئەوە کە ئیمان و تەقوای هەیە، چونکە خوا وایان پێناسە دەکات، دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

زانایان دەڵێن: هەرچی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موعجیزە بووە، دەگونجێ بۆ دۆستەکانی خواش هەبێ، بەڵام بۆ ئەوان بە کەرامەت لە قەڵەم دەدرێ.

بەڵام پێم وایە ئەوە هەندێك زێدەڕۆیی تێدایە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەندێ شتی بووە، مەرج نیە بەو شێوەیە بۆ غەیری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ببێ! بەڵام دەگونجێ کەسێك ئازارو گرفتێکی هەبێ، پیاوێکی چاك، ئافرەتێکی چاك، دوعای بۆ بکات، دەست بخاتە سەر شوێنەکەی، شیفای بۆ بێ، ئەو شتانەو هاووێنەکانیان بوون و هەن، هەروەها دەگونجێ دۆستانی خوا، هەندێك زانیاریی تایبەتییان هەبێ و، هەندێك شتیان بۆ کەشف بێ، چ لە حاڵەتی خەودا لەڕێی خەون (رؤیا)وە، چ لە حاڵەتی بێداریی (يقظة)دا، لەڕێی خورپە (إلهام)و فیڕاسەتەوە، کە لەتەوەری یەکەمی ئەم مەوسووعەیەدا، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە.

بەڵام هەر کەس بانگەشەی کرد، مەرج نیە وابێ و، کەسێکیش ئەو حاڵەتەی هەبێ، وەك بانگەشەو خۆ هەڵکێشان باسی ناکات، بەڵکو دەیشارێتەوە، مەگەر بەرژەوەندییەکی شەرعیی لە ئاشکرا کردن و دەرخستنیدا هەبێ.

یازدەیەم

## هاوسەنگیی لە نێوان عەقڵ و نەقڵ دا

خوا پشتیوان بێ ئەم مەسەلەیە (هاوسەنگیی لەنێوان عەقڵ و نەقڵدا) لە تەوەری پێنجەمدا، بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەین، بەڵام لێرەش وەك بنەمایەکی {زۆرینەی مسوڵمانان} باسم کرد، {جەماوەری مسوڵمانان} هاوسەنگیی ڕادەگرن لە نێوان عەقڵ و نەقڵ، یاخود عەقڵ و وەحیی دا، بەو مانایە نا: کە هەردووکیان وەك یەك تەماشا دەکەن، چونکە وەحیی، یان نەقڵ یانی: زانیاریی خوا، ئنجا زانیاریی خوا لە کوێ و، عەقڵی مرۆڤ لە کوێ؟[١].

---

(١) وەك جارێك لە زیندانی ئەمریکییەکاندا، زۆر سەرماو باران بوو، پێش نوێژییم بۆ زیندانییەکان دەکرد، گوتم: پێڵاوەکان دامەنێنن، بە پێڵاوەوە نوێژ دەکەین، یەکێکیان کە بەرپرسێکی گەورەی ڕژێمی پێشوو بوو، شیعەش بوو، گوتی: (هذا ما يَخُشْ في عقلي) ئەوەم لە عەقڵەوە ناچێ! چۆن بە پێڵاوەوە نوێژ دەکرێ؟ {لە دڵی خۆمدا گوتم: خەڵك دەچێتە مزگەوتەکانتان، بۆنیان لێ دێ، لەبەر ئەوەی پێتان ناشۆن}، گوتم: ئاساییەو دەتوانی پێڵاوەکانت دابنێی، ئیدی نوێژەکەمان کرد، دوایی برادەرەکانی لێی توورە بوون گوتیان: چۆن شێخ دەڵێ: پێڵاو دامەنێن بۆ ئەوەی سەرماتان نەبێ، تۆ دەڵێی لە عەقڵمەوە ناچێ، تۆ چی دەزانی؟ ئاوا سەرزەنشتیان کردو، منیش گوتم: فلان کەس! گوتی: بەڵێ، گوتم: دەزانی عەقڵی من و تۆ لە چاو زانیاریی خوا چەندە؟ گوتی: نەخێر نازانم، گوتم: منیش هەر نازانم، بەڵام دەتوانم بۆت وەنیزیك بخەم: عەقڵی جەنابت وەك پەرداخێك وایەو، زانیاریی خواش وەك

هەر لە دێر زەمانەوە، لەسەردەمی سەرهەڵدانی موعتەزیلەوە، کێشە لە نێوان عەقڵگەراو دەقگەرا (العقلانیون والنصوصیون)دا هەبووە، یانی: ئەوانەی کە عەقڵ زاڵ دەکەن بە دەقداو، ئەوانەی دەق زاڵ دەکەن بەسەر عەقڵدا، کە ئەوە وەك مەسەلەی ژن سالاریی و پیاو سالارییم، لە کۆمەڵگادا دێتە بەرچاو، لە بواری کۆمەڵایەتییدا، کە لە ڕاستییدا ئیسلام نە دەفەرموێ: ژن سالاریی و، نە دەفەرموێ: پیاو سالاریی، بەڵکو دەفەرموێ: شەرع سالاریی، هەروەها لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ دەوروبەردا، نەرمڕەویی و توندڕەویی، میانەڕەویی و تیژڕەویی، نەخێر، بەڵکو شەرعڕەویی، شەرع چی گوت، وا دەکەین، لەو شوێنەی شەرع فەرمان دەکات، توند بین، دەبێ توند بین و، لەو شوێنەی دەفەرموێ: خێرا بڕۆ، دەبێ خێرا بڕۆی، ئەگەر گوتیشی ڕاوەستە، دەبێ ڕاوەستی، نەك بڕیار بدەی: کە هەر دەبێ نەرم و نیان بی، یان: هەتا کۆتایی هەر میانەڕەو بی، بەڵێ میانەڕەو ئەگەر مەبەست پێی حاڵەتی هاوسەنگیی بێ، بەڵێ، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە زبریی و، توندییت نەبێ و، هەمیشە هەر لێدراوبی و کوژراوبی، هەرگیز لێنەدەی و نەکوژی، خوا وای نەفەرمووە، خوا دەفەرموێ:

﴿ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ ﴿١١١﴾ ﴾.

دەکوژن و دەشکوژرێن، لە خەڵکیش دەدەن و لێشیان دەدرێ، هەڵبەتە لە شوێنی خۆیداو لە چوار چێوەی شەرعدا.

ئێستاش با تەماشای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە بکەین:

١- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٤٢)دا، خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی کۆمەڵێك یاساکانی بواری کەسێتیی دەکات، دەفەرموێ:

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾.

---

دەریا وایە، ئنجا وەك چۆن ئاوی دەریا لە پەرداخێکدا جێی نابێتەوە، ئاواش عیلمی خواش لە عەقڵی تۆدا جێی نابێتەوە، ئنجا ئایا دەبێ لەبەر ئەوەی ئەو عیلمە لە عەقڵی ئێمەدا جێی نابێتەوە ڕەفزی بکەین؟ گوتی: نەخێر.

واتە: ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بفامن.

کەواتە: خوا سبحانە و تعالی دەیەوێ ئێمە بفامین، دەیەوێ ئێمە عەقڵ بەکاربێنین، چونکە (لعلَّ)ە، بۆ ئومێدو پێ خۆشبوونە، خوا پێی خۆشە، عەقڵمان بەکاربێنین.

٢- لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٠٦)دا، دەفەرموێ:

﴿ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِیَ إِلَیۡكَ مِن رَّبِّكَۖ ﴿١٠٦﴾﴾.

واتە: شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت نێردراوە.

کەواتە: خوای دادگەر هەم فەرمانمان پێدەکات عەقڵی خۆمان بەکاربێنین، هەم فەرمانیشمان پێدەکات شوێن وەحیی بکەوین، کەواتە: شوێنکەوتنی نەقڵ و، بەکارهێنانی عەقڵ، دوو ڕووی دینداریین، دینداریی تەندروست و ڕێك، ئەوەیە کە هەم بە دوای وەحیی بکەوین، هەم عەقڵ بەکاربێنین و، عاقڵانە شوێن وەحیی بکەوین.

جاری دیکەش باسم کردوە: نامیلکەیەکیان لەسەر من نووسیبوو، ناوونیشانی نامیلکەکە ئاوا بوو: {ئێمە دەبێ بۆ تێگەیشتنی قورئان، عەقڵی خۆمان بەکاربێنین}!![1]، بۆیان هێنام گوتیان: ئەوە ڕەخنەیە لە تۆ گیراوە، دەڵێ: فلان کەس گوتوویەتی: دەبێ عەقڵی خۆمان بەکاربێنین، بۆ تێگەیشتنی وەحیی و شوێنکەوتنی ئایین، گوتم: ئنجا هەر وایە، ئەدی خۆ بەبێ عەقڵیی بە دوای ئایین ناکەوین! بۆیە ئەمە پێویست بە ڕەت دانەوە ناکات، چونکە هەر لێی حاڵی نەبووە، دیارە خوای بەرز ئەوەی عاقڵ نەبێ، تەکلیفی لێ ناکات (العقل مناط التكليف) عەقڵ، ئەرکی شەرعیی پێوە بەستراوە، ئەگەر کەسێك شێت بێ، تەکلیفی شەرعیی لەسەر نیە، منداڵ بە هەمان شێوە، هەروەها ئەوەی بێ هۆش بێ، تەکلیفی شەرعیی لەسەر نیە، وەك لە فەرمایشتەکاندا هاتوە.

---

(١) واتە: ئەوانەی نامیلکەکەیان نووسیبوو، هەر قسەیەکی خۆمیان کردبوو بە ناوونیشان، بەڵام نیشانەی سەرسوڕمان (!)یان لەبەرانبەر قسەکەی مندا دانابوو، گوایە قسەیەکی هەڵەو ناشەرعییم کردوە.

(إبن خلدون) ڕەحمەتی خوای لێبێ، عیبارەتێك دێنێ، پێم جوانە، هەرچەندە تێبینییم لەسەر هەندێكی هەیە، دەڵێ:

(العقل ميزان صحيح، فأحكامه يقينية لا كذب فيها، غير أنك لا تطمع أن تزن به أمور التوحيد والآخرة، وحقيقة النبوة، وحقائق الصفات الإلهية، وكل ما وراء طوره، فإن ذلك طَمَعٌ في محال، ومثال ذلك مثال رجل رأى الميزان الذي يوزن به الذهب، فطمع أن يَزِنَ به الجِبالَ، وهذا لا يَدلُّ على أن الميزان في أحكامه غير صادق، لكن للعقل حد يقف عنده ولا يتعدّى طَوْرَه، حتى يكون له أن يحيط بالله وبصفاته، فإنه ذرة من ذرات الوجود الحاصل منه)[١].

واتە: هۆش تەرازوویەكی ڕاستە، بڕیارەكانیشی جێی دڵنیایین، درۆیان تێدا نیە،[٢] بەڵام ئەوەندە هەیە تۆ نابێ ئومێدی ئەوەت هەبێ، كە بەو عەقڵەی خۆت كارو باری خوا بەیەكگرتن و، ڕۆژی دوایی و، ماهیەتی پێغەمبەرایەتیی و، جەوهەری سیفەتەكانی خوا سبحانە و تعالی، بەو عەقڵە هەڵسەنگێنی، هەروەها هەموو ئەو شتانەی كە لەپشت مەودای عەقڵەوەن، ئا ئەوە، ئومێدەوار بوونە بە شتێك، كە مەحاڵە، وێنەی ئەمەش وەك پیاوێك وایە، تەرازوویەك بێنێ كە: زێڕی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، تەماع بكا كە بەو تەرازووە چیایەكان هەڵسەنگێنێ {دیارە تەرازوویەك كە بۆ كێشانی زێڕ دروست كراوە، چیای پێ هەڵناسەنگێنرێ}، ئنجا كە ناتوانێ چیا هەڵسەنگێنێ، ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی كە یاساكان و بڕیارەكانی ئەو تەرازووە ناڕاستن، عەقڵیش لە شوێنێك دەوەستێ و ناتوانێ ئەو هێڵە ببەزێنێ، بەشێوەیەك كە دەوری سیفەتەكانی خواو دەوری خوا بدا، چونكە عەقڵ گەردێكە لە گەردەكانی بوون، كە لە خواوە هاتوە.

---

(١) مقدمة، ص ٣٣٣-٣٣٤.

(٢) تێبینییەكەم لێرە دایە: كە هەموو عەقڵێك وا نیەو، هەموو جارێكیش عەقڵ بڕیارەكانی جێی دڵنیایی نین و، ئەوەش نیە بڵێی تێیدا بە هەڵەدا نەچێ، زۆر عەقڵ بە هەڵەدا دەچن، جاری وایە عەقڵی فەیلەسووفەكان، بەڵكو عەقڵی زانایانی ئیسلام، ناپێكێ.

(بەرگسۆن)[1] کە زۆر بەرگریی کردوە لە ڕووح و عەقڵ و ئیلهام، بیردۆزەی (حَدْس)ی هەیە، واتە: ڕاستەوخۆ پەی بەشت بردن، وێنەیەکی جوان دەهێنێتەوە دەڵێ: عەقڵ لەچاو نهێنییەکانی بوون، چ جای خاوەنی بوون، کە خوایە سبحانە و تعالی، وەك ئەو دەنکە چەوە وایە، کە شەپۆلی دەریا فڕێی دەداتە سەر کەنارێك، ئەو دەنکە چەوە، چۆن دەتوانێ لە دەریاو شەپۆلەکانی حاڵی بێ؟

خوێنەرانی بەڕێز! هەموو ئەوانەی بەهەڵەدا چوون، لە سۆنگەی ئەوەوە بووە: بارێکیان لە عەقڵ بار کردوە کە نایتوانێ، هەربۆیەش فەیلەسووفەکانی یۆنان و غەیری یۆنانیش، کاتێ ویستوویانە خوای بەرزو مەزن وێنا بکەن[2]، زۆر بۆچوونی سەیرو سەمەرەیان باس کردوون، هەیانە وەك: فیساغۆرس، گوتوویەتی: خوا ژمارەیە.

هەیانە گوتوویەتی: خوا چوار توخمەکانە: ئاوو، ئاگرو، باو، گڵ!

سوقراط و ئەفلاتوون و ئەرستۆ، کە لە هەموویان عاقڵتر بوون، گوتوویانە: خوا ئەو بوونەی دروست کردوەو، لێی گەڕاوەو لە وردەکارییەکانیدا هیچی لەبارەوە نازانێ.

ئنجا موعتەزیلەش لێرەوە ئەو فیکرەیان هێناوە، بۆیە بەڕاستی دەبێ وریا بین! کە عەقڵ لەو شوێنەدا کە بڕ دەکات و، ئەوەندەی کە دەرکی دەکات، ئیعتیباری بۆ دابنێین، بەلام ئەوەی کە دەرکی ناکات، دەبێ لە سنووری خۆی بوەستێ، هەڵبەتە دوایی لە تەوەری پێنجەمدا وردتر باسی عەقڵ و نەقڵ دەکەین.

---

(١) برجسون هنري لوي (١٨٥٩-١٩٤١) فەیلەسووفێکی فەڕەنسییە. بڕوانە: الموسوعة الفلسفية المختصرة، ص ٨٧-٩١.

(٢) لە مەوسووعەی: (دەرەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا) کە - پەنجا ئاڵقەی (٤٠-٤٥) خولەکییە- بە درێژیی لە بارەی دەستە پاچەیی فەلسەفەو فەیلەسووفەکانەوە، لە بەرانبەر ناسینی خوادا، قسەمان کردوە، کە ئێستا لە ژێر چاپە و، بەدەنگ و وێنەشەوە بڵاوەکرێتەوە.

دوازدەیەم

## وەرگرتنی هەواڵی جۆری (الآحاد)
## مادام ئۆممەت قبووڵی کردبێ، لەبواری عەقیدەدا

{جەماوەری مسوڵمانان} ڕایان وایە: هەر هەواڵێك لە پێغەمبەرەوە هاتبێ (صلى الله عليه وسلم) واتە: فەرمایشتەکانی، با لە جۆری ئاحادیش بن، مادام ئۆممەت بە گشتیی قبووڵی کردبێ و پێچەوانەی عەقڵ نەبێ و پێچەوانەی نەقڵ[1] نەبێ و، پێچەوانەی واقیع نەبێ، ئەوە لەبواری عەقیدەشدا کاری پێ دەکرێ، چونکە هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە فەرموودەی ئاحاد لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، لەبواری یاسا شەرعییەکانی دیکەدا، وەردەگیرێ، موعتەزیلەو غەیری موعتەزیلەش لەسەر ئەوە یەکدەنگن، بەڵام {جەماوەری مسوڵمانان} دەڵێن: لەبواری عەقیدەشدا وەردەگیرێ، کە هەر ئەوەش ڕاستە.

(عبدالله بن يوسف الجديع) ئاوا پێناسەی فەرموودەی: (الآحاد) دەکات دەڵێ:

{الآحادُ لُغَةً: جمعُ (أحد) وهو بمعنى (واحد)} واتە: (آحاد) لە زماندا کۆی (أحد)ە، کە بە مانای یەکێکە.

---

(١) واتە: قورئان، یان جۆری موتەواتیر لە سوننەت.

هەڵبەتە فەرمایشتێك کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی و بەتەواتور بە ئێمە نەگەیشتوەو بە شێوەی ئاحاد پێمان گەیشتوە، مەرج نیە گێڕەرەوە (راوي)کەی هەر یەکێ بێ، لەوانەیە دوو، سێ، چوار بن، بەڵام نەگەیشتۆتە تەواتور.

{واصطلاحًا: ما لـمْ يجمعْ شُروطَ التَّواتُرِ} واتە: لە ڕووی زاراوەییەوە (آحاد) ئەوەیە کە مەرجەکانی تەواتوری تێدا کۆ نەبووبنەوە.

(تەواتور) ئەوەیە کە: کۆمەڵێك شتێکیان لە پێغەمبەری خوا بیستبێ، یان بینیبێ، کە نەگونجێ درۆ بکەن، ئەوانەش بە کۆمەڵێکی دوای خۆیان گەیاندبێ، بەم شێوەیە تاکو گەیشتۆتە ئێمە، بەجۆرێك کە ئێمە دڵنیابین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، یان کردوویەتی.

دوایی دەڵێ: {وهوَ حُجَّةٌ مُعتبرَةٌ في الشَّرعِ يفيد العلم والعمل، هذا الَّذي كان عليه سلفُ الأُمَّةِ، أنَّ خبر الواحدِ الصَّحيحِ حُجَّةٌ في إفادَةِ العلمِ والعملِ، ولا فرقَ فيمَا يُستفادُ به مِمَّا يتَّصلُ بعملِ القلبِ أو عمَلِ الجوَارِحِ، فما تثبتُ بِهِ الطَّهاراتُ والنَّجاساتُ، وما تصحُّ الصَّلاةُ به وما تَبْطُلُ، وما يحلُّ وما يحرُمُ، يثبتُ به الإيمانُ بأنَّ من أسماء اللهِ تعالى (الجميل)، وبأنَّ ملكينِ يسألانِ العبْدَ في قبرِهِ، يُقالُ لأحدِهمَا (مُنكرٌ) وللآخرِ( نكيرٌ)، {سنن الترمذي: برقم (١٠٧١)} وهذا المسلكُ في التَّفريقِ بين العقائدِ والشَّرائعِ بِدْعَةٌ دخيلةٌ، تأثَّرَ بها كثيرٌ من المتأخرينَ المُنتسبينَ للسُّنَّةِ، لأنهم وجدُوا أخبارَ الآحادِ توصفُ بالظَّنِّ، وهذا إطلاقٌ مُوهِمٌ ليسَ بِجيِّدٍ، فإنَّ العلمَ يصحُّ فيه الإكتفاءُ بالدَّلائلِ الظَّاهِرَةِ، وهوَ يتفاوتُ قوَّةً بحسبِ قوَّةِ البُرهَانِ وظُهورِهِ، وليسَ مُطلقُ الظَّنِّ مقبولاً، إنَّما يُقبلُ الظَّنُّ الرَّاجحُ إلى درجَةِ اليقينِ، وذلك لا يحصلُ في الأحاديثِ إلاَّ بشُروطٍ شديدَةٍ، ولعلَّهُ من الجديرِ بالمُلاحظَةِ في هذه المسألةِ، أن يُلغَى استخْدَامُ عبارةٍ (حديثُ الآحادِ يُفيدُ الظَّنّ الرَّاجحَ)}[1].

---

(١) تيسير أصول الفقه، عبدالله بن يوسف الجديع، ص ١٤٠-١٤٣، هەروەها بڕوانە: أخبار الآحاد في الحديث النبوي: حجيتها، مفادها، العمل بموجبها، عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين.

واتە: فەرموودەی ئاحاد بەڵگەیە لە شەرعداو ئیعتیباری پێ دەکرێ، هەم زانیاریی دەگەیەنێ، هەم کردەوەش {واتە: هەم لە بواری عەقیدەدا پشتی پێ دەبەسترێ، هەم لە بواری یاسا کردەییەکاندا}، پێشینی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) {سەرەتای ئۆممەت} لەسەر ئەوە بوون، {واتە: هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان}، ئەوەی کە لە فەرموودەی ئاحاد وەردەگیرێ، جیاوازیی ناخرێتە نێوان ئەوەی کە پەیوەندیی بە کردەوەی دڵەوە هەبێ، یان کردەوەی ئەندامەکانەوە، چونکە ئەوەی کە مەسەلەی پاك و پیسییەکانی پێ دەچەسپێ و، ئەوەی کە نوێژی پێ دروست دەبێ، یان نوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوەو، ئەوەی کە پێی دەزانرێ ئەو شتە حەڵاڵە، یاخود حەرامە، هەموو ئەو فەرموودانەی ئەو شتانەیان پێ دەچەسپێ، ئەوەشیان پێ دەچەسپێ کە پەیوەندیی بە ئیمان و عەقیدەوە هەیە، وەك ئەوە کە یەکێ لەناوە جوانەکانی خوا، بریتیە لە (الجمیل) {کە لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، کە دەفەرموێ: {إنَّ الله جمیلٌ یحب الجمال} رواه مسلم: ٩٢، واتە: خوا جوانەو جوانیی خۆش دەوێ}.

هەروەها کە دوو فریشتە لە گۆڕدا لە مرۆڤ دەپرسنەوە، بەیەکێکیان دەگوترێ: (منکر) ئەوی دیکەش (نکیر)، {سنن الترمذي: بە ژمارە ١٠٧١}.

{یانی: ئەگەر ئێمە بڵێین: ئیمانمان بە مونکەرو نەکیر هەیە، لەبەر ئەوەی لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، شتێکی چاکمان کردوە، مادام فەرموودەکە ڕاست بێت}[1].

ئنجا ئەو ڕێچکەیە کە جیاوازیی دەخاتە نێوان ئەو شتانەی کە لەبواری عەقیدەدان و، ئەو شتانەی کە لەبواری هەڵس و کەوتەکاندان، ئەوە داهێنراوێکە تازە هاتۆتە نێو ئیسلامەوەو، زۆرێك لەوانەی کە پاڵدراونەتە لای ئەهلی سوننەت لە دوا دواییەکان (متأخرین) پێی کارتێکراو بوون، چونکە تەماشایان کردوە: فەرموودەکانی ئاحاد بەوە وەصف کراون گوتوویانە: هەواڵی ئاحاد تەنیا گومان

---

(١) ئەوەی نێوان ئەو جۆرە کەوانانە {} زیادەی خۆمە.

دەگەیەنێ، کە ئەوەش قسەیەکە ئینسان دەخاتە هەڵەوەو، تەعبیرێکی باش نیە، چونکە زانیاریی هەبوون بە شتێك، جاری وا هەیە هەر بەبەڵگە ئاشکرایەکان ئیکتیفا دەکرێ، کە ئەویش لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەگۆڕێ، بەپێی ئەوە کە بەڵگەکە تا چ ڕاددەیەك ئاشکرایە، تا چ ڕاددەیەك پەنهانە، ئنجا ئەوەش ڕاست نیە کە: گومان بەڕەهایی وەربگیرێ، بەڵکو گومانی زاڵ وەردەگیرێ، کە لە پلەی یەقین نزیك بووبێتەوە، ئەو گومانە زاڵەش کە لە پلەی یەقین نزیك بۆتەوە، تەنیا لەو فەرمایشتانەدا دەستگیرمان دەبێ، کە چەندان مەرجی قورسیان تێدان، {کەواتە: هەر شتێ بەناوی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گوترا، گومانێکی زاڵی نزیك لە یەقین نابەخشێت، تاکو پشتی پێ ببەستین، لەبواری عەقیدەدا}.

شایانی باسە دەبووایە ئەوە تێبینیی بکرێ لەو باسەدا، کە ئەو عیبارەتە بەکار نەهێنرێ کە دەگوترێ: فەرموودەی ئاحاد گومان، یان گومانی زاڵ دەگەیەنێ، {چونکە جاری وایە فەرموودەکە جۆری ئاحادە، بەڵام دڵنیای کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، لەبەر ئەوەی ئۆممەت، هەر لە سەرەتاوە بەهاوەڵان و شوێنکەوتووانیشەوە، قبووڵیان کردوە، لەوانەیە بۆ یەکێ جێی دڵنیایی بێ و، بۆ ئەوی دیکە جێی دڵنیایی نەبێ، ئنجا ئەوەی کە بۆی جێی دڵنیاییە، بەکاری دەهێنێ}.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە: ئایا ئەگەر کەسێ گوتی: بڕوام بەو دەقانە نیە کە دەربارەی مەهدیی هاتوون، یان دەربارەی دەججاڵ، یان دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسا سەلامی خوای لێبێ، هەڵوێستمان چییە؟

دەڵێین: ئەگەر بڵێ: بڕوام پێیان نیە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووني، ئەوە پێی کافر دەبێ، بەڵام ئەگەر بڵێ: بڕوام نیە ئەوە پێغەمبەری خوا فەرموویێتی، دەڵێین: شتێکی باشی نەکردوەو بەهەڵەدا چووە، چونکە ئەوە لەسەرەتای ئۆممەتەوە ئەو فەرمایشتانە هاتوون و، زانایان باسیان کردوون، چۆن لەخۆڕا تۆ تانەیان لێ دەدەی، هەر لەبەر ئەوەی لە عەقڵتەوە ناچن؟! بەڵام ناتوانین حوکمی کافر بوونی بەسەردا بدەین، هەتا مامۆستای

گەورەی کۆیە لە تەفسیرەکەیدا لە باسی (دابة الأرض) کە لە قورئاندا هاتوە[١]، دەڵێ: {وای تێدەگەم ئەو شێخە ساختانەن کە بەدێیاندا دەگەڕێن، خەڵکی دەکەنە دەروێش} بەتەئکید مامۆستا نەدەبوو وای گوتبایە، بەڵام ئەو هێندەی ڕق لە شێخی ساختە هەڵساوە، لە کاردانەوەی ئەواندا، عاتیفە زۆری بۆ هێناوەو (دابة الأرض)ی بەوە تەفسیر کردوە، کە بەتەئکید وانیە.

## بەڵگەکانی پشت پێ بەسترانی فەرموودەی ئاحاد بە گشتیی:

(عبدالله بن یوسف الجدیع) چەند بەڵگەیەك دێنێتەوە، کە زانایانی دیکەش ئەو بەڵگانە هەر دێننەوە، دەربارەی ئەوە کە هەواڵی ئاحاد ئیعتیباری پێ دەکرێت، ئەگەر مەرجەکانی تێدا هاتبنە دی، چ لەبواری عەقیدەدا، چ لەبورای هەڵس و کەوتەکاندا، بەڵگەکانیش ئەمانەن:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (١٢٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

واتە: دەبووایە لە هەر کۆمەڵێکی زۆری مسوڵمانان، کەمێکیان دەربچن، بڕۆن بۆ شارەزا بوون لە ئاییندا، دوایی خەڵکەکەی خۆیان وریا بکەنەوە، هەر کات گەڕانەوە بۆ لایان، تاکو ئەوانیش وریایی خۆیان وەربگرن {تووشی ناشەرعیی و هەڵەو پەڵە نەبن}.

دەڵێ: {الطَّائفةُ: الواحدُ فصاعدًا، والكفايةُ تحصلُ بواحدٍ يرحلُ فيتفقَّهُ فيعودُ إلى قومِهِ وعشيرتِهِ مُبلِّغًا معلِّمًا نذيرًا، فَتَصِحُّ نِذارتُهُ شرعًا وتلزَمُهُم حُجَّتُهُ، وهي خبرُ آحادٍ}[٢].

---

(١) سوورەتی (النمل) ئایەتی ژمارە (٨٢).

(٢) سەرچاوەی پێشوو ص١٤١.

(الطائفة): یەکێك یان زیاترە، بەڵام بەیەك کەسیش کە بچێ گەشت بکات، دوایی بگەڕێتەوە بۆ لای گەلەکەی و هۆزەکەی، ئاگاداریان بکاتەوەو فێریان بکات و وریایان بکاتەوە، لە ڕووی شەرعەوە، وریا کردنەوەکەی بۆیان دروستەو لەسەریشیان دەبێتە بەڵگە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەواڵەکەی لە جۆری ئاحادە.

٢- خوا سبحانه و تعالى لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (٦)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ٦ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر فاسیقێك هەواڵێکی بۆ هێنان، ڕوونی بکەنەوە.

دەڵێ: {فأمرَ بالتَّثبُّتِ في قَبُولِ خبرِ الفاسقِ، ممَّا دلَّ بمفهومهِ على قبولِ خبرِ العَدْلِ}، خوا فەرمانی کردوە بەبەرچاو ڕوونبوونەوەو لێکۆڵینەوە، لە وەرگرتنی هەواڵی بابایەکی لاڕێ و گوناهباردا، ئەمەش چەمکەکەی دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات {کە ئەگەر هەواڵی بابایەکی (فاسق) پێویستیی بەوە بێ، ساغ بکرێتەوەو لێ بکۆڵرێتەوە داخۆ ڕاست دەکات یان نا؟} بابایەکی دادگەر کە درۆی لێ نەزانراوە، دەبێ هەواڵەکەی لێ وەربگیرێ {پێویست بە تێوەڕامان (تثبُّت) و ڕوونکردنەوە (تَبيُّن)یش ناکات}.

٣- {تواترَ أنَّ النَّبـيَّ (صلى الله عليه وسلم) كان يبعثُ أُمرَاءهُ وقضاتِهِ وسُعاتِهِ، وهم أفرادٌ، فيلزمُ النَّاسَ الَّذين أُرسلوا إليهِم، ماجاءُوهُم به من العِلمِ، كما بعثَ مُعاذًا إلى اليمنِ، وبعثَ غيَرهُ إلى غيرِهِ} واتە: بەتەواتور بە ئێمە گەیشتوە کە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرماندەکانی خۆی و قازییەکانی خۆی و ئەوانەی زەکات کۆدەکەنەوە، دەیناردن، ئەوانەش هەموویان یەك، یەك بوون، خەڵکێکیش کە ئەوانەیان دەچوونە لا، پابەند دەکران بەوەوە کە ئەو زانیارییەی لەڕێی ئەو کەسەوە پێیان گەیشتوە، وەری بگرن، وەك چۆن (مُعاذ)ی نارد بۆ یەمەن و، غەیری ئەویشی نارد بۆ شوێنانی دیکە.

٤- {قبولُ خبرِ الشُّهودِ وهُم آحادٌ، بناءً على رُجحانِ صِدْقِهِم وعدالتِهِمْ، واجبٌ شرعًا، مع أنَّ أمرَ الصِّدقِ والعدالةِ فيهم مظنونٌ، وذلك لجوازِ اتِّفاقِهِم على الكذبِ في الباطِنِ رغبَةً أو رهبةً، فقبوُل الرِّوايةِ أولى، فإنَّ داعيةَ الكذبِ مِمَّن عُرِفَ بالصِّدقِ، ضعيفةٌ} واتە: شایەدانێك كە شایەدیی دەدان و گومانێكی زاڵمان هەیە كە ڕاست دەكەن، دەبێ شاهێدییەكەیان لێ وەربگرین {مادام گومانی زاڵمان هەبێ كە ڕاستگۆن و، دادگەرن، لەڕووی شەرعەوە، واجبە ئەو شاهێدییەیان لێ وەربگرین} لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستكردن و دادگەرییەكەیان، شتێكی گومان لێكراوە {یانی: یەقینی سەدا سەدت نیە} چونكە دەگونجێ بەهۆی تەماع وەبەرنان یان ترسێنرانەوە، بە پەنامەكیی لەسەر درۆ ڕێككەوتبن، كەواتە: قبووڵكردنی گێڕرانەوە (رواية) - لەو جۆرە كەسانە - لە پێشترە، چونكە هەبوونی پاڵنەری درۆكردن، لە كەسێكدا بە ڕاستگۆیی ناسرابێ، بێهێزە.

كەواتە: ئەوانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوە كە هەواڵی ئاحاد، چ لەبواری عەقیدە، چ لەبواری یاسا شەرعییەكانی دیكەدا، كاری پێ دەكرێ، بەڵام وەك گوتم: بەمەرجێ ئەو فەرموودەیە، مەرجەكانی قبووڵی تێدا بێنە دی.

# سێزدەیەم

## قورئان هەمووی ڕوونەو، دەگونجێ مرۆڤ لەهەمووی تێبگات

ئەمەش بنەمایەکی دیکەی گرنگە لە بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکانی {ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان}، چونکە هەندێك کەس پێیان وا بووە کە قورئان وا نیە کە خەڵك لێی تێبگات، هەڵبەتە هەندێك شتیان کردۆتە بیانوو، بۆ وێنە: ئایەتەکانی (متشابه) کە خوا دەفەرموێ: هەندێك لە قورئان (متشابه)ە، هەروەها ئەو پیتە پچڕ پچڕانە (الحروف المقطة)ی کە لە سەرەتای بیست و نۆ سووڕەت لە سووڕەتەکانی قورئاندا هەن! بەڵام وەك باسی دەکەین، ئەو شتانە ناگونجێ بکرێنە بیانووی ئەوە، کە قورئان ڕوون نیەو ئینسان ناتوانێ لێی تێبگات، چونکە خوای کاربەجێ لە چەندان ئایەتدا، ئەوەی ڕاگەیاندوە کە ئەم قورئانە ڕۆشنەو ڕۆشنکەرەوەیەو، ئاسانە بۆ لێتێگەیشتن، بۆیە ئەو وردە شتانە کە کراون بە زرە بەڵگە (شبهة)، لە بەرانبەر ئەو هەموو ئایەتە ڕۆشنانەدا، خۆیان ڕاناگرن، کە خوا تێیاندا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە: قورئان ڕوونەو، مرۆڤ بە ئاسانیی دەتوانێ لێی تێبگات و، دەرکی ماناو مەبەستەکانی بکات.

ئێستاش با سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین لەو بارەوە:

١- لە ئایەتەكانی (١٥ و ١٦)ی سوورەتی (المائدة)دا، لە سیاقێكدا، خوا ڕوو لە خاوەن كتێبەكان دەكات، دەفەرمویٚ:

﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾ ﴾.

واتە: بێگومان لە خواوە ڕووناكییەك و كتێبێكی ڕۆشنكەرەوەتان بۆ هاتوە، خوا ڕێنمایی كەسانێكی پێدەكات - كە شوێن ڕەزامەندییەكەی دەكەون - بەرەو ڕێبازەكانی ئاشتیی و، لە تاریكاییەكان بەرەو ڕووناكیی، بە ویستی خۆی دەربازیان دەكات و، بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنماییان دەكات.

كەواتە: خوای پەروەردگار ناوی لە قورئان ناوە: ڕووناكیی (نور) كە هەم بۆ خۆی ڕوونەو، هەم دەبێتە هۆی ڕوون كردنەوەو بینینی شتەكانیش، ناویشی لێناوە: (كتاب مبین)، دیارە (مبین) ئەگەر لە (أبان)ەی (لازم)ەوە بیٚ، واتە: ڕۆشن و، ئەگەر لە (أبان)ەی (متعدِّي)یەوە بیٚ، واتە: ڕۆشنكەرەوە، (لازم) ئەوەیە كە پێویستی بە (مفعول به) ناكات، دەگوترێ: (أبان القَمَرُ)، واتە: مانگ دەركەوت، بەڵام ئەگەر بە (متعدِّي) هات، پێویستیی بە (مفعول به) دەكات، دەگوترێ: (أبان المُعَلِّمُ الكتاب) واتە: مامۆستایەكە كتێبەكەی ڕۆشن كردەوە، واتە: قورئان هەم لە خودی خۆیدا ڕۆشنە، هەم ڕۆشنكەرەوەشە.

٢- لە ئایەتەكانی (١٧٤ و ١٧٥)ی سوورەتی (النساء)دا، خوای بەرزو مەزن ڕوو لە مرۆڤایەتیی دەكات، دەفەرمویٚ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾ ﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! بە دڵنیاییەوە لە پەروەردگارتانەوە، بەڵگەیەکی ئاشکراتان بۆ هاتوە، ڕووناکییەکی درەوشاوەمان بۆ ناردوونە خوار {کە مەبەست پێیان قورئانە، دەشگونجێ مەبەست لە (بُرۡهَٰنٞ) پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیە وسلم) بێ}، ئنجا ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوە، توند دەستیان پێوەگرتوە، بێگومان (خوا) دەیانخاتە نێو بەزەیی و بەخششێك لە لایەن خۆیەوەو، بەرەو لای خۆی، ڕێیەکی ڕاستیان پێشان دەدات.

ئنجا ئەگەر بگونجێ مەبەست لە (برهان) پێغەمبەری {خاتەم موحەممەد (صلی الله علیە وسلم)} بێ، بەڵام بە تەئکید مەبەست لە (وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا) هەر قورئانە، چونکە هەر قورئان دابەزێنراوە.

٣- لە ئایەتی (٨٤)ی سووڕەتی (النساء)دا، خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾ ﴾.

واتە: ئایا ئەوانە لە قورئان نافکرن و وردنابنەوە! کە ئەگەر لەلایەن جگە لە خواوە بووایە، ناڕێکیی زۆریان تێدا دەبینی.

واتە: ئایەتەکانی تێکدەگیران و پێکەوە ناکۆك و دەبوون و دژ دەبوون، بەڵام چونکە لەلایەن خواوەیە، ئایەتەکانی ڕۆشنن و، پێکەوەش دژو ناکۆك نین.

**چەند قسەیەکی زانایان بە نموونە، کە قورئان ڕوون و فامکراوە:**

أ- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کە زۆر شارەزا بووە لە قورئان، دەڵێ: {وَالَّذِي لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ، مَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ سُورَةٌ، إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ حَيْثُ نَزَلَتْ، وَمَا مِنْ آيَةٍ، إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَا أُنْزِلَتْ} (أخرجه البخاري برقم: (٤٧١٦)، ومسلم برقم: (٦٤٧٨)).

واتە: سوێند بەو کەسەی پەرستراوی جگە لەو نیە، هیچ سووڕەتێك نیە لە کتێبی خوادا، مەگەر دەزانم لە کوێ دابەزیوە، هیچ ئایەتێك نیە، مەگەر دەزانم بۆچی دابەزێنراوە!

ب- حەسەنی بەصرایی کە بە بەرجەستەترین زانایانی تابیعین دادەنرێ، دەڵێ: {مَا أَنْزَلَ اللهُ آيَةً إِلاَّ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يُعْلَمَ مَا أَرَادَ بِهَا}[١].

واتە: خوا هیچ ئایەتێکی دانەبزاندوە، مەگەر حەز دەکات، کە ئەوەی پێی مەبەست بووە، بزانرێ.

ئنجا خوا سبحانە و تعالی کە حەزیشی کردوە، خەڵك لە ئایەتەکانی تێبگات، دیارە واشی لێ کردوون کە خەڵك لێیان تێبگات.

ج- مەسرووق کە ئەویش یەکێکە لە زانایانی تابیعین دەڵێ: {مَا نَسْأَلُ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ عَنْ شيءٍ، إِلاَّ وَعِلْمُهُ فِي القُرْآن، وَلَكِنْ عِلْمُنَا قَصَرَ عَنهُ}[٢] واتە: هیچ پرسیارێکمان نەکردوە لەبارەی هیچ شتێکەوە، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، مەگەر زانیاریی ئەو شتە لە قورئاندا هەیە، بەڵام زانیاریی ئێمە کورت بوو (واتە: ئێمە نەمانتوانی ئەوەی کە هاوەڵان پێیان گوتین، هەمووی وەربگرین).

**سەرنجدانێك لە (المحكمات) و (المتشابهات)ی قورئان:**

ئنجا با سەرنجی ئایەتە موحکەمەکان و ئایەتە موتەشابیهەکان بدەین:

وەك گوتمان: هەندێك لە زانایان ئەوەیان کرۆدتە بیانووو گوتوویانە: چونکە قورئان ئایەتی موتەشابیهی تێدان، کەواتە: مەرج نیە هەمووی فام بکرێ! بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئێمە کردمان بە سەردێڕو ناوونیشان، کە قورئان هەمووی هی ئەوەیە خەڵك لێی تێبگات، دوای ئەوەی سەرنجی دەدات و تێی ڕادەمێنێ.

لە سوورەتی (آل عمران)دا خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ

---

(١) الإتقان في علوم القرآن ج٢، ص٤٦٤.

(٢) مجموع الفتاوى ج٢، ص ١٢٢.

تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾.

واتە: ئەو (خوا) کەسێکە کە کتێبی ناردۆتە سەرتۆ، ئایەتانێك لەو کتێبە مانا ڕۆشنن، ئەوان بنەڕەتی کتێبەکەن و، هەندێکیشیان مانای وێکچوویان هەن، ئنجا ئەوانەی کە لادان لە دڵیاندا هەیە، بە مەبەستی سەر لێشێواندنی خەڵك و لێکدانەوەی کتێبەکە (بە جۆرێکی چەواشەکەرانە) شوێن ئەوەیان دەکەون کە مانای وێکچووی هەن، لە حاڵێك دا کە جگە لە خواو قووڵبووەوان لە زانیاریی دا، لێکدانەوەکەی نازانن (ئەوانەی کە) دەڵێن: بڕوامان پێی هێناوە، هەمووی لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە، بێجگە لە خاوەن عەقڵان کەس پەند وەرناگرێ.

**بۆیە من بە دوو شێوە خوێندمەوە، ئەگەر تێبینییتان کردبێ:**

**١)**- تەنیا خوا ماناو مەبەست، یان ئەو سەرەنجامەی کە ویستراوە لە پشت ئەو ئایەتەوە، دەیزانێ: (وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ).

**٢)**- تەنیا خواو قوڵبووەوان بە زانیارییدا ماناو سەرەنجامەکەی دەزانن: (وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ).

ئنجا بۆ زانیارییتان! یەکێك لەو هۆکارانەی کە مانای ئایەتەکانی قورئان دەگۆڕێ، مەسەلەی وەستان (وقف)ە، ئەگەر لەسەر وشەی (اللە) نەوەستی، کە دەفەرموێ: (وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا) واتە: تەنیا خواو ڕۆچووان بە زانستدا تەفسیری ئەو ئایەتانە کە موتەشابیهن، دەزانن و ئەوانەی کە بە زانستدا ڕۆچوون، دەڵێن: بڕوامان پێی هەیە هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە.

مانای وایە: وێڕای خوا عز وجل، ڕۆچووان بە زانیاریی (الراسخون في العلم)یش ماناو مەبەستەکەی دەزانن.

کورتەی واتای (محکم) کە بە (محکمات) کۆ دەکرێتەوە، واتە: مانا ڕۆشن، لە چییەوە هاتوە؟ قەڵایەك مەحکەم بێ واتە: درزو کەلێنی تێدانین، ڕستەیەکیش ئەگەر مانایەکەی ڕۆشن بێ، ئەوە بواری تێدانیە خەڵك بۆچوونی دیکەو واتای دیکەی لێ بگرێ.

بەڵام (متشابه) کە بە (متشابهات) کۆدەکرێتەوە، واتە: لێك چوو، ئەو واتایە دەگەیەنێ و ئەوەش دەگەیەنێ، یانی: زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێ.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ﴾ واتە: ماناو مەبەستێك کە لە ئایەتە موتاشابیهەکان دەگیرێ، تەنیا خوا دەیزانێ، یاخود تەنیا خواو ئەوانەی کە بەزانستدا ڕۆچوون و زۆر شارەزان، دەیزانن.

ئنجا پێم وایە بۆیە ئەم ئایەتە وا دابەزێنراوە کە بگونجێ بە هەردووك شێوەکە بخوێنرێتەوە، چونکە مەسەلەی (متشابه) ڕێژەیی (نسبـي)یە، بۆ هەندێك کەس ڕۆشنە، واتە: بۆ وان وێکچوو (متشابه) نیەو، بۆ هەندێ کەس ڕۆشن نیە کەواتە: بۆ ئەوان (متشابه)ە.

(متشابه)ە بەو واتایەی کە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێ، چونکە بە زانستدا ڕۆچووان هەموو واتا وێکچووەکانی دەزانن.

بەڵام ئەوەی کە ڕۆچوو نەبێ بە زانستدا، هەموو ئەو واتایانە نازانێ کە پێکدەچن.

**دوو نموونە لە قسەی زانایان لە بارەی (متشابه)ەوە:**

أ- پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: {المحكم: الذي ليس فيه اختلاف، والمتشابه: الذي يكون في موضعٍ كذا، وفي موضعٍ كذا}[1]،

واتە: موحکەم ئەوەیە کە جیاوازیی تێدانیە (واتە: جۆراو جۆریی تێدانیەو یەك واتای هەیە) بەڵام موتەشابیە، ئەوەیە کە لە شوێنێك مانایەك دەدات و، لە شوێنێکی دیکە مانایەکی دیکە دەدات، یاخود ئەو واتایەش دەدات و، ئەو واتایەش دەدات.

---

(١) العدة في أصول الفقه، (٦٨٥/٢).

ب- (د. عبدالله بن عبدالمحسن التركي) دەڵێ: {والتشابه أمرٌ نسبيٌّ إِضافيٌّ، فقد يَشْتَبِهُ على إِنسانٍ، ما لا يَشتبِهُ على غيره}، واتە: کە خوا دەفەرموێ: (آيات متشابهات) شتێکی ڕێژەیی پاڵدراوە، بۆ هەندێك کەس ماناکەی ڕوون نیە، بەڵام بۆ هەندێکیان مانایەکەی ڕوونە.

کە دەڵێ: (أمر نسبي إضافي) واتە: بە نسبەت هەندێکەوە وایەو، بە نسبەت هەندێکەوە وانیەو، ئەگەر پاڵ بدرێتە لای کەسێك، بۆ ئەو مانایەکەی نارۆشنەو، بۆ کەسێکی دیکە مانایەکەی ڕۆشنە، یانی: مانای ئایەتێك، جاری وایە بۆ کەسێك ڕۆشن نیە، بەڵام بۆ کەسێکی دیکە ڕۆشنە.

لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: من لەو کەسانەم کە مانای (متشابە) دەزانم، دیارە دەبێ هەر واش بێ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوعای بۆ کردووە بە چەند بێژەیەك هاتوە، یەك لەوانە: {اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ} أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٠٥٥)، قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٌ.

واتە: ئەی خوایە! لە ئاییندا تێیبگەیەنەو لێکدانەوەو تەفسیری قورئانی فێر بکە.

**مانای وشەی (تأويل):**

بە نسبەت وشەی (تأويل)ەوە، لە ئەصڵی مانا زمانەوانییەکەیدا واتە: گێڕانەوە (أَوَّلَ يُؤَوِّلُ تَأْوِيلاً) واتە: گێڕانەوە، (آلَ يؤل) یانی: (رَجَعَ يَرْجِع)، (أَوَّلَهُ) یانی: (رَجَّعَهُ) گێڕایەوە.

(إبن تيمية) دەڵێ: (ولفظُ التأويل في عُرْف السَّلَف له معنيان: أحدهما: تفسير الكلَام وبيانُ معناه، وأما المعنى الثاني للتأويل، فهو نفس المراد بالكلام، فإِن كان الكلامُ أمرًا أو نهيًا، فتأويلُه نفسُ فعل المأمور به، وترك المحظور، كما قالت عائشة رضي الله عنها: «كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يُكْثِر أن يقول في ركوعِه وسجوده: "سبحانَكَ اللهمّ ربَّنا وبِحَمْدِكَ، أللهمّ اغْفِرْ لي "يتأوَّلُ القرآن، تعني: أن هذا هو تأويلُ قوله تعالى: { فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ} النصر:٣.

وإن كان الكلام خبرًا، فتأويله: نفسُ الشيء المُخْبَرِ عنه، فتأويل ما أخبر الله به عن نفسه، وعن اليوم الآخر، هو نفس الحقيقة التي يُخْبِرُ عنها، وذاك في حق الله، هو كُنه ذاته وصفاته التي لا يعلمها غيره، وتلك هي المتشابه الذي لا يَعْلَمُ تأويله إلا الله، وهذا هو الذي يجبُ تفويضُ العلم فيه إلى الله عزّ وجلَ}[١].

واتە: وشەی (تأويل)[٢] لە لای زانایانی پێشین دوو واتای هەن:

**یەك:** ڕوونکردنەوەی مانای ئەو قسەیەو، مەبەست پێی چییە؟

**دوو:** مانای دووەمی بریتیە لە: خودی ئەو مەبەستەی کە ویستراوە بۆ ئەو شتە، نەك مانایەکەی، واتە: ئەگەر ئەو قسەیە، فەرمان بێ، یان قەدەغە کردن بێ، (تأويل) کردنەکەی بریتیە لەئەنجامدانی ئەو فەرمان پێکراوە، یان خۆ لێ دوور گرتنی ئەو قەدەغە کراوە، دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: {كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يُكثر أن يقول في ركوعِه وسجوده: "سبحانَكَ اللهمّ ربّنا وبِحَمْدِكَ، اللهمّ اغْفِرْ لي "يتأوَّلُ القرآن، تعني: أن هذا هو تأويلُ قوله تعالى: (فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ) النصر:٣} واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕکووع و کڕنووشی دا دەیفەرموو: پاکیی بۆ تۆ ئەی خوایەو پەروەردگارمان! ستایش بۆ تۆ، ئەی خوایە! لێم ببوورە، تەئویلی قورئانی دەکرد، واتە: کە خوا لە کۆتایی سوورەتی (النصر)دا فەرموویەتی:

﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ﴿٣﴾ ﴾، بە ستایش کردنی پەروەردگارتەوە بە پاکی بگرەو داوای لێبوردنی لێبکە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی جێبەجێ کردوە، ئەوەی کە خوا لێی ویستوە، جێ بەجێی بکات.

بەڵام ئەگەر هەواڵ پێدان بێ، تەئویل کردنی هەواڵ پێدان، بریتیە لە هاتنە دی خودی ئەو شتە هەواڵ پێدراوە، ئەوەی کە خوا هەواڵی پێداوە دەربارەی

---

(١) مجموع الفتاوى، ج٦ ص ٤٣٤، عن (مجمل اعتقاد أئمة السلف) ص ١٤٧-١٥١، د. عبدالله بن عبدالمحسن التركي.

(٢) ئەبو جەعفەری تەبەڕیی لە تەفسیرەکەی خۆیدا ئەم وشەیە زۆر بە کاردێنێ، بە مانای لێکدانەوەو تەفسیری ئایەتەکان.

خۆی، یان دەربارەی ڕۆژی دوایی، بریتیە لە هاتنە دی ئەو حەقیقەتە کە خوا هەواڵی پێداوە، ئنجا بە نسبەت خوای بەرزی مەزنەوە، بریتیە لە چییەتی خواو سیفەتەکانی، کە جگە لە خۆی کەس نایانزانێ، ئەوەش ئەو (متشابە)یە کە جگە لە خوا هیچ کەس (تأویل)ەکەی نازانێ {خوا چۆنە؟ سیفەتەکانی چۆنن؟ بەهەشت و دۆزەخ بەو وردەکارییەی کە هەن، چۆنن؟ تەنیا خوا دەزانێ} ئنجا ئەوە جۆرە تەئویلێکە پێویستە زانیارییەکەی بگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا.

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست دەڵێین:

خوا سبحانە و تعالى باسی خۆی کردوەو، باسی سیفەتەکانی خۆی کردوە، بۆ وێنە: باسی چوونە سەر عەرشی خۆی کردوە، ئنجا ئەوەندەی کە لێی حاڵی دەبین، ئەوە دیارەو، ئەوەی کە لێی تێناگەین، ئا ئەوەیانە کە لە لەگەڵ ڕاوەستان (وقف) لەسەر وشەی (الله)دا، دەگونجێ کە دەفەرموێ: (وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ).

کەواتە: هەندێك لەئایەتەکان، بەشێك لە واتایەکەیان تەنیا خوا دەیزانێ، بەڵام ئەوی دیکەیان کە مانا گشتیەکەیانە، ئێمەش دەیزانین، یاخود بەلایەنی کەمەوە زانایانی ڕۆچوو دەیزانن، ئنجا ئەوەندەی کە دەزانرێ، بە (متشابە) لە قەڵەم نادرێ و، ئەوەی کە نازانرێ ئەوە (متشابە)ەوە دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا.

ئەوەش باس و بابەتێکی زۆر وردەو زانایان زۆر مشت و مڕیان بووە لەسەر ئایەتەکانی: (محکمات و متشابهات)، گرنگ ئەوەیە ئێمە بزانین کە قورئان لەبەر گەلێك حیکمەت، خوا زۆربەی زۆری ئایەتەکانی کردوونە (محکمات) کە دەربارەشیان دەفەرموێ: ئەوانە ئەسڵی قورئانن، هەندێکیشیان (متشابهات) مانا وێك چوون، ئنجا ئەوانەی کە دڵیان لادان و نەخۆشیی تێدابێ، لە جیاتی ئەوەی بە دوای ئەو هەموو ئایەتە موحکەمانە بکەون، بە دوای هەندێ ئایەتی موتەشابیە دەکەون، کە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن.

**حیكمەت چییە خوای كاربەجێ هەندێك لە ئایەتەكانی بە (متشابە) ناردوون؟**

زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر شتیان باسكردوە، كە پێم وایە گرنگترینیان ئەم دووانەن:

١)- ئەو ڕاستییانەی كە قورئان گرتوونیە خۆی، لەوە مەزنترن كە عەقڵی ئینسان ئیستیعابیان بكات، بۆیە خوای كاربەجێ هەندێك لەو ڕاستییانەی خستوونە دوو توێی هەندێك ئایەتی (متشابە)وە، كە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن، بۆ وێنە: خەڵكێكی عەوام، كە دەڵێ: خوا لەسەر عەرشە، لە ئاسمانە، بە پێی ئاستی خۆی لێی تێدەگات و، جۆرە تێگەیشتنێكی هەیە، جیایە لە هی زانایەكی ڕۆچوو، ئەویش بە قەدەر خۆی لێی تێدەگات، هیچ كامیشیان وەك ئەوەی كە لە واقیعدا هەیە، بەو شێوەیە لێی تێناگەن، بۆیە خوای كاربەجێ ئەو بابەتە مەزنانەی خستوونە چوار چێوەی ئایەتە مانا وێكچووەكانەوە.

٢)- ئەگەر ئایەتە مانا وێكچووەكان (متشابهات) نەبوونایە، زانایان هێندە لێیان نەدەكۆڵیەوەو مشت و مڕیان نەدەبووو، سەرەنجام هێندە بە ئایەتەكاندا قووڵ نەدەبوونەوە، سبحان الله! تەنیا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایە، چونكە ئێستا كەسێك بڵێ: خەڵكینە! وەرن، هەتا بۆتان دەكرێ لەم كتێبەم وردبنەوە، تێی بگەن و لێی ڕابمێنن، مانای وایە دەبێ زۆر دڵنیابێ، كە هەرچەندە سەرنجی بدەن و تێوەی ڕابمێنن، كەم و كورتییەكی تێدا نابیننەوە، وەك خوا دەربارەی دروستكراوەكانی خۆی فەرموویەتی:

﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: لە نێو دروست كراوی خوادا ناڕێكیی نابینی.

دەربارەی كتێبەكەشی فەرموویەتی:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئایا لە قورئان ڕانامێنن! ئەگەر لەلای جگە لە خواوە بووایە، جیاوازیی و نارێکیی زۆریان تێیدا دەدی.

بەڵێ، خوا هەم دروستکراوەکانی بە باشترین شێوە خوڵقاندوون، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴿٨٨﴾ ﴾ النمل.

هەم قورئانیشی بە باشترین شێوە فەرمووە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: فەرموودەی پەروەردگارت لە ڕاستیی و دادگەرییدا تەواوی کردوە.

بۆیە: نە لە دروستکراوەکەیدا کەم و کوڕیی هەیە، نە لە فەرمایشتەکەشی دا.

# چواردەیەم

## هۆکارەکان کاریگەرییان لە کارتێکراوەکانیاندا هەیە، بە مۆڵەتی خوا (الأسباب لها تأثير في مُسَبَّباتها، بإذن الله)

ئەم مەسەلەیەش یەکێکە لەو بابەتە عەقیدەییانەی کە مشت و مڕی زۆریان لەسەر بووەو، بەردەوام لەسەریشیان هەیە، ئایا مەبەست پێی چییە کە هۆکارەکان کاریگەرییان هەیە، لە شتە پەیدا بووەکاندا، بەڵام بەمۆڵەتی خوا؟

مەبەست ئەوەیە {جەبرییە} هەبوون -وەك دوایی لە تەوەری سێیەم دەگەینە ئەو تاقم و پێڕانە- گوتوویانە: ویستی مرۆڤ و دەستەڵاتی مرۆڤ، هیچی لە دەست نایەت، هەرچی هەیەو هەرچی پەیدادەبێ، خوا دروستی دەکات و مرۆڤ هیچ کارەیە! ئنجا لێرەدایە کە مەلای گەورەی کۆیە لە دێڕە شیعرێکی دا دەڵێ:

> چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد
> ئۆممەتی وا زەبەلاح هەمووی بە زینـــدوویی مرد

ئنجا ئەم فیکرەی (جەبرییە) دوایی بەسەر زۆربەی ئۆممەتدا، گشتێنراوەو، ئێستاش لەگەڵدا بێ، خەڵکێکی زۆر، لە نێو گەلانی ئیسلام، کورد، عەرەب، تورك، فارس، ئەفغان، هیند.. دەڵێن: مرۆڤ هیچ کارەیە! بەڵام بێگومان ئەوە

ڕاست نیەو، مرۆڤیش شتەو شتیشی لە دەست دێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا سزای دەدات و پاداشتی دەداتەوە، کەواتە: دیارە شتێکی لە دەست دێ ئنجا بۆیە ئەو مەسەلەیەم وەك یەکێك لە بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکانی {جەماوەری مسوڵمانان} داناوە، کە: {هۆکارەکان کاریگەرییان هەیە، بەڵام بە مۆڵەتی خوا} چونکە زێدەڕۆیی و کورتهێنانی زۆری تێدا کراوە:

١)- جەبرییەکان دەڵێن: مرۆڤ هیچ کاریگەریی نیەو، وەك پووشکەی بەردەم با وایە، لە بەرانبەر ویستی خوادا!

٢)- موعتەزیلەش بە پێچەوانەی وانەوە: مرۆڤیان کردوە بە هەمەکارەو دەڵێن: بەدیهێنەر (خالق)ی کردەوەکانی خۆیەتی.

٣)- ئەشعەرییەکان دەڵێن: مرۆڤ کاریگەریی (تأثیر)ی هەیە، بەڵام کاریگەرییەکی زاتیی نیە، ئێستاش ئەشعەرییەکان لە کتێبەکانیاندا وا دەڵێن، بۆ وێنە: (محمد سعيد رمضان البوطي) ڕەحمەتی خوای لێبێ کە زانایەکی باشیش بووە، لە کتێبێکیدا بەناوی: (السلفية مرحلة مباركة من التأريخ الإسلامي، وليس مذهباً إسلامياً) لەوێدا باسی ئەم مەسەلەیە دەکات و دەڵێ: ئەشعەرییەکان دەڵێن، بۆ وێنە: کاتێك کە باران دەبارێ و گیا دەڕوێ و سەوزایی دەڕوێ، ئەوە بەهۆی بارانەوە نیە، بەڵکو خوا هاوکات لەو کاتەدا کە ئەو بارانە دەبارێنێ، ئەو سەوزاییەش دەڕوێنێ، ئەگەرنا ڕووەکە بە بارانەکە ناڕوێ! هەروەها دەڵێن: کە مرۆڤ ئاو دەخواتەوەو تینووایەتیی دەشکێ، بە ئاوەکە تینووایەتیی ناشکێ، بەڵکو لەو کاتەدا خوا تینوایەتیی مرۆڤ دەشکێنێ و نایهێڵێ، ئنجا ئەوان بەو حاڵەتە دەڵێن: حاڵەتی وێکڕابوون (إقتران)، بەڵام ئایا ئەوانە بۆچی وا دەڵێن؟

گوتوویانە: چونکە ئەگەر بڵێین: ئەو شتانە کاریگەریی سەربەخۆ (مستقل) و خودییان هەیە، لە دەسەڵاتی خوا کەم دەبێتەوە! بە حیساب بۆ ئەوەی بەرگریی بکەن لە ڕەهایی ویست و دەسەڵاتی خوا، گوتوویانە: شتەکان کاریگەریی سەربەخۆو خودییان نیە، بەڵکو خوا وای داناوە، لەو کاتەدا کە ئەو شتە دەگاتە ئەو شتە، ئەو شوێنەوارە پەیدابێ.

هەڵبەتە لە نێو فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکانیشدا، هەندێکیان بە تایبەت {دیفید هیوم}[1] ئەو بیرۆکەیان هەیە.

بەڵام بە دڵنیایی ئەو بیرۆکەیە هەڵەیەو پێچەوانەی: وەحیی و عەقڵ و واقیعەو، ئەوەی لە کتێبی خواو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە شتەکان کاریگەریی سەربەخۆو خودییان هەیە، بەڵام کاریگەرییەکە خوا لەواندا دایناوە، بۆ وێنە: خوا وای داناوە ئاو تینووایەتیی بشکێنێ، باران ڕووەك بڕوێنێ، هەروەها هەموو شتەکانی دیکەش، خوای کاربەجێ وای کردوە ئەو شتانە ئەو کاریگەرییە خودییەیان هەبێ، ئنجا مادام خوا دایناوە، کەواتە: لە دەستەڵات و ویستی ڕەهای خوا کەم نابێتەوە.

با تەماشای ئەم دەقانە بکەین:

١- لە ئایەتی (٩)ی سووڕەتی (ق)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ ﴾.

واتە: لە سەرێوە ئاوێکی بە پیزمان دابەزاندوە، بەو ئاوە باغ و بێستان و دانەوێڵەیەکیان ڕواندوە، کە دەدوورێتەوە.

کەواتە: ڕووەکەکە بە ئاوەکە ڕوواوە، مانای وایە: ئەو ئاوە کاریگەرییەکی خودیی هەیە، کە دەبێتە هۆی ڕووانی باغ و باغات و دەغڵ و دان.

٢- هەروەها لە ئایەتەکانی: (١٥ و ١٦)ی سووڕەتی (المائدة)شدا، خوا ڕوو لە خاوەن کتێبەکان دەکات، دەفەرموێ:

﴿ ..قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴿١٦﴾ ﴾.

---

(١) دیفید هیوم (١٧١١- ١٧٧٦ز)، بڕوانە: (الموسوعة الفلسفية المختصرة) ص٤٠١- ٤٠٩.

واتە: بێگومان ڕووناکییەك و کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەتان لە خواوە بۆ هات، کە خوا ڕێنمایی کەسانێکی پێدەکات - کە شوێن ڕەزامەندییەکەی دەکەون - بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتیی ڕێنماییان دەکات.

دەفەرموێ: ( يَهۡدِي بِهِ ) یانی: خوا بەهۆی ئەو ڕووناکیی و کتێبە ڕۆشنکەرەوەوە هیدایەتیان دەدات.

هەڵبەتە ئایەت زۆر زۆرن، بەڵام من ئەو دووەم بە نموونە هێناونەوە.

٣- با لەو بارەوە ئاماژە بەو فەرمایشتەش بکەین، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اللهَ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلاتِي عَلَيْهِمْ} مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البُخَارِيّ برقم: (٤٥٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٥٦).

واتە: بێگومان ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکایی، بۆ ئەو کەسانەی کە خراونە نێویانەوە، بەڵام خوا بە هۆی دوعای منەوە، ڕووناکیان دەکاتەوە.

کەواتە: دوعایەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هۆکارە بۆ ئەوەی تاریکییەکەی نێو گۆڕەکان، بگۆڕدرێ بۆ ڕۆشنایی.

کەواتە: لێرەدا دوو هەڵوێستی تێپەڕێنەرو کورتهێنەری پێچەوانەی یەکدی هەن و، هەڵوێستێکی پێچەوانەی وانیش، کە حاڵەتێکی ڕاست و هاوسەنگە، هەیە:

**١)- هەڵوێستی تێپەڕێنەر:**

دەڵێ: هۆکارەکان کاریگەرییەکی سەربەخۆو خودیی (مستقل وذاتي) ناپەیوەستیان هەیە، واتە: دایدەبڕن لە ویست و دەستەڵاتی خواو، دەڵێن: کاریگەرییەکە هی خودی شتەکانەو بەردەوامیش دەبێ.

**٢)- هەڵوێستی کورتهێنان:**

دەڵێ: هۆکارەکان هیچ کاریگەرییان نیە.

٣)- هەڵوێستی ڕاست و هاوسەنگ:

دەڵێ: هۆکارەکان کاریگەرییان هەیە، بەڵام بە هۆی ئەوەوە، کە خوا ئەو کاریگەرییەی لە نێو ئەو شتانەدا داناوەو، دابراویش نیە لە ویست و دەستەڵاتی خواو، هەر کات بیەوێ، ئەو کاریگەرییە ڕادەگرێ، یان نایهێڵێ.

شایانی باسیشە هەر بەو دێڕەی کۆتایی، وەڵامی ئەو قسانە دەردێتەوە کە ئەوانەی بڕوایان وایە هۆکارەکان کاریگەریی خودیی (تأثیر ذاتي)یان نیە، بەبەڵگەیان دێننەوەو:

أ- بۆ وێنە، دەڵێن: ئەدی ئەوە نیە ئیبڕاهیمیان خستنە نێو ئاگر، بەڵام ئاگر نەیسووتاند، ئنجا ئەگەر ئاگر کاریگەریی زاتیی هەبووایە، وەك چۆن شتەکانی دیکە دەسووتێنێ، دەبوو ئیبڕاهیمیشی سووتاندبایە، بەڵام ئیبڕاهیمی نەسووتاند، کەواتە: ئاگر کاریگەریی زاتیی نیە!

ب- هەروەها دەڵێن: مووساو هاروون و گەلەکەیان چوونە نێو دەریاری سوورەوە، کەچی ئاو نەیخنکاندن، ئنجا ئاو ئەگەر کاریگەریی زاتی هەبووایە، دەبوو بیانخنکێنێ!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە بەڵگە نیە، چونکە خوا سبحانە و تعالی کاریگەریی زاتیی لە شتەکاندا داناوە، بەڵام هەرکات فەرمووی: کاریگەرییتان نەبێ، نایانبێ، بەبەڵگەی ئەوە کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء.

گوتمان: ئەی ئاگر! ساردبەو سەلامەت بە لەسەر ئیبڕاهیم.

ئنجا ئەگەر وای پێ نەفەرمووبایە، دەیسووتاند، واتە: خوا کاریگەرییەکەی لێستاندۆتەوە لەو کاتەدا.

هەروەها بە نسبەت دەریای سووریشەوە، بە هەمان شێوە، خوای تواناو کارزان کاریگەرییەکەی لێستاندۆتەوە، ئەگەرنا وەك چۆن فیرعەون و سوپایەکەی خنکاند، ئەوانی دیکەشی دەخنکاند.

## پازدەیەم

## چاکیی و خراپیی لە کردەوەکاندا، هەم بە عەقڵ دەرك دەکرێن، هەم بە شەرع، بەڵام پاداشت و سزا، تەنیا لە ڕێی شەرعەوە دەزانرێ

ئەمیش یەکی دیکەیە لە بنەما ئیمانیی و عەقیدییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.

ئنجا ئەم مەسەلەیەش یەکێکی دیکەیە لەو مەسەلانەی کە لە نێو مسوڵماناندا، مشت و مڕیان لەسەر بووە:

**١)**- موعتەزیلە گوتوویانە: عەقڵ بەتەواویی چاکیی و خراپیی شتەکان دەزانێ و پەکی لەسەر وەحیی نەکەوتوە.

**٢)**- جەبرییەو ئەشعەرییە گوتوویانە: عەقڵ چاکیی و خراپیی شتەکان نازانێ، هەتا خوا نەفەرموێ: ئەو کردەوەیە باشە، ئێمە نازانین باشەو، هەتا نەفەرموێ: خراپە، ئێمە نازانین خراپە!

بەڵام لە ڕاستییدا دیسان ئەم دووانەش تێپەڕاندن و بەزایەدانن.

أ- ئەوە تێپەڕاندنە کە بڵێی: عەقڵ چاکیی و خراپیی هەموو کردەوەکان دەزانێ و، پەکی لەسەر وەحیی نەکەوتوە.

ب- هەروەها ئەوەش بەزایە دانە کە بڵێی: عەقڵ چاکیی و خراپیی هیچ کام لە کردەوەکان، نازانێ.

ج- بەڵام هەڵوێستی ڕاست و هاوسەنگ ئەوەیە بڵێی: دەگونجێ عەقڵ چاکیی و خراپیی زۆربە، یان هەندێك لە کردەوەکان بزانێ، بەڵام مەرج نیە هی هەموویان بزانێ و، پاداشت و سزاش تەنیا لە ڕێی شەرعەوە دەزانرێن.

ئنجا ئەمەش ئەوەی لەسەر بینا دەکرێ کە: ئایا ئەگەر خوا پێغەمبەرانی نەناردبان و، شەریعەتەکانی دانەبەزاندبان، خەڵك پابەند (مُلْزَم) بوو، خوا بپەرستێ؟

بە پێی ڕای موعتەزیلە بێ، بەڵێ، چونکە عەقڵ هەموو شتە چاك و خراپەکان دەزانێ، کەواتە: مرۆڤ مولزەمە بەوەی خوا بپەرستێ، ئەگەر خوا پێغەمبەرانیشی نەناردبان.

بەڵام بەپێی ڕایەکەی دیکە، نەخێر، خەڵك بەبێ هاتنی وەحیی مولزەم نابن خوا بپەرستن.

بەڵام بێگومان ئەگەر خوا پێغەمبەرانی نەناردبان، وەڵامەکەی بە دەقی قورئان زانراوە، کە خەڵك مولزەم بە خوا پەرستیی نەدەبوون، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ۝١٥﴾ الإسراء.

واتە: ئێمە تاکو پێغەمبەر نەنێرین، خەڵك سزا نادەین.

هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا، خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ۝١٦٥﴾.

واتە: (ئەوانە) پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، تاکو لە دوای پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە.

کەواتە: ئەگەر پێغەمبەران نەهاتبان، خەڵك بەڵگەو بیانووی هەبوو، لە بەرانبەر خوادا (عزّ وجل)، ئینسان زۆر سەری سووڕدەمێنێ: هەندێ لە مسوڵمانان کاتی خۆی بە هەندێك شتەوە سەرقاڵ بوون، بە بۆچوونی من، ئەگەر هەر گەڕابانەوەو تۆزێك تەماشای ئایەتەکانیان کردبایە، ئەو هەموو مشت و مڕەیان پێکەوە نەدەکرد، بەڵێ بە ڕاستیی وەك موعتەزیلە دەڵێن: وانیە کە عەقڵ هەموو شتێك بزانێ، بەڵام دیسان وەك جەبریی و ئەشعەرییەکانیش گوتوویانە، وا نیە کە عەقڵ هیچ شتێك نەزانێ.

هەڵوێستی ڕاست ئەوە کە عەقڵ زۆر شت دەزانێ، بەڵام هەندێك شت نازانێ، واتە: لە چاکیی (حُسن) و خراپیی (قُبح)ی شتەکان، بەڵام ئەوە کە کام لە کردەوەکان سزا، یان پاداشت دەخوازێ؟ بۆ وێنە: کوشتن (قتل) سزای هەیە، چۆن دەزانین؟ ڕاستە بە عەقڵ دەزانین: نوێژ کردن چاکەو، کوشتن خراپە، بەڵام ئەوە کە دەبێ سزای قەتڵ لە دنیادا بەو جۆرە بێ و، لە قیامەت بەو جۆرە بێ، یاخود نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن، ئەوە پاداشتیانە لە قیامەتدا، ئەوە تەنیا بە شەرع دەزانرێ.

ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتانەش بکەین، ئەو هەڵوێستە هاوسەنگە، زۆر جوان دەردەکەوێ:

١- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (١٠٠)دا، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ قُل لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتە: (بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ): تۆ بفەرموو: پیس و پاك یەکسان نین، هەرچەندە زۆریی پیس تۆ سەرسام بکات، ئەی خاوەن عەقڵەکان! پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سەرفراز بن.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: (لَا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ) پاشانیش خاوەن عەقڵان دەدوێنێ، یانی: بۆ هەموو عەقڵمەندان هەر وایە، کەواتە: عەقڵ تاکو ڕاددەیەك، پاك و پیس لە یەك جیا دەکاتەوە، مانای وایە ئینسان تاکو عەقڵی بەهێزتربێ، پاك و پیس زیاتر لێك جیادەکاتەوەو، زیاتر دەتوانێ پارێز لە خوا بکات و، خۆی لە پیسەکە بپارێزێ و، پاکەکە هەڵبژێرێ.

٢- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٥)دا، کە پێشتریش هێنامان، خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾.

واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەر تاکو لە دوای پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە.

٣- لە سوورەتی (الأعراف)دا ئایەتەکانی (١٥٥ و ١٥٦) خوا سبحانه و تعالى ئەوەی کە گوتوومانە، زۆر بە ڕوونیی دەری دەخات، دەفەرموێ:

﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾.

واتە: "خوا" فەرمووی: بەزەییەکەم (لە دنیادا) هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئنجا (لە دوارۆژدا) بۆ ئەوانەی دەنووسم (و تەرخان دەکەم) کە پارێز دەکەن و زەکات دەدەن و، ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانمان دێنن، ئەوانەی دەکەونە شوێن ڕەوانەکراوو پێغەمبەری نەخوێندەوار، ئەو کەسەی کە (پێناسەو نیشانەی) لە

تەورات و ئینجیلدا (خاوەن کتێبەکان) لەلای خۆیاندا بە نووسراویی دەیبینن، فەرمانیان پێدەکات بە هەرچی شتی پەسندەو، ڕێگرییان لێدەکات لە هەرچی شتی ناپەسندەو، هەرچی شتی باش و سوود بەخشە، بۆیان حەڵاڵ دەکات و، هەرچی شتی خراپ و زیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەکات و، ئەو بارە قورسە (ی لەسەر شانیان بووە)و ئەو کۆت و زنجیرانەی لە دەست و گەردنیاندا بوون، لێیان لادەبات، ئنجا ئەو کەسانەی بڕوایان پێهێناوەو، ڕێزیان گرتوەو، پشتیان گرتوەو، شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کە لەگەڵیدا نێرراوەتە خوارێ، ئا ئەوانە سەرفرازن.

دیارە سووڕەتی (الأعراف) مەککەییە، کەواتە: کە دەفەرموێ: (يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ) دیارە دەبێ: بەباش زانراو (معروف) و، بە خراپ زانراو (منكر)ەكان، دیاربن بۆ عەقڵ، ئەو (باشە)ی کە بە عەقڵ دەزانرێ باشەو، ئەو (خراپە)ی بە عەقڵ دەزانرێ خراپە، باشەکە دەبێ ئەنجام بدرێ و، خراپەکە دەبێ خۆی لێ بە دوور بگیرێ، هەروەها ڕۆزییە خۆش و بە سوودەکان (طيبات) و ڕۆزییە پیس و زیانبەخشەکان (خبائث)یش، بە هەمان شێوە، کەواتە: تاکو ڕاددەیەك عەقڵ چاك و خراپ و، پاك و پیس و، سوودبەخش و زیانبەخشەکان، دەزانێ و لە یەکیان جیا دەکاتەوە.

بەڵام ئایا عەقڵ هەرچی (معروف) و (منكر)ە، دەیانزانێ؟ لە ڕاستییدا ئەویش پلە پلەیە، بۆ وێنە: عەقڵی پێغەمبەران، مەگەر بە دەگمەن، ئەگەرنا هەرچی (معروف) و (منكر)ە زانیویانەو، هەرچی (طيبات) و (خبائث)ە زانیویانە، بۆیە پێغەمبەران، پێش پێغەمبەرایەتییش زۆر پارێزراو بوون، بەڵام ئایا بە گشتیی مرۆڤەکان دەتوانن چاك و خراپ و، پیس و پاك، لێك جیابکەنەوە؟ بێگومان نەخێر، دەبێ شەرع بۆیان دیاریی بکات.

کەواتە: ئەوە هەڵوێستی ڕاست و دروستە، کە عەقڵ هەندێك لە شتەکان دەزانێ، کە چاکن و، هەندێکیشیان دەزانێ کە خراپن، هەروەها هەندێك کە پیسن و، هەندێك کە پاکن، بەڵام تەواویی زانیاریی دەربارەی (معروف) و (منكر) و (طيب) و (خبيث) تەنیا بە هۆی شەرعەوە دەزانرێ و، پاداشت و سزاش تەنیا بە هۆی شەرعەوە، پێویست دەبن و، ڕوو لە مرۆڤەکان دەکەن.

# شازدەیەم

## وەحیی ڕاست لەگەڵ عەقڵی تەواو، هەردەم پێکەوە گونجاون

ئەمیش یەکی دیکەیە لە بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکانی {ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان} بە دڵنیایی هەرگیز ناگونجێ وەحییەکی ڕاست و دروست هەبێ، لەگەڵ بۆچوونێکی عەقڵ، کە ئەویش پێکابێتی، کەچی تێکبگیرێن!

(إبن تيمية) لە کتێبی: (درء التعارض بين العقل والنقل) واتە: {لابردنی تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ}دا[1] دەڵێ: {المنقول الصحيح لا يعارضه معقول صريح قط، وقد تأملت ذلك في عامة ما تنازع الناس فيه، فوجدتُ ما خالف النُّصوصَ الصحيحة الصريحة شبهات فاسدة، يُعْلَم بالعقل بطلانُها، بل يعلم بالعقل ثبوتُ نقيضها الموافق للشرع..، ووجدت ما يعلم بصريح العقل، لم يخالِفْهُ سمعٌ قط، بل السمع الذي يقال إنه يخالفه: إما حديث موضوع أو دلالة ضعيفة، فلا يصلح أن يكون دليلاً لو تجرَّد عن معارضة العقل الصريح، فكيف إذا خالفه صريح المعقول؟ ونحن نعلم أن الرسل لا

---

(١) (عەقڵ) واتە: هۆش، (نەقڵ)یش واتە: ئەوەی بۆ ئێمە گواستراوەتەوە لە زانیاریی لە پێغەمبەرەوە، واتە: وەحیی.

يخبرون بمحالات العقول، بل بمحارات العقول، فلا يُخْبِرون بما يَعْلَمُ العقلُ انتفاءَه، بل يُخْبِرون بما يَعْجِز العقلُ عن معرفته}[١].

واتە: نەقڵێك کە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست بێ، هەرگیز لەگەڵ عەقڵێك کە پێکابێتی تێکناگیرێن، من زۆر سەرنجی ئەوەم داوە کە خەڵك تێیدا کەوتوونە مشت و مڕەوە، بینیم ئەوەی کە لەگەڵ دەقە ڕاستەکاندا تێکدەگیرێ، هەندێك شوبهەی نارێکن، کە بە عەقڵ پووچییەکەی دەزانرێ، بەڵکو بەعەقڵ دەزانرێ کە پێچەوانەی ئەو شوبهەیە، ڕاستە، کە لەگەڵ شەرعدا تەبایە.

هەروەها بینیم ئەوەی کە بە عەقڵی ساغ دەزانرێ، هەرگیز وەحیی لەگەڵیدا ناکۆك نیە، بەڵکو ئەو نەقڵەی دەگوترێ: دژیەتی، یان فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە، یان تێگەیشتنێکی لاوازە، بۆیە ناگونجێ بەبەڵگە لەقەڵەم بدرێ و، ئەو نەقڵە ئەگەر لەگەڵ عەقڵیشدا تێکنەگیرابایە، {لەبەر ئەوەی لەڕووی سەنەدەوە ڕاست نیە}، نەدەگونجا بەبەڵگە دابنرێ، چ جای کە لەگەڵ عەقڵیشدا تێك دەگیرێ؟ ئنجا ئێمە دەزانین کە: پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، هەرگیز هەواڵ بە شتێك نادەن کە عەقڵ بە مەحاڵی بزانێ، بەڵام هەواڵ بە شتانێك دەدەن، کە عەقڵ تێیدا سەرسام بێ، هەواڵ بەشتێك نادەن کە عەقڵ دەزانێ هەڵەیە، بەڵام هەواڵێك دەدەن کە عەقڵ لە ناسینی دا دەستە پاچەیە.

منیش دەڵێم: بۆ وێنە:

١)- خوا لەسەر عەرشە، چۆن لەسەر عەرشە؟

٢)- خوا فەرمایشتی کردوە، چۆنی فەرمایشت کردوە؟)[٢].

---

(١) ج٢ ص ١٤٧، ط١/ ١٩٧٩م/ ١٣٩٩هـ، تحقيق الدكتور محمد رشاد سالم.

(٢) یەکێك پرسی گوتی: مامۆستا! ئەم قوڕئانە، هەر مانایەکەی هی خوای پەروەردگارە، یان بێژەکانیشی، گوتم: ئەوە ڕای بەشێك لە ئەشعەرییەکان و، جەهمییەکانە، کە گوتوویانە: قوڕئان بەس مانایەکەی هی خوایەو، بێژەکان هی جبریلن و، جبریل دایڕشتوە، بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)!! نەخێر، قوڕئان بێژەو مانایەکەی هەمووی لە خواوە هاتوە، چۆن هاتوە، جبریل ئاوای دابەزاندوە، ئنجا هەر بۆ زانیاریی! هەندێ لە حەنبەلییەکان گوتوویانە: ئەو مەرەکەبەش

وەك گوتم: ئایا خوا قورئانی چۆن فەرمووە؟ ئێمە کە قسە دەکەین، دیارە زمان لە ددان و پووکەکان و ئەملاولای نێوەڕاستی زارو مەڵاشوو دەدات، بۆ ئەوەی پیتەکان دەربێنێ، بەڵام خوای پەروەردگار بەو شێوەیە نیە، ئەدی چۆنی ئەو بێژەو وشانە بۆ جبریل دابەزاندوون؟ نازانین، عەقڵی ئێمە ئەوەی بۆ ئیستیعاب ناکرێ، نەك هەر ئەوەندە، ئەو پەپوولەو هەنگ و مێروولەو .. هتدانەی کە یەکدی دەدوێنن و یەکدی حاڵی دەکەن، ئایا دوانی ئەوان، وەك هی ئێمەیە؟ نەخێر، مەرج نیە هەندێکیان هەر دەنگیان هەبێ، هەندێك لەو زیندەوەرانە، بە بۆن لێك تێدەگەن، هەندێك بە ئاماژە لێك تێدەگەن، وەك خوا لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ:

﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴿١٩﴾﴾.

دیارە قسەیەکی بووە، بەڵام چۆن؟ نازانین، یان بۆ وێنە: ئەو هەنگانەی کاری خۆیان دابەش دەکەن، هەندێکیان ئیشیان تەنیا بریتیە لە هەواگۆڕیی (تهوية) واتە: فێنك کردنەوە لە هاویناندا و گەرم کردنەوە لە زستاناندا، بۆ ئەوەی گەرایەکەیان نەمرێ و، هەندێك ئیشیان پاسەوانییەو، هەندێك ئیشیان ئەوەیە دەچن شیلە دەمژن، دیارە سیستمێکیان هەیەو بۆ خۆیان لێك حاڵین، بەڵام چۆنە؟ ئێمە نازانین.

کەواتە: مەرج نیە هەر شتێك عەقڵ بۆی ئیستیعاب نەکرا، بڵێین: پێچەوانەی عەقڵە.

جارێك لەگەڵ کابرایەکی نەصرانییدا وتووێژم بوو لەسەر مەسەلەی سیانیی (ثالوث) کە خوا دەفەرموێ:

﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ﴿٧٣﴾﴾ المائدة.

---

کە پێی دەنووسرێ و، کاغەزەکەش کە لەسەری دەنووسرێ، یان چەرمەکەو، قەڵەمەکەش کە پێی دەنووسرێ، ئەوانەش هەر دروستکراو (مخلوق) نین! کەواتە: هەریەکەیان بەلایەکدا تێیان پەڕاندوە.

ئەوان دەڵێن: ١- خوا، ٢- عیسا، ٣- (روح القدس) جیبریل، هەندێکیش دەڵێن: ١- خوا ٢- عیسا ٣- دایکی، سێن.

ئنجا گوتم: خوا یەکێکەو ئەو سێیەتان لەکوێ هێنان؟ گوتی: ئنجا ئێوەش هەروا دەڵێن، گوتم: چۆن؟ گوتی: پێغەمبەرتان دەڵێ: {إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلاَّ وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٧٧).

کەواتە: خوا بە نەوەدو نۆ (٩٩) دادەنێن، گوتم: نەخێر، خوا یەکێکە، بەڵام سیفەت و ناوەکانی زۆرن، کە هەر ئەوەندەش نین و زیاتریشن، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دا هاتوە[1]، بەڵام ئەوە زۆر جیایە لەگەڵ ئەوەی ئێوە، کە دەڵێن: {الأب، الإبن، الروح القدس: باب، کوڕ، گیانی پیرۆز} واتە: خوا شتێکە، عیسا شتێکە، (روح القدس) شتێکە، (یان دایکی شتێکە)، ئەوە حیسابێکی دیکەیە، بەڵام ئێمە دەڵێین: خوای پەروەردگار یەك زاتە، بەڵام خاوەنی ئەو سیفەتانەیە، گوتم: ئەوەی ئێوە لەگەڵ عەقڵدا تێکدەگیرێ، بەڵام ئەوەی ئێمە دژی عەقڵ نیەو تەنیا ڕەنگە عەقڵ بۆی ئیستیعاب نەکرێ: زاتی خواو ئەو سیفەتانەی چۆنن؟ کە نەك هەر ئەوە: ئێمە زۆرجار سیفەتی دروستکراوەکانیشمان بە تەواویی بۆ ئیستیعاب ناکرێ، عەقڵی ئێمە لەوە بچووکترە، بەڵام ئەوەی ئێوە ڕێك دژی عەقڵە، ناگونجێ شتێك یەك بێ و سێش بێ! هەڵبەتە ئەوان هەندێ شوبهەو گومان دێننەوە لەوبارەوە، دەڵێن: ئەوەتا ئاو یەك شتە، بەڵام حاڵەتی شلیی و بەستن و هەڵمیشی هەیە! ئێمەش دەڵێین: ڕاستە، بەڵام ئاو هەر سیفەتە دەرەکییەکانی دەگۆڕێن، ئەگەرنا

---

(١) ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {أللهم إِنِّي سْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي} أخرجه أحمد برقم (٤٣١٨)، قال الهيثمي (١٠/١٣٦): رجاله رجال الصحيح غير أبي سلمة الجهني، وقد وثقه ابن حبان، وابن أبي شيبة برقم (٢٩٣١٨)، والطبراني برقم (١٠٣٥٢)، والحاكم برقم (١٨٧٧) وقال: صحيح على شرط مسلم.

ئەگەر تەماشای پێکهاتەی بەفرو ئاوو هەڵم بکەی، هەر ($H_2O$)یەو، تەنیا ڕواڵەتەکەی دەگۆڕێ.

خوا پشتیوان بێ ئێمە لە تەوەری پێنجەمدا بەشێکی تەواو تەرخان دەکەین بۆ توێژینەوەی بابەتی: چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و وەحیی، بۆیە لێرە بەخێرایی بەسەریدا ڕۆیشتین، لە سۆنگەی ئەوەوە کە وەك یەكێك لە بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکانی: {ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان} لێرەشدا بینووسین و ئەژماری بکەین.

## حەڤدەیەم

## موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری کۆتایی خواو، گەورەترین ڕەوانەکراوی و ڕووناکیی هەرەتەواویەتی

لەم بنەمایەی کۆتاییدا لە {بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکانی جەماوەری مسوڵمانان} باسی ئەوە دەکەین کە {جەماوەری مسوڵمانان} چۆن چۆنی بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلى الله عليه وسلم) بووە، چۆن مامەڵەیان لە گەڵ کردووە، چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەری خاتەمدا کردووە؟ پێویستە بزانین کە زانایان هیچ کام لەو بنەمایانەیان نەهێناوە، مەگەر بۆ بەر پەرچدانەوەی بە شێك لە ئەوانەی کە داهێنانیان کردوە لە دينداو، کەم و زۆر لایانداوە بەملاولادا، ئێستاش با لە حەوت خاڵاندا لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکدا، باسی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) بکەین:

**١- موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کۆتا پێغەمبەری خوا بووە:**

خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٤٠)دا، دەفەرموێ:
﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

واتە: موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوەکانتان نیە، بەڵکو ڕەوانەکراوی خوا و کۆتایی پێغەمبەرانەو، خوا بە هەموو شتێك زانایە.

کەواتە: لە دوای پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن، وەك: قادیيانییەکان و ئەحمەدییەکان و، ئەوانەی کە دوایی باسیان دەکەین، گومانیان بردوە.

**٢- پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) نەشارەزا بە کتێبە ئاسمانییەکان و، نەخوێندەواریش بووە:**

وشەی (أمي) بەواتای نەخوێندەوار هاتوە، ئەو کەسەی کە خوێندن و نووسین نازانێ و، بەمانای نەشارەزا لە کتێبە ئاسمانییەکانیش هاتوە، خواش سبحانه وتعالى ئەو وشەیەی بۆ پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بەکارهێناوە:

﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ ﴿١٥٧﴾ ﴾ الأعراف.

بەڵێ پێغەمبەری ئێمە (صلى الله عليه وسلم) (أُمّي) بووە، بە هەردوو واتایەکەی، هەم خوێندن و نووسینی نەبووە، بەدەقی ئایەت کە لەسووڕەتی (العنكبوت)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

واتە: تۆ پێش قورئان هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو، بەدەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، ئەگەر خوێندن و نووسینت ببووایە، ئەوانەی کە لەسەر ناهەقن، دەکەوتنە گومانەوە.

واتە: بواری کەوتنە گومانیان بۆ دروست دەبوو، ئەوەش حیکمەتی خوایە، ئەگەرنا پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) لە بنەماڵەیەکی ناسراو

و خانەدان و نەجیب زادەی (بنو هاشم) و نەوەی (عبدالمطلب) بووە، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسێندراوە، بەپێی حیکمەتی خوا، کە خوێندەواربێ، بخوێنێتەوەو نووسین بزانێ.

ئنجا بەواتایەکەی دیکەشی هەروایە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شارەزای کتێبە پێشووەکان نەبووە:

﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾، النحل.

واتە: ئێمە دەزانین کە دەڵێن: ئەو بەشەرێك فێری دەکا (غولامێکی نەصرانییە، ئاسنگەرێکە)[1]، زمانی ئەو کەسەی کە ئاماژەی پێدەدەن ئەعجەمییە {غەیری عەرەبە} بەڵام ئەم قورئانە بە زمانێکی عەرەبیی زۆر ڕۆشن و ڕۆشن کەرەوەیە!

کەواتە: ناگونجێ لەویەوە فێربووبێ، ئەمە هەر قسەیەکەو کراوە، ئێستاش ئەو قسانە هەر دەکرێن.

**٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ بڕواداران، لە خودی خۆیان لە پێشترە:**

لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٦)دا، خوا سبحانه وتعالى ئاوا پێناسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات:

﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ بڕواداران لە خۆیان لێیان لەپێشترە، هاوسەرەکانیشی دایکیانن {دایکانی پیاوانی بڕوادارن}.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: دایکانی پیاوانیش و هی ئافرەتانیشن، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە: مەبەست پێی پیاوانە، لەو ڕووەوە کە وەك چۆن دایك

---

(١) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٢ ص٤٢٢، أخرجه الطبري في (جامع البيان) (١٢٠/١٤) وغيره، وقال مؤلفا الإستيعاب: قلنا: وسنده صحيح.

بەکوڕی ناشێ، ئەوانیش ئاوان بۆ پیاوان، بەڵام بۆ ئافرەتان پێویست ناکات، ئەو سیفەتە بخرێتە سەریان.

**٤- پێغەمبەری خوا (محمد) (صلى الله عليه وسلم) ڕەحمەتی خوایە بۆ تێکڕای جیهانییان:**

وەك لە سووڕەتی (الأنبياء) ئایەتی (١٠٧)دا، خوا سبحانه وتعالى پێناسەی پێغەمبەری خاتەم دەكات دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بەبەزەیی بۆ هەموو جیهانییان.

**٥- بەبێ ملکەچ بوونی تەواو بۆ حوکم و بڕیاری پێغەمبەر (محمد) (صلى الله عليه وسلم) مسوڵمانان بە بڕوادار دانانرێن:**

وەك لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (٦٥)دا، خوا سبحانه وتعالى پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنێ و دەفەرموێ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴾.

پێشێ باسی بەسەرهاتێك كراوە، دوایی دەفەرموێ: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت، ئیمان ناهێنن تاكو لەوەدا كە تێیدا كەوتوونەتە مشت و مڕ و كێشەوە، تۆ نەكەنە دادوەر، دوایی هەست بەهیچ سەغڵەتییەك نەكەن، لەدڵی خۆیاندا {بەهۆی بڕیارەكەی تۆوە}و بەتەواویی ملكەچ بن.

بەڵێ ئاوا دەبێ مامەڵە لە گەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بكرێ، هەركاتێك شتێكت لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پێگەیشت، بەبڕوادار لە قەڵەم نادرێی، ئەگەر بەو شێوەیە نەبی، دەبێ بیكەی بەدادوەر، لەو شتەدا كە جێگای ناكۆكیی و مشت و مڕەو، هەست بەهیچ سەغڵەتییەك نەكەی لە بەرانبەر بڕیارەكەیداو، بەتەواوییش ملكەچ بی.

گێڕراوەتەوە: جارێك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، باسی شتێکی کرد، گوتی: پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) وای فەرمووە، یەکێك گوتی دەنا ئەبو بەکر وای گوتوەو، عومەر وای گوتوە، ئەویش گوتی: هەرچاکە بەردتان بەسەردا نابارن، من دەڵێم: پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)، ئێوەش باسی ئەبو بەکرو عومەران[1] دەکەن کە دیارە زۆر زۆر ڕێزیشی هەبووە بۆ ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵام لەبەرانبەر قسەی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم)، نابێ قسەی کەسی دیکە بخرێتە ڕوو، لە حاڵی تێك گیراندا.

**٦- پێغەمبەری خوا (محمد) (صلى الله علیه وسلم) باشترین سەرمەشقی بڕوادارنە:**

وەك لە سووڕەتی (الأحزاب) ئایەتی (٢١)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا، باشترین سەرمەشق هەیە بۆ ئێوە.

واتە: لە هەموشتێکدا دەبێ چاوی لێ بکەن و شوێن پێی هەڵبگرن.

**٧- خۆشویستنی مسوڵمانان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم)، بەبێ شوێنپێ هەڵگرتنی، ناسەلمێنرێ:**

وەك لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتەکانی: (٣١ و٣٢)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

خوا سبحانە وتعالى پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) دەدوێنێ و دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی

---

(١) کە ئەمە دەقی قسەکەیەتی: (یوشك أن تنزل علیکم حجارة من السماء! أقول: قال رسول الله صلى الله علیه وسلم، وتقولون: قال أبو بکر وعمر).
بڕوانە: (شرح ریاض الصالحین، لمحمد بن صالح العثیمین) ج١ ص٥٤٧.

دەوێن و لە گوناهەکانتان دەبووریٚ و، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە، بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە بێگومان خوا کافرانی خۆش ناوێن.

واتە: هەرکەسێك پشت لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکات، ئەوە چۆتە ڕیزی کافرانەوە!

برا و خوشکانی بەڕێز! بەپێی ئەم ئایەتانە، زۆر جوان دیارە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەرکەسێ خۆی بە ئیماندار بزانێ، دەبێ لەخۆی خۆشتری بوێ، لەخۆی لەپێشتری دابنێ و هاوسەرەکانی وەك دایکی خۆی خۆش بوێن و، شوێنکەوتووەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) خۆش بوێن و، لەبەرامبەر بڕیاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێو شوێنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، هیچ لام و جیمی نەبێ و، دەبێ وریابێ لەوەی کە پشت لە ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکات، چونکە خوا بەدەقی قورئان دەفەرموێ: کەسێك پشت لە تۆ بکات، ئەوە خوا کافرانی خۆش ناوێن، واتە: ئەوە کافرە، خواش بابای کافری خۆش ناوێ.

## پێنج مەسەلەی گرنگ لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتانەی سەرەوەدا:

**مەسەلەی یەکەم:** چۆن مامەڵە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بکەین؟

پێشتریش باسمان کردووە و لێرەش هەر بەکورتی دەڵێم: ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (سنة النبي): بریتیە لەو شێوە دینداریيەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردوویەتی، کەواتە: ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ قورئاندا بەراورد ناکرێ، واتە: ناخرێنە دوو تای تەرازوویەك، بەڵکو ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) واتە: چۆنیەتی دینداریی کردن و چۆنیەتی مسوڵمانەتیی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

کەنێوەڕۆك و جەوهەری مسوڵمانەتییەکەی، بریتیە لە قورئان، واتە: سوننەت شتێکی جیا نیە لە قورئان، وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومە، بەڵام گرنگە بۆیە دووبارەی دەکەمەوە، بەڵکو سوننەت واتە: پراکتیزە کردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، واتە: جێ بەجێ کردنی قورئان، مەبەستیشم نیە بڵێم: کەواتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) غەیری قورئان وەحیی دیکەی بۆ نەهاتوە، چونکە ئەوە شتێکی هەڵەیە و بێ جێیە، بەڵکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەحیی دیکەشی بۆ هاتوەو پێشتریش باسمان کردوە.

بەڵام ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێ پۆلێن بکرێ، ئێمە بۆچۆنیەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێ ڕێبازەکەی پۆلێن بکەین، کە وەك پێشتر باسمان کردوە، بەلای کەمەوە بۆ شەش جۆر دابەش دەکرێ:

١- ئەوەیان کە پەیوەندیی بە سروشتی بەشەرییەوە هەیە، بۆ ئێمە پابەندکەر نیە.

٢- ئەوەیان کە بەسیفەتی سەرۆکی دەوڵەت فەرموویەتی و کردوویەتی، دەبێ ئێمە لەحاڵەتی دەوڵەتدا بین، ئەوجار دەتوانین جێ بەجێی بکەین.

٣- ئەوەیان کە بەسیفەتی قازیی فەرموویەتی و کردوویەتی، دەبێ دادوەر جێ بەجێی بکات.

٤- ئەوەی بەسیفەتی موفتی فەرموویەتی و کردوویەتی، تایبەتە بەو بوارەوە.

٥- ئەوەی کە وەك عادەت و نەریتی ئەو کۆمەڵگایە کردوویەتی، دەبێ ئەو حاڵەتە لەبەر چاو بگیرێ.

٦- ئەوەش کە وەك دین گەیاندوویەتی، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، دیارە دەبێ وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

**مەسەلەی دووەم:** شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حوکمی جیا جیای هەن، بەپێی جیاوازیی جۆری سوننەت و ڕێبازەکەی، بەپێی جیاوازیی ئەو بەشەی سوننەت،

نەك هەمووی یەك حوکمی هەبێ، کە بریتیە لە کاری خۆبەخش (تَطوُّع)و پەسند (نَدْب)، چونکە بەداخەوە، وشەی سوننەت زیاتر مانا فیقهییەکەی باوە: {سوننەت یانی: لە بەرامبەر واجیبدا}.

بەڵام لەلای زانایانی (أصول الفقه) سوننەت ئەو حوکمە شەرعییانەن کە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتوون، جیا لە قورئان.

کەچی لەلای زانایانی فەرموودەناس (محدِّثین) سوننەت واتە: هەرچی لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بەئێمە گەیشتوە، غەیری قورئان لە فەرموودەی، لەکردەوەی، لە دان پێداهێنانی.

بەڵام ئەوەی کە من تێی گەیشتووم و پێی گەیشتووم، لە ئەنجامی خوێندنەوەو بەدواداچوونی زۆردا، ئەوەیە کەسوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ کام لەم سێ پێناسەیە، نەپێناسەی شەرعزانان، نە هی ئوصوولییەکان، نە هی فەرموودەناسان، تەواو ماناو پێناسەکەی بەدەستەوە نادات، بەڵکو سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەبۆچوونی من، قورئانیش دەگرێتە نێو خۆی، وەك لە تەوەری یەکەمدا بە وردیی لەو بارەوە دواوین.

کەواتە: بەپێی جۆری سوننەت، حوکمی شوێنکەوتنی سوننەت دیاریی دەکرێ.

**یەکەم:** ئەگەر مەبەست لە گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆی ڕێبازەکەی بێ، بەقورئانیشەوە، ئەوە هەرکەسێ پشتی تێ بکات، کافر دەبێ، بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾، آل عمران.

**دووەم:** بەڵام ئەگەر مەبەست لەسوننەت ئەو شتانەبێ، ئەگەر بیانکەی خێرت بگاتێ و، ئەگەر نەیانکەی، گوناهت نەگات، ئەوە دیارە ئەوکاتە حوکمەکەی جیایە، بۆ وێنە: کەسێك سیواك ناکات، ڕیش ناهێڵێتەوە، نوێژی سوننەت ناکات، ڕۆژووی سوننەت ناگرێ، دەگوترێ: خێرێکی لەدەست چووە.

**سێیەم:** جۆرێك لە سوننەتیش هەر لە نێو بازنەی سوننەتدا هەیە، بەڵام دەبێ ئەنجام بدرێ و ئەگەر کەسێك ئەنجامی نەدا، ئەوە بە تەئکید گوناحبار دەبێ.

کەواتە: بەپێی جۆری سوننەت کە پۆلێنی دەکەین، حوکمی شوێنکەوتنی سوننەت دەگۆڕێ، ئەوەتان لێ تێك نەچێ!

بەڵێ مانای ڕاستەقینەی پابەندیی بە سوننەتەوە، گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) بۆیەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ}، أخرجه الترمذي برقم (٢٦٧٦)، وابن ماجه برقم (٤٢)، وأحمد برقم (١٧١٤٢)، وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم (٢٧٥٣).

واتە: ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە سەر ڕاستە هیدایەت دراوەکان بگرن، ددانی لە سەر ڕۆ بگرن، واتە: ئەگەر بەددانیش بیگرن، نەهێڵن لە دەستتان دەربچێ، کە بەتەئکید لێرەدا مەبەستی پێ شێوەی حوکمڕانییە، ئەگەرنا دەیفەرموو: هاوەڵان (أصحاب) بۆچی دەفەرموێ: خەلیفە ڕاشیدەکان؟ چونکە ئەو چوارە، یان ئەو پێنجە بە(حسن)یشەوە، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، حوکمڕانییان کردوە، دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا بۆچی دەفەرموێ: ڕێبازی من بگرن و، ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان؟ واتە: لە شێوەی حوکمڕانییدا:

**أ-** حوکم بەشەریعەت بکەن.

**ب-** بەڕاوێژ.

**جـ-** دادگەر بن.

**د-** زاهید بن و تەماعتان لە (بيت المال)دا نەبێ، وەك دوایی (بنو أمية)و (بنو عباس) کردیان یانی: ئەو سیفەتە سەرەکییانەی حوکمڕانیی کە لەڕۆژگاری من و لە ڕێبازی مندا هەن و، لە هی خەلیفە ڕاشیدەکاندا هەن، ئێوەش بەو شێوەیە حوکمڕانیی بکەن.

کەواتە: ئەو دەقانەی ئەوە دەگەیەنن، کە مرۆڤ ئەگەر لەڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لابدات، کافر دەبێ، مەبەست پێی کۆی ڕێبازەکەیەتی بە قورئانیشەوە.

بەڵام ئەو دەقانەی ئەوە دەگەیەنن کە خێرێکت لەدەست دەچێ، مەبەست پێی ئەو مانا جوزئیەیەتی کە شەرعزانان هێناویانە.

**مەسەلەی سێیەم:** متمانە هەبوون بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ئیمانەوە هەڵدەقوڵێ، بۆیە ئینسان تاکو ئیمانی بەهێزتربێ، متمانەی زیاتری بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەبێ.

با وێنەیەکتان بۆ بێنمەوە:

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، کە ئەگەر مێش کەوتە نێو خواردن و خواردنەوەی یەکێکتان، با نوقمی بکا و دوایی فڕێیبدات و ئەو خواردنە بخوا، لەبەر ئەوەی باڵێکیان دەردی تێدایە[1]، ئنجا تۆ بیکە بە پێوەر: ئایا دەتوانی ئەو سوننەتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جێبەجێ بکەی؟ مێش بکەوێتە چایەکەت، یان بکەوێتە شیرێك کە لە پێشتە، شلەمەنییەك، دەتوانی نوقمی بکەی و دوایی بیخۆی؟ ناڵێم: ئەگەر بڵێی: نا ئیمانەکەت هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام هەتا ئیمانت بەهێزتر بێ، متمانەت بە پێغەمبەر زیاترە (صلی الله علیه وسلم)، ئنجا هەر لەوەڕا بیگرە هەتا هەر شتێکی دیکە، ئەوە بیکەن بە تەرازوو بۆخۆتان، بۆ ئەوەی خۆتانی پێ بناسن، چونکە هی واهەیە دەڵێ: بەخوا من بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سووتاوم، بەڵام دوایی، دەڵێی: ئەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، یان دەڵێی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وای پێخۆشە، کەچی تەماشا دەکەی: لە قەلبی خۆش نایەت! ئەوە دەبێ بزانێ کە بەهەڵە داچووەو هەڵوێستەکەی کە دەڵێ: من هێندەو هێندە پێغەمبەری خوام خۆش دەوێ، شتێکی عاتیفییە!

---

(١) لە تەوەری یەکەمدا دەقی ئەو فەرموودەیەو، قسەی زانایانمان لەبارەیەوە هێناوە.

وێنەیەکی دیکە: مەلای واهەیە، شێخی واهەیە: ڕیشی لووس لووس دەتاشێ، جەنابی مەلا! جەنابی شێخ! ئایا دەزانی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕیشی هەبووە، ئەو پێغەمبەرەی (صلی الله علیه وسلم) کە تۆ دەڵێی: خزمی ئەوم و، جێگرەوەی ئەوم، ڕیشی هەبووە، دەڵێ: دەزانم بەڵام!! بەڵام چی کاکە! دەتۆش بیهێڵەوە، لایەنی کەم خێرێکت دەست دەکەوێ و، زیاتر وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەچی.

**مەسەلەی چوارەم:** دەبێ ئێمە لە ڕێز لێگرتنی پێغەمبەری خاتەمدا (صلی الله علیه وسلم) ڕووحمان بەقوربانی بێ و، خۆشویستنی و، شوێنکەوتنیدا، ئاگامان لە تێپەڕاندن و کورتهێنان بێ، تێنەپەڕێنین بە بیانووی ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)مان زۆر خۆش دەوێ، بیبەینە ڕیزی خوا! هەروەها کورتیشی نەهێنین، بەبیانووی ئەوەی کە ئێمە ئەهلی خوا بەیەکگرتن (توحید)و خوا بەیەکگر (مۆحِّد)ین، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکەم تەماشا بکەین! وریابن! جارێك سەردانی یەکێ لەو شێخانەی هەولێرم کرد، لەتەکیەکەیاندا بەمناسەبەتی چوونمانەوە، مەجلیسێکیان سازکردبوو، ئنجا هەندێ سروود و شیعریان گوتن و دەفیان لێدا، بەڵام لە شیعرەکاندا زێدەڕۆیی و تێپەڕاندنی تێدابوو لە مەدحی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) وەك: نزیك خستنەوە لە مەقامی خوا سبحانه وتعالی، منیش دوایی ئامۆژگارییم کردن و، هەندێ قسەم بۆکردن گوتم: دەبێ ئاگامان لەوە بێ کە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {لاَ تُطْرُونِي، كَمَا أَطْرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ، وَرَسُولُهُ}، أخرجه البخاري برقم (٣٤٤٥)، والدارمي برقم (٢٨٢٦).

واتە: پێم هەڵامەڵێن و لە مەدحمدا تێمەپەڕێنن، وەك نەصرانییەکان لە بارەی مەسیحی کوڕی مەریەمەوە، تێیان پەڕاند، من تەنیا بەندەی خوام، کەواتە: بڵێن: بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوا.

هەندێك ئامۆژگارییم کردن، چونکە لەنێو ئەو شیعرانەدا کە خوێندیاننەوە، ئەوەشی تێدابوو کە شیعری (بوصیري)یە، دەڵێ: (ومِنْ علومه عِلمُ اللّوح والقَلَمِ)،

واتە: لەزانیارییەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) عیلمی لەوح و عیلمی قەڵەمیش، واتە: بەشێك لە زانیاریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە کە خوا لە (لوح المحفوظ)دا نووسیویەتی و، بەشێك لەزانیاریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوەیە کە خوا بەقەڵەم نووسیویەتی! چونکە لە فەرموودەدا هاتوە لە (سنن أبي داود)دا کە خوا فەرمانی بەقەڵەم کرد ئەندازەی هەمو شتەکانی نووسی، (اللوح المحفوظ)یش، بەڕای ئەو زانایانە، دروستکراوێکی گەورەیە هەموو زانیارییەکانی خوا لە وێدا هەن، ئنجا بەپێی ئەو شیعرەی بوصیرِیی بێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خوا زاناترە! چونکە دەڵێ: هەرچی لەلەوح و قەڵەمدایە، لە زانیارییەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)!! ئەوەش دیارە کە قسەیەکی بێ جێیەو هیچ نیە، چونکە پێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی خوا پێی نەفەرمووبێ و فێری نەکردبێ، نەیزانیوە.

دوایی هەندێ لە خەڵکی تەکیەکە، لەلای دۆستێکی من گوتبوویان: فڵانکەسمان خۆش دەوێ، بەڵام حەیفێ پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) خۆش ناوێ، چونکە گوتوویەتی: زۆری پێهەڵمەڵێن! ئەویش گوتبووی: نا تەصەووڕ ناکەم وابێ، من بیستوومە: فڵانکەس چەند جار لە خەوندا بە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتوە، دوایی منی بینی و لەو بارەوە لێی پرسیم؟ گوتم: تەنیا گوتوومە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆخۆی فەرمانی کردوە کە نەیبەینە ئاستی خوای پەروەردگار، وەك جارێك خەتیبێك وتاری دا، گوتی: (ما شاء الله وشئت)، فەرمووی: (بئس خطيب القوم أنت، أجعلتني لله نداً، قل ما شاء الله وحده)[1]، یانی: خەتیبەکە گوتی: ئەوەی خوا بیەوێ و ئەوەی تۆ بتەوێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: تۆ خەتیبێکی خراپی، ئایا منت هێنایە ئاستی خوا؟ بڵێ: ئەوەی کە تەنیا خوا بیەوێ {واتە: ویستی من لە گەڵ ویستی خوای پەروەردگاردا لە تەرازوودا دامەنێ}.

---

(١) أخرجه الطبراني برقم (١٣٠٠٥)، وأخرجه أيضا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٧٨٣)، وأبو نعيم (٩٩/٤).

**مەسەلەی پێنجەم:** بەنسبەت دوای مەرگی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دوای وەفاتی، دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟

**یەکەم:** لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە سەنەدەکەیشی ڕاست (صحیح)ە دەفەرموێ: هەرکامێك لە ئێوە سڵاوم لێ بکات، سڵاوەکەم پێدەگات، خوا ڕووحەکەم وێدەداتەوەو سڵاوەکەی لێ وەردەگرمەوە[1]، ئەوەش تەعبیرێکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکاری هێناوە، چونکە ڕووحەکە ناچێتەوە نێو جەستە، هەرچەندە حاڵی جیهانی بەرزەخی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، جیایە لەهی خەڵکی دیکە.

**دووەم:** ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای کۆچی دوایی و، ئێستا کە لە عالەمی بەرزەخدایە، وەك هەندێك لە ئیشکە {سەلەفیی ناو}ی ناحاڵیی دەڵێن: هیچ پەیوەندیی نەماوە بە ئوممەت و بەدنیاوە؟ بێگومان نەخێرو ئەوە کورت هێنانە.

یان ئایا وەك هەندێك صۆفیی دەڵێن: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك ئێستا لە حاڵی ژیان دابێ، کە دەچی بۆ سەر گۆڕەکەی لە مەدینە، دەبێ ئاوا قسەی لەگەڵدا بکەی و تەکلیفی لێبکەی و، ...هتد؟ کە بێگومان ئەمەشیان زێدەڕۆیی و تێپەڕاندنە.

**سێیەم:** هەڵوێستی هاوسەنگ و ڕاست لەو بارەوە: پێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) لەجیهانی بەرزەخەوە، بەتەئکید ئاگای لەوەزعی ئوممەتی هەیە، ئەوەی کە خوا ئاگاداری بکاتەوە، کە ئەوەش شتێکی ئەزموونکراوەو دەزاندرێ، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاگای لە ئوممەتەکەی هەیە، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا دەفەرموێ: هەموو ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە، کردەوەکانی ئوممەتم پێشان دەدرێن[2]، بۆیە من دەڵێم: {لێرەدا ڕای ڕاست لەنێوان ڕۆچوونی صۆفییانەو، وشك و برینگیی وەهابییانەدایە} {الرأي الصحيح هنا:

---

(١) ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {ما من أحد يُسَلِّمُ عليَّ إلا رد الله عليَّ روحي، حتى أَرُدَّ عليه السلام} أخرجه أبو داود برقم (٢٠٤١)، والبيهقي برقم (١٠٠٥٠).

(٢) کە ئەمە دەقە کەیەتی (تُعْرَض الأعمالُ يوم الإثنين والخميس..) رواه سلم: ٢٥٦٥، والترمذي: ٧٤٧.

هو بين الغلو الصّوفي، والجفاء الوهّابي}، ئنجا من دڵنیام کە: سەلەفی صاڵح وا نەبوون، چونکە (إبن القيم) کە کابرایەکی شوێنکەوتووی سەلەفی صاڵحە و، قوتابی (إبن تيمية)یە، کتێبێکی هەیە بەناوی (الروح)، پێم خۆشە بیخوێننەوەو، تەماشای بکەن، لە میانی ئەوشتانەدا کە باسیان دەکات، باسی ڕووح دەکات چۆنە و چی لێدێ؟ ئنجا چەند بەسەرهاتێك لەو کتێبەدا دەگێڕێتەوە.

یەکێك لەوانە دەڵێ: کابرایەك هەبوو زۆر قسەی بە ئەبو بەکر و عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەگوت، دەڵێ: یەکێك دەگێڕێتەوە دەڵێ: منیش زۆر خەفەتم پێخوارد، شەوێك لەخەونمدا بینیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بۆچی خەفەت دەخۆی؟ گوتم: ئەو کابرایە شیعەیەو دراوسێمە، زۆر قسە بە (أبو بكر) و (عمر) دەڵێ، ئەویش فەرمووی: دەجا ئەو چەقۆیە هەڵگرەو سەری ببڕەو سزای بدە، منیش وام کرد، بۆ بەیانی خەبەرمان بۆوە، لەو ماڵە داد و فیغان بوو، گوتمان: ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەمشەو ئەو کابرایە وەفاتی کردوە، دوایی چووم بۆ شۆردنی جەنازەکەی، تەماشام کرد: خەتێکی بەملیدا هاتوە، خەتێکی سوور.[1]

بەسەرهاتێکی دیکە: کابرایەك دەڵێ: یەکێك هەبوو قسەی بە عەلی خوا لێی ڕازی بێ دەگوت دەڵێ: خەونم بە پێغەمبەرەوە بینی (صلی الله علیه وسلم) عەلیی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئەو کابرایە قسەم پێدەڵێ، ناصیبییە {ئەوەی دیکەیان دیارە ڕافیزیی بووە}، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: زللەیەکی لێبدە، دوایی کابرا خەبەری بۆوە بۆ خۆی بۆی گێڕاینەوە گوتی: شتێکی وابووەو لاڕوویەکی ڕەش بووبوو.[2]

ئنجا خۆشم ئەو جۆرە شتانەم هەندێك بینیون و، ئەوانەی لێم نیزیکترن، ئاگاداری زۆر شتن.

---

(١) الروح، ص٢٣٩، ط ٢٠٠٣ ، کە ئەویش لە: (كتاب البستان)ی (القيرواني) وەریگرتوە.

(٢) الروح، ص٢٣٩، کە لە (كتاب المنامات)ی (ابن أبي دنيا) وەریگرتوە.

مەبەستم ئەوەیە: گومانتان لەوەدا نەبێ کە خوا پێغەمبەری خۆی (صلی الله علیه وسلم) ئاگادار دەکاتەوە لە ورد و درشتی ژیانی ئۆممەتی، بەتایبەتی بۆ هەندێ کەس، بەڵێ ئەو زاتە (صلی الله علیه وسلم) ئاگاداری زۆر شتەو، خەفەت دەخوات بە شتی ناڕێك کە ڕوودەدات و، دڵ خۆشە بە شتی باش و، لە خەوندا پەیوەندیی دەکات بە هەندێك لە تاکەکانی ئۆممەتیەوە، ئنجا جاری وایە گەنجێکە، جاری وایە ئافرەتێکە، کاسبێکە، مامۆستایەکە، بەرپرسێکە، یانی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە جیهانی بەرزەخەوە، پەیوەندیی هەیە، بەڵام بەو شێوەیە نا کە هەندێك لە ئەهلی تەصەووف {نەك هەموویان} دەڵێن: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك زیندوو بێ، ئاوا مامەڵەی لەگەڵدا بکەی، مەسەلەی لێ پاڕانەوە و داوا لێکردن، ئەوە شیرکەو هەر نابێ بەتەئکید، بەڵێ ئەگەر زیندوو بێ، دەتوانی بچی داوای لێ بکەی، یان تەکلیفی لێبکەی، بەڵام لەدوای وەفاتی، نابێ وا مامەڵەی لەگەڵدا بکەی، کە مامەڵە لەگەڵ زیندوودا دەکرێ.

# بەرایی

خوێنەری بەڕێز!

لەم بەشی سێیەم و کۆتاییەی ئەم تەوەری دووەمەدا، هەوڵ دەدەین لە دوو توێی چواردە (١٤) باسدا، چواردە ڕەوشت و ئاکاری بەرزو بنەڕەتیی، جەماوەری مسوڵمانانی پابەند بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و، جێنشینە سەرراستەکانی {أبو بكرو عمرو عثمان و علي و حسن}، خوا لێیان ڕازی بێ بەتایبەت و، هاوەڵانی دڵسۆزی و خزم و نیزیکانی بەڕێزی و شوێنکەوتووانیان بە گشتیی، بخەینە ڕوو.

هەڵبەتە ئاکاری جوان و بەرزو ڕەوشتی پەسندو ڕەندیش، چ لەسەر ئاستی تاك، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگا، سەنگی مەحەکی دینداریی و مسوڵمانەتیی و بۆ خوا صوڵحان و سەر ڕاستییە.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە مەوسووعەی: {ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی} دا، لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلمان لەبارەی کۆی ڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسندەکانەوە کردوە.

تایبەتمەندییە ئاکارییەکانی جەماوەری مسوڵمانان:

١)- جەماوەری مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵان و بنەماڵەو خەلیفەکانی: باشترینی خەڵکن بۆ کۆمەڵگاو دەورو بەریان.

٢)- دانانی ڕەوشتی بەرز و ئاکاری پەسند بەبەشێك لەدینداریی و بەرهەمی ئیمان.

٣)- فەرمان بەپەسندو ڕێگریی لە ناپەسند.

٤)- فەرمانبەریی بۆ حوکمڕانان لە سنووری پەسند (معروف)داو دڵسۆزیی و هاوکاریی بۆ نواندنیان.

٥)- بەڕێز و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستییەوە، پێکەوە مامەڵە کردن.

٦)- تەنیا لایەنگیریی کردنی حەق و ڕاستیی و دادگەریی.

٧- خۆپاراستن لە شانازیی کردن بەهەر ناوو نیشانێکەوە، جگە لە ئیسلام و مسوڵمانەتیی.

٨)- خۆپاك و چاککردنی بەردەوام ( تزكية النفس).

٩)- دنیا بەکەمگرتن و دوارۆژ هەڵبژاردن بەسەر دنیادا (الزهد في الدنيا وإيثار الآخرة).

١٠)- گرنگیی دان بە کۆمەڵگاو، سوور بوون لەسەر دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی.

١١)- تەبایی و گونجاویی (الألفة والإنسجام).

١٢)- هەڵبژاردنی ئاسانیی لە بازنەی شەریعەتداو، خۆو خەڵك سەغڵەت نەکردن.

١٣)- ڕوو خۆشیی و زمان شیرینی و نەرم و نیانیی.

١٤)- پۆشینی عەیب و عاری خەڵك و، مشوور لێ خواردنیان و جێبەجێ کردنی پێداویستییەکانیان.

یەکەم

## جەماوەری مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان و بنەماڵە و خەلیفەکانی: باشترینی خەڵکن بۆ کۆمەڵگاو دەورو بەریان

ئەمە یەکەمین خەسڵەتی بەرزو ئاکاری پەسندی جەماوەریی مسوڵمانانی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەری خواو (صلی الله علیه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکانە.

ئێستاش با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بە پێزەی قورئانی بەرزو بەڕێز بدەین، لەو بارەوە:

١- خوا سبحانه و تعالی لە ئایەتی (١١٠)ی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیدا کراون.

باشترین کۆمەڵن، واتە: لە هەموو ڕوویێکەوە دەبێ باشترین بن:

١- ڕەوشت و ئاکارتان لەگەڵیان جوان بێ.

٢- بۆیان دڵسۆز بن.

٣- لەگەڵیان بەبەزەیی و بەپەرۆش بن.

٤- ڕێزو حورمەتیان بگرن.

٥- لەگەڵیان ڕووگەش بن.

٦- گفت و لفتتان لەگەڵیان شیرین بێ.

هەڵبەتە لەگەڵ خەڵکیدا بە گشتیی: بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوەو لە هەموو حاڵانداو، لە هەموو کاتێك و لە هەموو شێنێکدا.

٢- خوا (عز وجل) لە ئایەتی (١٠٧) سوورەتی (الأنبياء)دا، کە پێشتریش هێناومانە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾.

خوا بە پێغەمبەر (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی بی، بۆ تێکڕای جیهانییان.

ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کە پێشەوای ئۆممەتە، بەزەیی خوا بێ بۆ جیهانییان، دیارە ئێمەش دەبێ هەوڵ بدەین لە قەدەر خۆمان، وەك پێغەمبەرەکەمان (صلى الله عليه وسلم) بین و مایەی ڕەحمەت بین بۆ خەڵك، نەك مایەی سەر ئێشەو زەحمەت، ئایا نابێ بەدوای وی بکەوین؟ با، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ﴿٢١﴾ ﴾، الأحزاب.

واتە: بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا، باشترین سەرمەشق بۆ ئێوە هەیە.

کەواتە: ئەگەر ئەو مایەی ڕەحمەت بوو بۆ جیهانییان، بەلای کەمەوە: با ئێمەش ڕەحمەت بین بۆ دەرو جیران و ئەوانەی کە لێمان نزیکن، هەر کەسە لە قەدەر خۆی.

٣- خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٨٣)دا، دەفەرمووێ:
﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا﴾.

واتە: قسەی باش لە گەڵ خەڵك بكەن.

٤- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٥)دا، دەفەرمووێ: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾.

واتە: چاكە بكەن لەگەڵ خەڵكدا بە گشتیی، بە دڵنیاییی خوا چاكەكارانی خۆش دەوێن.

ئەوەی پێشێیان دەفەرمووێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا﴾، بە گشتی قسەی باش لەگەڵ خەڵكدا بكەن، ئەوەی دووەمیان دەفەرمووێ: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْ﴾، بە كردار لەگەڵ خەڵكدا بە گشتیی چاكەكار بن.

برا و خوشكانی خۆشەویست و بەڕێز! دەبێ وریابین، ئەگەر بمانەوێ مسوڵمانی باشبین و، بە شوێنكەوتووانی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی بەڕێزی و، خەلیفە ڕاشیدەكانی لە قەڵەم بدرێین، دەبێ هەوڵبدەین باشترینی خەڵك بین بۆ خەڵك.

دووەم

## دانانی ڕەوشتی بەرز و ئاکاری پەسند، بەبەشێك لەدینداریی و بەرهەمی ئیمان

{جەماوەری مسوڵمانان} هەمیشە ڕازاوە بوون بەڕەوشتی بەرز و ئاکاری پەسند، کە ئەوەش لە دینداریی و ئیمانەکەیانەوە سەرچاوەی گرتوە، چونکە خوا سبحانە وتعالی بەندەکانی خۆی، وا پێناسە دەکات.

با سەرنجی ئەم دەقانەی شەریعەت بدەین:

١- خوا لە سەرەتای سووڕەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝٣ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ۝٤ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ۝٥ ﴾

واتە: بەڕاستیی بڕوادارانێك سەرفرازن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن بۆ خوا، ئەوانەی کە واز لە قسە و ڕەفتاری پووچ دێنن و، پشتی تێدەکەن و، ئەوانەی کە زەکات ئەنجام دەدەن (واتە: تەزکیەی نەفس دەکەن، یان زەکات دەدەن لە ماڵی خۆیان) و ئەوانەی کە داوێنی خۆیان دەپارێزن و.. تاکۆتایی سیفەتەکان، کە (١٠ - ١٢) سیفەتن.

٢- لە کۆتایی سوورەتی (الفرقان)یشدا، خوا سبحانە وتعالی سێزدە چواردە سیفەت باس دەکات، دەفەرمویٚ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾، بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی کێن؟

﴿ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ ﴾.

تاکو سێزدە چواردە سیفەت باس دەکات، کەواتە: ئەگەر بەندەی خوای خاوەن بەزەیی بین، دەبیٚ ڕازاوە بین بەو سیفەتانەو، ئەگەر ئیماندار بین، دەبیٚ خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزانە بین.

٣- پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) دەفەرمویٚ: {أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا} أخرجه أحمد برقم (١٠٨١٧)، والدرامي برقم (٢٨٣٤)، وأبي داود برقم (٤٦٨٢)، وإبن حبان برقم (٤٧٩)، والترمذي برقم: (١١٦٢)، وصححه الألباني.

واتە: ئیمان تەواترینی بڕواداران، ڕەوشت جوانترینیانن.

### تێبینییەکی گرنگ لەو بارەوە:

لێرە با هەڵوەستەیەکی کورت بکەین، زۆر جار خەڵکی ئێمە، خەڵکی ئیسلامیی وای زانیوە کە دەبیٚ لەگەڵ خەڵکدا بەبیانووی (ولاء وبراء) {دۆستایەتیی لەبەر خوا و دوژمانیەتیی لەبەر خوا}ەوە، لە مامەڵە لەگەڵ غەیری خۆیاندا، لە جیاتی ڕێزو حورمەت و ڕوو خۆشیی و خۆشرەفتاریی، زبریی و گرژیی و مۆن و مرچییان، بکەنە پیشە! کە بێگومان تێکەڵ کردنی ئەو شتانە، هەڵەی کوشندەیەو شوێنەواری زۆر شوومی هەن، بەڵیٚ وەك عەقیدە و بیر و بڕوا: هەر بەرنامەیەکی جگە لە ئیسلام و دژ بە ئیسلام، دەبیٚ بە گومڕایی و سەرگەردانیی و کوفر دابنێین، بەڵام مەرج نیە هەرکەسێك بیر و بڕواکەیمان بەهەڵە دانا، یان بە کوفر دانا، مامەڵەمان لەگەڵیدا زبرو ناحەزانە بیٚ، بەڵکو دەبیٚ لە گەڵ هەموو کەسدا مامەڵەمان جوان بیٚ، ڕەوشتمان بەرزبیٚ، بەڕەحم

بین، بە شەفەقەت بین، ڕوو خۆش بین، دادگەر بین، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر ئاوا بەڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسند مامەڵەی نەکردبایە، ئەو خەڵکە کافرو هاوبەشدانەرە مسوڵمان نەدەبوون[١].



---

(١) کاتی خۆی لە ساڵانی نەوەدەکاندا، کە بنکە و بارەگای چەکدارمان هەبوون، هەر لەو کاتەوە خوای پەروەردگار شتێکی لێ حاڵی کردبووم، کە دەبێ لەگەڵ خەڵکدا ڕەوشتمان جوان بێ، ئاکارمان پەسەندبێ، کە دەگەیشتینە بازگەکان دەمگوت: ڕایگرن! جامەکەم دەهێنا خوارەوەو سڵاوێکم لێ دەکردن، ئنجا جاری واهەبوو یەکێ لە پاسەوانەکان دەیگوت: مامۆستا! ئایا دروستە سەلام لەوانە بکەی؟ مامۆستا! ئەدی نابێ (ولاء وبراء)مان هەبێ؟ ئیدی منیش ناچار دەبووم زۆر شتیان بۆ ڕوون بکەمەوە، گەلێك بۆچوونی هەڵەیان بۆ ڕاست بکەمەوە، وەك:

١- ئەسڵ و بناغە لە تاکەکانی کۆمەڵگاو خەڵکێکی مسوڵماندا، مسوڵمانەتییە، هەتا بەڵگە لەسەر پێچەانەکەی دەبێ.

٢- یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و مسوڵمانان، ئەوەیە بەردەوام سڵاو بڵاو بکرێتەوە، سڵاویش لە هەموو کەس ناسراوو نەناسراو بکرێ: {أَفْشُوا السَّلَامَ} أخرجه الترمذي برقم (١٨٥٤) وقال: حسن صحيح غريب. {وتُقريء السلام على مَن عرفت ومن لم تعرف} أخرجه أحمد برقم (٦٥٨١)، والبخاري برقم (١٢)، ومسلم برقم (٣٩)، وأبو داود برقم (٥١٩٤)، والنسائي في الكبرى برقم (١١٧٣١)، وابن ماجه برقم (٣٢٥٣).

٣- دەبێ لە بەرانبەر چاکەدا، هەر چاکە بکرێ ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الرحمن.

ئەوانەش کە لە بازگەکاندا دەوەستن بۆ پاراستنی هێمنیی و ئاسایشی هاووڵاتییانەوە، پێویستە لەسەر ئەو چاکەو خزمەتەش هاوکاریی بکرێن و سوپاس و تەقدیر بکرێن.

# سێیەم

## فەرمان بەپەسندو ڕێگریی لە ناپەسند

چونکە خوا سبحانە وتعالی لە ئایەتی ژمارە (٧١)ی سوورەتی ( التوبة) دا، ئیماندارانی بەگشتیی بەپیاو و ئافرەتەوە، وا پێناسە کردوە، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾.

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیان، فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەکەن و، ڕێگریی لە هەرچی شتی ناپەسندە دەکەن....

ئنجا بابەتی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) بابەتێکی یەکجار فراوان و بە لق و پۆپەو، زۆریش گرنگ و هەستیارەو، توێژینەوەی پێویستیی بە کات و شوێنێکی تەرخان کراو دەکات و، لە کتێبی دەیەمی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}دا، لە باسێکی گوشراودا، هێڵە گشتییەکانیم خستوونە ڕوو.

لێرەش بە خستنە ڕووی حەوت پایەی گرنگی ئەو ئەرکە مەزنە، بە کورتیی و گوشراویی وازی لێ دێنین:

**یەکەم:**

هەردووک وشەی (المعروف) و (المنکر) کە ئەلیف و لامی (تعریف) یان لەسەرە، هەموو تاکەکانی پەسندو ناپەسند، لەسەرجەم بوارەکانی: فیکرو عەقیدەو، خواپەرستیی و، ڕەوشت و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی و، ئابووریی و ...هتددا، دەگرنەوە.

**دووەم:**

هیچ کەس ناتوانێ - چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ- ئەو ئەرکە گەورەو گرنگە جێبەجێ بکات، هەتا ڕازاوە نەبێ بە:

١- زانیاریی و شارەزایی.

٢- بەزەیی و دڵسۆزیی.

٣- خۆڕاگریی و پشوو درێژیی.

٤- ڕەوشت بەرزیی و ئاکار پەسندیی.

٥- هێدیی و مەندیی و نەرم و نیانیی.

٦- حیکمەت و کارامەیی.

٧- خوا پێ مەبەست بوون (إخلاص)و دووریی لە ڕیایی و ڕووەدربایسی.

**سێیەم:**

هەرگیز نابێ مرۆڤ بچێتە ئەو مەیدانەوە - بەتاکیی یان بە هەرەوەزیی- تاکو ئەو پەسندانەی فەرمانیان پێ دەکات، خۆییان پێ نەڕازێنێتەوەو، ئەو ناپەسندانەی ڕێگرییان لێ دەکات، خۆییان لێ بژار نەکات.

**چوارەم:**

هەڵسان بەو ئەرکە مەزن و هەستیارە، لە ئەسڵدا ئەرکی کۆمەڵگایە بە گشتیی، وەك هەر کام لە ئایەتی (١٠٤)ی (آل عمران):

﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٌ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ ﴿١٠٤﴾ ﴾ و ئایەتی (٧١)ی (التوبة): ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة، زۆر بەئاشکرا دەیگەیەنن.

هەر بۆیەش هەرکات کۆمەڵگای مسوڵمان دەستبەرداری ئەو ئەرکە بوو بۆ دەستەڵات و حوکمڕانان، لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی دەبێتەوە، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا، کە دەوڵەت و قەوارە سیاسییەکان، یان ناحەزو نەیاری ئیسلامن، یان هەر بە شێوەیەکی ڕووکەش بۆ چاوبەستی جەماوەر، ڕەنگێکی ئیسلام لە خۆیان هەڵدەسوون!

بەڵام پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکرێن، لە کاتی هەڵسان بەو پڕۆسەیەی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسندا:

١)- ئەو ناپەسند (منکر)ەی دەویسترێ و هەوڵ دەدرێ: ڕێی لێ بگیرێ، یان لاببرێ، بەهۆی ئەو هەوڵدانەوە، ناپەسند (منکر)ێکی لە خۆی زلتر، یان وەك خۆی، نەیەتەجێی.

٢)- یان بەهۆی ڕێ لێگرتن و لابردنی ئەو خراپەیەوە، چاکەو پەسند (معروف)ێك نەفەوتێ، کە سوودو خێرەکەی، لە زیان و زەرەری ئەو ناپەسند (منکر)ە گەورەتر بێ.

٣)- هەروەها بەهۆی هەوڵدانەوە بۆ چەسپاندنی پەسند (معروف)ێك، پەسندێکی گەورەتر نەفەوتێ.

٤)- هەروەها بەهۆی هەوڵدان بۆ چەسپاندنی پەسندێکەوە، خراپەو ناپەسند (منکر) پەیدا نەبێ کە زیانی لە سوودی ئەو پەسندو چاکەیەی هەوڵ بۆ چەسپاندنی دەدرێ، زلتر بێ.

چونکە شەریعەت بۆ چەسپاندن و زیاد کردنی پەسندەکان (معروفات)و، نەهێشتنی یان کەم کردنەوەی ناپەسندەکان (منکرات) هاتووە، هەر شتێك ببێتە مایەی سەرهەڵدانی پێچەوانەی ئامانج و حیکمەتی شەریعەت، ناڕەوایە.

**پێنجەم:**

پێویستە هۆشیارو ئاگادار بین کە ئەرکی {فەرمان بە پەسند کردن و، ڕێ لە ناپەسند گرتن} کە وەك گوتمان لە ئەسڵدا ئەرکی کۆمەڵگای مسوڵمانە، جیاوازە لە {جێبەجێ کردنی سزاو سنوورە شەرعییەکان} {تنفيذ العقوبات والحدود الشرعية}، کە ئەمیش لە بناغەدا ئەرکی حکوومەتەو، نابێ هیچ کەس بە بیانووی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەوە، خۆی بخزێنێتە نێو جوغزی جێبەجێ کردنی سزاو سنوورە شەرعییەکانەوە.

**شەشەم:**

جەوهەرو کاکڵی {فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە} بریتیە لە ڕێگرتن لە ئەنجام دران و بڵاو بوونەوەی گوناح و خراپەو لادان و، هاندانی خەڵك لەسەر ئەنجامدانی چاکەو چاکەکاریی و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)، نەك ئازاردانی خەڵك و گێچەڵ پێکردنیان و ئاژاوە نانەوە.

**حەوتەم:**

مادام ئامانج و حیکمەتی فەرمان بە چاکەو، ڕێگرتن لە خراپە، بریتیە لە پاکسازیی و چاکسازیی تێدا کردنی کۆمەڵگا، کەواتە: دەبێ بە وریاییەوە ئەو ئەرکە مەزن و گرنگ و هەستیارە ئەنجام بدرێ و، وانەبێ قازانجی سەری مایەی بخوات.

## چوارەم

## فەرمانبەریی بۆ حوکمڕانان لە سنووری پەسند (معروف)داو، دڵسۆزیی و هاوکاریی بۆ نواندنیان

ئەمەش یەکێکە لەو ئاکارو سیفەتانەی کە {جەماوەری مسوڵمانان} هەمیشە مامەڵەیان پێ لەگەڵ ئەوانەدا کردوە کە کاربەدەستن، حوکمڕانن، کە لە سنووری بەپەسند زاندراو (معروف) و، لە بازنەی شەریعەتدا هاوکاریی باشیان لەگەڵیان کردوەو دڵسۆزییان بۆ نواندوون و، فەرمانبەرییان بۆ کردوون، نەك لێیان لە بیانوو بن و، هەمیشە گێچەڵیان پێ بکەن و تەشقەڵەیان پێ بکەن، هەڵبەتە ئەو حوکمڕانانەی کە مسوڵمانان دایان دەنێن و، بەڕێی شەریعەتدا دەڕۆن، بەڵام بەرپرسانێك کە مسوڵمانان لەگەڵیاندا گیرۆدە دەبن و، بەپێی شەریعەتیش بەڕێوە ناچن، ئەوانە وێڕای ئەوەی کە دەبێ بەرهەڵستیی ستەم و خراپەیان بکرێ، دەبێ لە هەرچی شەرعیی و چاکەشە، لە گەڵیاندا هاوکاربن، چونکە وڵات هەر دەبێ سەرپەرشتیار و حوکمڕانێکی هەبێ، بەڵام لە شتی ناشەرعییدا، دەبێ لە گەڵیاندا نەیاربن و، دەستبارگریان نەبن.

با تەماشای ئەم دەقانەی خوارەوە بکەین:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن و، هی سەرپەرشتیارانێك، کاربەدەستانێك، کە لەخۆتانن.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي المَعْرُوفِ} رواه البخاري برقم (٧١٤٥)، ومسلم برقم (٧).

واتە: بێگومان فەرمانبەریی کردن بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان، تەنها لە سنووری پەسند دایە.

٣- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِلَّهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ} رواه مسلم برقم (٩٥).

واتە: دینداریی دڵسۆزییە، گوتمان بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بۆ خواو، بۆ کتێبەکەی و، بۆ پێغەمبەرەکەی و، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و، بۆ مسوڵمانان بە گشتیی.

بەڵێ ئەمیش یەکی دیکەیە لە ئاکارو ڕەوشتەکانی {جەماوەری مسوڵمانان}، بەڵام هەر کام لە خەواریج و شیعە و، زۆرێك لەو پیڕ و تاقمانەی کە لەخەتی گشتیی ئیسلام و مسوڵمانان لایانداوە، هەر لە بیانوو بوون لە حوکمڕانانیان.

پێشتریش ئەو مەسەلەیەمان تۆزێك باس کردو، بەڕاستیی پێویستیی بە توێژینەوەی زیاتر دەکات، بەڵام لێرە لەڕووی ڕەوشتیی و ئاکارییەوە، قسەمان لەبارەیەوە کرد، کە زۆربەی مسوڵمانان عادەتیان وابووە، لە حوکمڕانانی خۆیان لەبیانوو نەبن، کە هەمیشە سەنگەریان لێبگرن و، گێچەڵیان پێ بکەن و، ئاژاوە پەیدا بکەن، تەنانەت کە دوایی ناو لە زۆربەی مسوڵمانان نراوە: (أهل السنة والجماعة) لەبەر ئەوە بووە کە لەلایەکەوە: لە ڕووی فیکریی و تێگەیشتنەوە: ڕێبازی پێغەمبەریان گرتوە (صلى الله عليه وسلم)و، لە ڕووی سیاسیشەوە: کۆبوون و بڕوایان بە کۆبوونەوەو پێکەوە بوون هەبووە، نەك تاقم تاقمێنە و، دابڕ دابڕ بوون.

# پێنجەم

## بەڕێز و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستییەوە، پێکەوە مامەڵە کردن

ڕەوشت و ئاکارێکی دیکەی بەرزو پەسندی {جەماوەری مسوڵمانان} ئەوەیە کە: هەم بەڕێز، هەم بەڕەحم و سۆز، هەم بەخۆشەویستیی، پێکەوە مامەڵە دەکەن.

با سەرنجی ئەم دەقانە بدەین:

١- خوا سبحانە وتعالى لە سووڕەتی (الحجرات) ئایەتی (١٠)دا دەفەرموێ:
﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠ ﴾.

واتە: بێگومان بڕواداران برای یەکدین، {برا و خوشکی یەکدین}، بۆیە دوو برا ناکۆکەکەتان ئاشتەواییان لە بەیندا بکەن و، پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێندرێ.

٢- پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێك زۆر جوان بۆمان وێنا دەکات، کە ئیمانداران دەبێ پێکەوە چۆن بن؟ ئەو فەرمایشتانەتان زۆر جار بیستوون، بەڵام بەخوا بەرجەستە کردن و جێ بەجێ کردنیان، زۆری دەوێ، دەبێ ئینسان زۆر لە خۆی وریابێ، دەفەرموێ: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ، وَتَرَاحُمِهِمْ،

وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى}
رواه مسلم برقم (٦٦)، وأحمد برقم (١٨٣٧٣).

واتە: وێنەی بڕواداران لە یەکدی خۆشویستن و، بەزەیی بۆ یەك نواندن و، هاوسۆزیی پێکەوە بوونیاندا، وەك یەك جەستە وایە، کە ئەگەر ئەندامێکی گرفتێکی هەبێ، نەخۆشییەك ئازارێکی هەبێ، هەموو جەستە لەگەڵیدا بەشدار دەبێ، بە تا لێهاتن و شەونخوونیی.

ئینسان ددانێکی بێشێ، ئیسراحەتی لێ تێك دەچێ و، هەموو ئەندامەکانی لەگەڵیدا بەشدار دەبن، ئێمەش دەبێ لەگەڵ یەکدا وابین، بۆیە وەك برای دڵسۆزی خۆتان پێتان دەڵێم: ئایەتەکانی قورئان و ئەم فەرمایشتانە، بکەنە ئاوێنەو خۆتانیان لەبەرامبەردا ڕابگرن: ئایا هەست بە ئازاری موسوڵمانان دەکەی؟ هەست بەخۆشییان دەکەی و بەخۆشییان دڵ خۆشی؟ بەناخۆشییان دڵ ناخۆشی؟ چاکەیانت پێ خۆشە؟ زەرەریانت پێناخۆشە؟ بێگومان ئەوەش ئاسان نیە، لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سێ ڕۆژان لەسەر یەك دەیفەرموو: ئێستا پیاوێك دێ لێتان وەژوور دەکەوێ، ئەهلی بەهەشتە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای فەرموو، پیاوێك دەهات، دەست نوێژی گرتبوو، نەعلەکانی بەدەستی چەپی گرتبوون، دەهاتە ژووری مزگەوتێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر سێك ڕۆژان وای فەرموو، هەر ئەو پیاوە هات، دەڵێ: منیش ڕۆژی سێیەم بۆ ئێوارە گوتم: ئەی بەندەی خوا! من دەمەوێ شەوێ بێم بۆلای جەنابت و میوانی ئێوەبم، ئەگەر میوان ڕابگری {لەبەر ئەوەی گەنج بووەو ژنی نەهێناوە} لەگەڵ بابم تۆزێك بەینم تێکچووە، پێم خۆشە جەنابت بم حەوێنیەوە، گوتی: فەرموو، منیش سێ شەوان لەلای بووم {سێ شەوو سێ ڕۆژ، دیارە شەو لەلای بووە لەماڵیان خەوتوە، دوایی بەڕۆژ بۆخۆی ئیش و کاری خۆی کردوە}، دوای سێ ڕۆژەکە گوتم: ئەگەر ڕوخسەتم بدەی دەڕۆم، گوتی: ئەدی نەتگوت: لەگەڵ بابم بەینم تێك چووە! ئایا ئاشت بوویەوە؟ دەڵێ: گوتم: ڕاستییەکەی بۆیە وامگوت،

تاکو مەجالم بدەی لەماڵی ئێوەدا بمێنمەوە، لە بەر ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سێ ڕۆژان شتێکی وای فەرموو، هەر سێ ڕۆژەکانیش تۆ دەهاتی، منیش هاتم تەماشات بکەم داخۆ دینداریی و کردەوەی تۆ چۆنە؟ بەڵکو وەك تۆ بکەم و بەر ئەو موژدەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەوم، بەڵام هیچی زیادەشم لێ نەبینی!! {دیارە ئەگەر ئەو شەو نوێژی بووە، ئەویش بوویەتی و، تاعەتەکەیان هەروەك یەك بووە}، ئەویش گوتی: هەر ئەوەیە کە بینیوتە، ئنجا ڕۆیشتم و تۆزێك دوورکەوتمەوە، بانگی کردم گوتی: بەڵام یەك شتی دیکەش هەیە، گوتم: چییە؟ گوتی: لەو پەڕی دنیا مسوڵمانێك قازانج بکات، لێرە دڵم پێیخۆشەو وادەزانم من قازانجم کردوەو، لەوپەڕی دنیا مسوڵمانێك زەرەرێکی بێتە ڕێ، وادەزانم زەرەری خۆمە هاتۆتە ڕێم، ئەوەندە پێی نارەحەتم و، هیچ شتێکم لەدڵدا نیە بەرامبەر بەکەس {وەك: بوغز و غەرەز و حەسەد} دەڵێ: گوتم: ئەوەیە کە ئێمە نایتوانین[1].

برا و خوشکان! زۆر کەس لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ، دەڵێن: جارێك کەسێك گەیشتۆتە کەسێك لەدێیەکەوە هاتوە گوتوویەتی: ئەرێ خەڵکی ئەو دێیە چۆنن؟ گوتوویەتی: هەموویان ئینسانی چاکن و خراپیان تێدا نیە، دوایی گەیشتوە بە یەکێکی دیکە، گوتوویەتی: خەڵکی ئەو دێیە چۆنن؟ گوتوویەتی: هەمویان خەڵکی خراپن! دیارە هەر کامێکیان لە هەمبانەی خۆیدا گوێزی ژماردوون، ئنجا با هەوڵ بدەین هەمبانەکەمان گوێزی باشی تێدابن، بۆ ئەوەی خەڵك بەشێوەی باش ببینین، بەڵام سافیلکەو سادەش نەبین، پێمان وابێ، ئەگەر بۆ خۆمان چاك بووین، خەڵکیش هەمووی وایە، بەڵام بەڕاستیی پێویستە ئینسان سینەی ساف بێ و، گرێ و گۆڵی نەبێ، تاکو وا تەماشای خەڵك نەکات، کە خەڵکی هەمووی وایە، بەڵام ئەگەر خۆشمان چاك و ساف کرد، واش نەزانین: دنیا شامی شەریفەو خەڵك و هەمووی چاکە! لە کۆتاییدا دەڵێم: ئاسان نیە کە ئینسان وای لێبێ، قازانج و سوودی خەڵك زەرەرو زیانیانی، پێ وەك هی خۆی بێ و، بەخۆشییان دڵخۆش بێ و، بە ناخۆشییان دڵناخۆش بێ.

---

(١) بڕوانە: (الترغيب والترهيب من الحديث الشريف)، للمنذري ج٣ ص٥٤٨-٥٥٠، وقال: رواه أحمد بإسناد على شرط البخاري ومسلم والنسائي، ورواه البيهقي وأبو يعْلى والبزار بِنَحْوِهِ عن أنس بن مالك.

## شەشەم

# تەنیا لایەنگیریی کردنی حەق و ڕاستیی و دادگەریی

{جەماوەری مسوڵمانان} لایەنگیرییان بۆ هیچ کۆمەڵێك نیەو، بۆ هیچ کەسێك نیە، لەسەر بناغەی دەمارگیریی: ئەوە عەشیرەتمە، ئەوە نەتەوەو هاوزمانمە، ئەوە هاونیشتیمانمە، فڵانکەس دۆست و ناسیاومە، فڵانکەس لە حیزبەکەم دایە، لایەنگیریی لەمەسەلەی حەق و ناحەقدا نابێ لەسەر ئەو بناغانەبێ، بەڵکو دەبێ لەسەر بناغەی هەق و دادگەریی بێ، با تەماشای ئەم دەقانەی خوارەوە بکەین:

١- خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٣٥)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٣٥﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر دادگەریی بەڕێوەبەرن {(كُونُواْ قَوَّٰمِينَ ) (قَوّام): صیغەی موبالەغەی (قائم)ە}، بۆ خوا شایەدیی بدەن، ئەگەر

بەزیانی خۆشتان بێ، یان بەزیانی باب و دایکتان بێ، یان بەزیانی خزمانتان بێ و، ئەگەر ئەو کەسە کە شایەدییەکەی بۆ دەدرێ، دەوڵەمەند بێ، یان هەژاربێ، خوا لێی لەپێشترە {نە لەبەر دەوڵەمەندییەکەی شایەدییەکەی لەدژ بدەو، نە شایەدییەکەشی بۆ بدە بەناحەق، هەروەها ئەگەر هەژاریش بێ، لەبەر هەژارییەکەی نەچی شایەدییەکی بە ناهەقی بۆ بدەی، بەزەییت پێیدابێ، هەروەك شایەدییەکی ناهەقیشی لەدژ نەدەی، لەبەر ئەوەی کە هەژارەو بێ دەستەڵاتە} (فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ) بەدوای ئارەزووو مەکەون کە سەرەنجام لابدەن ( وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ ) ئەگەر مل بسووڕێنن بەرەو ناحەق، یاخود پشت بکەنە هەق (فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ) بێگومان خوا بەوەی کە دەیکەن شارەزایە.

بەڕاستی ئەوەش ئاسان نیە ئینسان لەگەڵ حەقی موتڵەق دابێ: بەزەرەری هەرکەسێك بێ، یاخود بە قازانجی هەر کەسێك بێ، گوێنەداتە نزیکایەتیی و، خزمایەتیی و، برادەرایەتیی.

٢- پێغەمبەرمان (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ}، رواه أبي داود برقم (٤٦٨١)، وصححه الألباني.

واتە: هەرکەسێ لەبەر خوا خەڵکی خۆش بوێ و، لەر خوا ڕقی لێیان هەڵسێ (لەبەر خوا خۆشی بوێن واتە: کردەوە چاکەکانیان، لەبەر خوا ڕقی لێیان هەڵسێ واتە: لە کردەوە خراپەکانیان) و، لەبەر خوا ببەخشێ و، لەبەر خوا نەبەخشێ و دەست بگرێتەوە، ئا ئەوە ئیمانی تەواو کردوە.

٣- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أوثق عرى الإيمان: الموالاة في الله والمعاداة في الله، والحب في الله والبغض في الله عز وجل}، السلسلة الصحيحة برقم (٩٩٨).

واتە: پتەوترین قوڵفەی دینداریی، بریتیە لە دۆستایەتیی کردن لە پێناوی خواداو، دوژمنایەتیی کردن لە پێناوی خواداو، خۆشویستن لە پێناوی خواداو، ڕق لێ هەڵسان لە پێناوی خوادا.

## حەوتەم

## خۆپاراستن لە شانازیی کردن بەهەر ناوو نیشانێکەوە، جگە لە ئیسلام و مسوڵمانەتیی[1]

ئەمیش یەکی دیکەیە لە خەسڵەتە بەرزو ئاکارە پەسندەکانی {جەماوەری مسوڵمانان}ی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕاشیدەکانی بە تایبەتیی و، هاوەڵان و خزمانی بەڕێزو دڵسۆزو شوێنکەوتووانی ڕەسەنیان، بە گشتی.

ئنجا ئەمەش دەردێکی کوشندەی ئەمڕۆی مسوڵمانانە، کە هەرکەسە خۆی بە ناوو نیشانێکەوە هەڵدەکێشێ، بەڵام {جەماوەری مسوڵمانان} خۆیان لە شانازیی کردن بەهەر ناوونیشانێکەوە، جگە لەئیسلام و مسوڵمانەتیی دەپارێزن، بەس شانازیی دەکەن بە ئیسلامەتییەوەو، خۆیان بەهیچ شتێکی دیکەوە هەڵناکێشن، بۆ وێنە: ئێمە بڵێین: ئێمە کۆمەڵی ئیسلامیین و، کۆمەڵی ئیسلامیی هەمووی برنجی شۆراوەیەو، هیچ کەم کوڕیی تێدا نیە، ئەوەی لەگەڵ ئێمەبێ، هەمووی تەواوە، بەڵام ئەوەی لەگەڵ ئێمە نەبێ، وانیە!! کە ئەوە هەمووی دەمارگیرییە.

---

(١) ئەمەیان درێژەیەکی هەیە.

یان ئێمە ئیسلامیین و ئەوەی ئیسلامیی نەبێ، مانای وایە ڕەنج بەخەسارە، ئەوەشیان وانیە، ئیسلامیی بەمانا حیزبییەکەی، ئەگەرنا بەمانا زمانەوانیی و حەقیقییەکەی، هەموو مسوڵمانێك هەر دەبێ دوای ئیسلام بکەوێ و ئیسلامیی بێ، بەڵام ئێستا {ئیسلامیی بوون} مەفهوومێکی عورفیی وەرگرتوە واتە: ئەوەی کە لەگەڵ لایەنێکی ئیسلامیی دابێ.

نەك هەر ئەوە، بەڵکو خوا سبحانە وتعالی بەناوی مسوڵمانەتییشەوە، ڕێی لە خۆهەڵکێشان و خۆ پەسندیی گرتوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: بەخۆزگە خواستنی ئێوە و خۆزگە خواستنی خاوەن کتێبەکان نیە، هەرکەسێك خراپە بکات، سزای دەدرێتەوەو لەلایەن خواشەوە هیچ سەرپەرشتیار و یارمەتیدەرێکی چنگ ناکەوێ.

هەرکەسێك خراپە بکات، یانی: خاوەن کتێبێك، یاخود ئەهلی ئیسلام، خراپە هەر خراپەیەو، چاکەش هی هەر کەسێك بێ، هەر چاکەیە

هەروەها لەئایەتی (١٧٧)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ ﴾.

واتە: چاکە ئەوە نیە کە ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا، ئەم ئایەتەش لەوبارەوە هاتە خوار، کە مسوڵمانان لەگەڵ نەصرانییەکان و، جوولەکەکاندا، کێشەیان بوو، قیبلەی کامیان ڕاستترە[1]؟

بەڕاستی برا و خوشکانی بەڕێز! زۆر گرنگە ئێمە تەماشای نێوەڕۆکی مسوڵمانەتیی بکەین، تەنیا تەماشای دروشم و ڕواڵەتەکەی نەکەین، هەروەها

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١، ص٩٧، أخرجه ابن أبي حاتم في تفسيره: ١٥٤١، والطبري في (جامع البيان) (٥٦/٢)، قلنا: وهذا سند ضعيف.

دەبێ جگە لەناوی مسوڵمانەتیی و، جگە لە ناوی ئیسلام، هیچ ناوو نیشانێکی دیکە نەکەینە پێناسەی خۆمان و بناغەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (أساس الموالاة والمعاداة) بەتایبەت لایەنە ئیسلامییەکان، دەبێ وریابن، دیسان ئەهلی تەریقەت دەبێ وریابن، هەروەها ئەوانەی ناو لەخۆیان دەنێن: سەلەفیی دەبێ وریابن! دوایی باسی ئەوەش دەکەم کە ناوی {سەلەفیی} لەخۆنان، تا چ ڕاددەك ڕەوایە؟ دیارە بەو واتایە، ئەگەر حزبێك دروست بێ، بڵێن: {حیزبی سەلەفیی}، وەك لە میصر هەیە، هیچ ئیشکالی نیە، ئەوە حیزبێکە و تەواو، بەڵام یەکێك بڵێ: من سەلەفییم، بەو واتایەی تەنیا من بەدوای سەلەفی صالح دەکەوم، ئا ئەوە:

**یەکەم:** خۆهەڵکێشانەو تەزکییەی نەفسی خۆ کردنە.

**دووەم:** بەچاوی کەم تەماشاکردنی غەیری خۆیە، ئەوەی ئەو ناوە بەکارناهێنێ.

ئێستاش با سەرنجی ئەم چەند دەقەی شەریعەت بدەین:

١- لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا، خوای بێ وێنە دەفەرموێ:

﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾ ﴾.

لێرەدا: ئەو ڕستەیەم مەبەستە کە خوا دەفەرموێ: (هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا) واتە: خوا ناوی لێناون مسوڵمان، پێشتر {لە کتێبە پێشووەکاندا} و، لەمەشدا، {واتە: لەم قورئانەشدا، خوا یەك ناوی بۆ ئێوە بەکارهێناوە، کە بریتیە لە مسوڵمانان یانی: ئەوانەی کە بۆ خوا ملکەچن}.

٢- لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی (٣٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

واتە: قسەی کێ چاکترە لە هی کەسێك، کە خەڵك بۆلای خوا بانگ دەکات و، کردەوەی باش دەکات و، دەڵێ: من لە مسوڵمانانم {خۆی لێیان جیا ناکاتەوە!}.

٣- هەروەها لەو بارەوە ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دێنین: {عن جابر بن عبدالله قال: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، وَقَدْ ثَابَ مَعَهُ نَاسٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ حَتَّى كَثُرُوا، وَكَانَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلٌ لَعَّابٌ، فَكَسَعَ أَنْصَارِيًّا، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ غَضَبًا شَدِيدًا حَتَّى تَدَاعَوْا، وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلْأَنْصَارِ، وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: مَا بَالُ دَعْوَى أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ؟}، أخرجه البخاري برقم (٣٥١٩)، ومسلم برقم (٢٥٨٤).

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) چووینە جەنگێك، خەڵکێك لە کۆچکەران لە خزمەتی دابوون زۆر بوون {واتە: زۆربەیان کۆچکەران بوون}، یەکێك لە کۆچکەرەکان پیاوێکی سوعبەتچیی بوو {(لَعَّابٌ) یانی: یاریی و گاڵتەو گەمەی دەکرد، قسەی سوعبەتی دەکرد}، شەقێکی لە یەکێك لە ئەنصاڕییەکان هەڵدا {بەسوعبەت}، هاوەڵە پشتیوانییەکە زۆر تووڕە بوو، هەتا بانگی یەکدییان کرد، ئەنصاڕییەکە گوتی: ئەی ئەنصاڕییەکان! وەرن بۆ هاوکارییم، کۆچکەرەکەش کەشەقەکەی وەشاندبوو، ئەویش گوتی: ئەی کۆچکەران! وەرن بۆ پشتیوانییم، {ئاوا ڕوو بەڕووی یەکدی بوونەوە} پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەوە چییە، بانگەوازیی خەڵکی سەردەمی نەفامیی؟!.

ئنجا تەماشا بکەن! (مهاجرون و أنصار)، هەردووکیان وشەی قورئانیین، بەڵام مادام لەڕووی دەمارگیرییەوە بێ و، بۆ مەبەستێکی خراپ بێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە بانگەشەی نەفامیی لە قەڵەمی داوە، کەواتە: ئێمەش ئەگەر بڵێین: ئیسلامیین، بەو واتایە کە ئێمە لە خەڵکی دیکە چاکترین!! بەڵێ ڕێبازەکەمان کە قورئان سوننەتەو شەریعەتە، هەر ئەو ڕاستە، ئەوە هیچ گرێی تێدانیەو هیچ غوباری لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر بڵێین: ئێمە وەك خۆمان،

لەخەڵك باشترین، بەخوا ئەوە دەعوایەکی نەسەلمێندراوەو دەمارگیرییە، خەڵك هەیە لەژێر ئەو ناوو نیشانەی ئێمەدا کۆنەبۆتەوەو، ئینسانی زۆر باشیشە، ئێمەش ڕەنگە ئینسانی خراپیشمان تێکەوتبێ، بێگومان وایە، خۆ هەموومان برنجی شۆراوەنین، خوا هەمووڵایەکمان چاك بکات، دەگونجێ بڵێین: ئێمە بە گشتی خەڵکی چاکترمان زیاتر لە نێودایە لە خەڵکی دیکە، بەڵام بەتەئکید ئێمەش کەم و کوڕییمان هەیە.

**چەند قسەیەکی (إبن تيمية) لەو بارەوە:**

(إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ، عیبارەتێکی جوان دێنێ، پێم خۆشە لێی بخوازمەوە، لە درێژەی هەندێ قسەدا دەڵێ:

{بَلْ الْأَسْمَاءُ الَّتِي قَدْ يَسُوغُ التَّسَمِّي بِهَا، مِثْلُ انْتِسَابِ النَّاسِ إلَى إمَامٍ، كَالْحَنَفِيِّ وَالْمَالِكِيِّ وَالشَّافِعِيِّ وَالْحَنْبَلِيِّ، أَوْ إلَى شَيْخٍ، كَالْقَادِرِيِّ والعَدَوِيِّ وَنَحْوِهِمْ، أَوْ مِثْلُ الِانْتِسَابِ إلَى الْقَبَائِلِ : كَالْقَيْسِيِّ وَالْيَمَانِيِّ، وَإِلَى الْأَمْصَارِ، كَالشَّامِيِّ وَالْعِرَاقِيِّ وَالْمِصْرِيِّ، فَلَا يَجُوزُ لِأَحَدِ أَنْ يَمْتَحِنَ النَّاسَ بِهَا، وَلَا يُوَالِيَ بِهَذِهِ الْأَسْمَاءِ وَلَا يُعَادِيَ عَلَيْهَا، بَلْ أَكْرَمُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ: أَتْقَاهُمْ مِنْ أَيِّ طَائِفَةٍ كَانَ}[١].

واتە: ئەو ناوانەی کە دروستە خەڵك بەکاریان بێنێ، وەك ئەوە کە خەڵکێك خۆی پاڵداتە لای یەکێك لە پێشەوایەکان، بۆ وێنە: حەنەفیی {یانی: مەزهەبم حەنەفییەو ئەوشێوە تێگەیشتنەی ئەبو حەنیفە بۆ هەندێك لە یاساکانی شەریعەت هەیبووە، ئەوەم پێ چاکە}، یان مالیکیی، یان شافیعیی، یان حەنبەلیی، یاخود خۆپاڵدانە لای یەکێ لەڕێبازەکانی تەصەووف وەك: قادریی و، عەدەویی[٢]، وێنەی ئەوانە، یاخود وەك: خۆ پاڵدانە لای تیرەو هۆزەکان، وەك: قەیسیی و یەمانیی، یاخود خۆ پاڵدانە لای شارەکان، وەك شامیی و، عیڕاقیی و،

---

(١) مجموع الفتاوى ج٣ ص٤١٦.

(٢) (عەدەویی) ناوی ڕێبازێکی سۆفیگەریی بووە، بۆ زانیارییتان! کاتی خۆی باب و باپیرانی یەزیدییەکان شوێن کەوتووی (عدي بن مسافر) بوون، دوایی تووشی لادان بوون و، زۆر زیادە ڕەوییان تێداکردووە، بەو دەردە چوون کە پێی چوون.

مصرِیی، {ئەو ناوانە کە لە ئەصڵدا دروستە تۆ بڵێی: من عێراقییم، من شامییم، فڵان تەرِیقەتم، فڵان مەزهەبم}، بەڵام بۆ هیچ کەس دروست نیە کە خەڵك لەسەر ئەوە تاقی بکاتەوەو، دروست نیە لەسەر بناغەی ئەو ناوانە دۆستایەتیی و، دوژمنایەتیی، بەرقەرار بکات، {بۆ وێنە: یەکێك بڵێ: تۆ لە سەر فڵان تەریقەتی؟ بەڵێ! کەواتە: تۆ لە گەڵ منی، لەگەڵ فڵان تەرِیقەتی دیکەی؟ بەڵێ، کەواتە: تۆ لەمن دووری، یان خەڵکی فڵان شوێنی؟ بەڵێ، کەواتە: ئێمە هاوشارییین و لێك نزیکین، خەڵکی شارەکەی دیکەی؟ بەڵێ، کەواتە: لێك جیاین}، (بل أكرم الخلق عند الله: أتقاهم من أي طائفه كان). واتە: بەڕێز ترینی خەڵك لەلای خوا، پارێزکار ترینیانە، لە هەر کۆمەڵێك بێ و لە هەر لایەك بێ.

ئنجا ئەگەر ئینسان بتوانێ خۆی ئاوا لێبکات، مانای وایە کارێکی گەورەو گرنگی کردوە، چونکە ئێستا ئەو شتانە لە نێو ئێمەشدا هەن: هەلێریی و سلێمانیی، بادینانیی و سۆرانیی، هەروەها لەسەر ئاستی لایەنە ئیسلامییەکان و، لەسەر ئاستی هۆزەکان: ئەوە جافە و، ئەوە خۆشناوە و، ئەوە میرئاوەدلییە و، ئەوە گەردییەو، ...هتد، هەروەها لەسەر ئاستی نەتەوەکان: کوردو عەرەب و تورك و فارس و ...هتد، بەڵکو جاری واهەیە لەسەر ئاستی شتی بچووکتریش: ئایا تۆ وەك فڵان کەس بیردەکەیەوە، یان وەك فڵانکەس؟! بەڵێ دروستە ئەو ناوانە بەکاربهێندرێن، بەڵام نابێ بکرێنە بناغەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی، ئەگەر نا هیچ ئیشکالی تێدا نیە کە بڵێی: خەڵکی هەولێرم، یان خەڵکی سلێمانییم، یان خەڵکی گەرمیانم، یان خەڵکی کوێستانم، یان فڵان کەس لەهجەکەی ئاوایە، ئەوەی دیکە لەهجەیەکی دیکەیە، ئەویان کوردە، ئەوی دیکە عەرەبە، ئەوی دیکە غەیری عەرەبە، ئەوانە هیچیان ئیشکالی شەرعییان تێدا نیە، بەڵام ناکرێ بکرێن بە بناغە بۆ دۆستایەتیی و دوژمایەتیی و، لێرەشدایە کە نیشتیمان پەروەریی و نیشتیمان پەرستیی (وطنية و وثنية)، لێك جیا دەبنەوە، وەك لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە[1]، (وطنية) ئەوەیە تۆ هاونشتیمانەکانی

---

(١) بەتایبەت کتێبی {سۆزی نەتەوایەتیی..} بڕوانە: چاپی چوارەمی/٢٠١٨ز، نووسینگەی تەفسیر.

خۆت خۆش بوێن، بەڵام (وثنیة) ئەوەیە مرۆڤ ئەو نیشتیمانەی خۆی بپەرستێ و، هەر کەسێ لە سەر ئەو نیشتیمانەیە، بۆی دەمارگیر بێ و، لە خەڵکی دیکەی پێ چاکتر بێ، با چاکتریش نەبێ، دەمار گیریی بریتیە لەچی؟ بریتیە لەوە کە تۆ خراپی خەڵکەکەی خۆت، پێ لە چاکی خەڵکی دیکە باشتربێ، یان خراپی خۆت، پێ وەك چاکی خەڵك بێ، ئا ئەوە دەمارگیرییە، ئەگەرنا تۆ چاکی خەڵکی خۆتت خۆش بوێ و، ستەمی بۆ لە خەڵکی دیکە نەکەی و، ئەوانیشت خۆش بوێ، ئەوە قەیناکات، ئینسان دەبێ خەڵك و نزیکانی خۆی خۆش بوێن، بۆ وێنە: ئەگەر لە چوار چێوەی کۆمەڵی ئیسلامییدا برا و خوشکەکانی خۆمان خۆش بوێن و، ڕێزیان لێ بگرین، بۆیان دڵسۆز بین، چ گرفتی نیە، بەڵام نەڵێین: ئەوانەی ئێمە هەرچەندە لەچاکەشدا لەگەڵ لایەنێکی دیکە، لەگەڵ خەڵکێکی دیکە، وەك یەکن، بەڵام ئەوانەی خۆمانمان پێ چاکترە! نا، دەبێ چاکەکان وەك یەك تەماشا بکەین، خراپەکانیش وەك یەك.

زانایان دەڵێن: دادگەریی (عدل) بریتییە لە: {التسویة بین المتماثلین، والتفرقة بین المختلفین} ئەو شتانەی وەك یەکن، بە یەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین و، ئەو شتانەی کە لێك جیان، مامەڵەی جیاوازیان لەگەڵدا بکەین، ئەوە دادگەرییە.

**چەند قسەیەکی گرنگی زانایەکی فەرموودەناسی هاوچەرخ:**

(عبدالله بن یوسف الجدیع) کەوەك پێشتریش باسم کرد، زانایەکی فەرموودەناسی ئەم ڕۆژگارەیەو، کۆمەڵە کتێبێکی باشی هەن، یەکێك لە کتێبەکانی: (أضواء علی حدیث افتراق الأمة) {چەند تیشکێك بۆ سەر فەرموودەی پەرتەوازەبوونی ئۆممەت} لەوێدا لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە کە: ئایا موسوڵمانان بۆیان ڕەوایە جگە لە ناوی موسوڵمانەتیی ناوونیشانێکی دیکە بۆ خۆیان بەکاربێنن؟ ناوونیشانێکی دیکە بۆ خۆیان بەکاربێنن، بەو واتایە نا، وەك (ابن تیمیة) گوتی: ئەوە فلان مەزهەبە و، ئەوە فلان تەریقەتە و، ئەوە خەڵکی فلان شارە، بەبێ دەمارگیریی، بەڵکو دەمارگیرییشیان بۆی هەبێ، ئایا دروستە؟ لەوبارەوە دەڵێ:

{إن قواطع الأدلة من الكتاب والسنة جاءت بالأمر بالإجتماع والوحدة، ومنعت من التفرق والإختلاف، وذلك تحت شعار الإسلام لا غير، قال تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٩﴾ ﴾آل عمران، وهذا الإسم كافٍ لاحتواء جميع من انتمى إليه، وبمجرد هذه النسبة، تثبت أحكام الولاء والبراء، وَمَنْ ثَبَتَتْ له، لم تُزَلْ عنه إلا بيقين، فيلحق بعده بغير المسلمين، ومجرد هذا الإسم مُلْزِمٌ لكل من انتمى إليه، أن يكون على صفة أهله المبيّنة، بأيسر عبارة في الكتاب والسنة، يدركها الأعرابي الأمي، كما يفهمها الفقيه المتخصص، لكن فينا اليوم طوائف من الناس لاتُقنِعُهم هذه النسبة، حتى يقولَ قائلهم: لايكفي مجرد الإنتساب للإسلام، حتى تقول: أنا من أهل السنة والجماعة، ويعَلِّلُ ذلك بأن أهل السنة، وأهل البدعة، يتفقون في الإنتساب إلى الإسلام، فكيف يتميز الحق من الباطل، والبدعة من السنة، إن لم يكن بإنتمائها المميِّزِ له عن أهل البدعة، فجاء غيره فرأى طوائف من الناس انتسبت إلى السنة، وهي من أهل البدع، فقال: (لا يَكفي أن تنتمي إلى أهل السنة، حتى تقول على منهج السلف)، بنفس العلة السابقة لصاحبه، فافترق مُدَّعو السلفية في سلفيّتهم، فجاء ثالث ليقول: لايكفيك أن تكون سلفيًا حتى تقول: على منهج فلان وفلان، ويُسمِّي شيُوخَهُ}[١].

واتە: بەڵگە یەکلاییی کەرەوەکان لە قورئان سوننەت فەرمانیان کردوە، بە کۆبوونەوە و یەکڕیزیی و، ڕێیان گرتوە لە پەرتەوازەیی و ڕاجیایی و ناکۆکیی، ئەویش هەمووی لە ژێر ناوونیشانی ئیسلامدا، جگە لەوە نا، وەك خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ .. ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمران[٢].

ئەم ناوەش بەسە بۆ ئەوە کە: هەموو ئەوانەی پاڵ دەدرێنە لای، کۆیان بکاتەوەو، بەتەنیا بەو ناوە، هەموو یاسایەکانی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی

---

(١) أضواء على حديث افتراق الأمة، ص ١١٢، ١١٣.

(٢) پێم وایە ئەگەر ئایەتەکەی سووڕەتی حەجی هێنابایە: ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾، باشتر بوو.

دەچەسپن و، هەرکەسێك ئەو ناوەی بۆ چەسپی، ئەو ناوەی لە سەر لاناچێ مەگەر بەبەڵگەیەکی دڵنیاکەر، ئەو کاتە بە نامسوڵمانانەوە پەیوەست دەکرێ بەبەڵگەیەکی دڵنیاکەر، ئنجا تەنیا ئەم ناوە: (واتە: ناوی مسوڵمانەتیی، ئیسلام) پابەندکەرە بۆ هەرکەسێك پاڵ دەدرێتە لای، کە دەبێ بە پێی ئەو خەڵکە بێ کە سیفەتەکانیان بە ڕوونیی بەیان کراون لە قورئان و سوننەتداو، ئەوە کابرایەکی ئەعرابیی نەخوێندەوار تێی دەگات، هەروەك چۆن بابایەکی شارەزای پسپۆڕیش تێی دەگات، {بۆ وێنە: کە گوتت: مسوڵمان! مسوڵمان، ئەهلی ئیسلام! ئەهلی ئیسلام} بەڵام ئەمڕۆ کەسانێك هەن لە نێو ئێمەدا {مەبەستی پێ هەندێك لەوانەیە کە خۆیان ناو ناوە: سەلەفیی، زیاتر مەبەستی پێ ئەوانە} ئەم نیسبەتە، ئەم خۆ پاڵدانە لای ناوی مسوڵمانەتیی، قەناعەتیان پێ ناهێنێ، هەتا یەکێکیان دەڵێ: تەنیا خۆ پاڵدانە لای ئیسلام، تەنیا ناوی مسوڵمانەتیی بەکارهێنان، تەواو نیە، تاکو نەڵێی: من لە ئەهلی سوننەت و جەماعەتم!! ئەوەش بەبەڵگە دێنێتەوەو بیانوو بەوە دێنێتەوە، دەڵێ: چونکە ئێستا هەر کام لە ئەهلی سوننەت و ئەهلی بیدعەت، لەوەدا یەك دەنگن، کە خۆیان پاڵدەدەنە لای ئیسلام و، دەگوترێ: مسوڵمان {چ بیدعیی بێ، چ سوننیی بێ} ئنجا حەق و باتیڵ چۆن لێك جیاببنەوەو، بیدعەت و سوننەت چۆن لێك جیاببنەوە، ئەگەر بەهۆی ئەوەوە نەبێ، کە نیشانەیەکی جیاکەرەوە بۆخۆی بەکاربێنێ {بڵێ: من ئەهلی سوننەتم، یان ئەهلی سوننەت و جەماعەتم}؟!

بەڵام لێرە ڕاناوەستێ و یەکێکی دیکە دێ، تەماشا دەکات خەڵکێکی زۆر دەڵێن: ئەهلی سوننەت و جەماعەتین و، ئنجا لەنێو ئەو بازنەیەشدان و، هەر بە ئەهلی بیدعەتیش لەقەڵەم دەدرێن، ئەویش دەڵێ: ئەوە تەواو نیەو، بەتەنیا بەوەندە مەدار ساز نابێ، بڵێی: من ئەهلی سوننەتم، هەتا نەڵێی: لەسەر مەنهەجی سەلەفم، بەهەمان هۆکای پێشێ {ئەوەی پێشێ، ناوی لە خۆی نا: سوننیی، بۆ ئەوەی خۆی لە ئەهلی بیدعەت جیابکاتەوە، ئەمەشیان ناو لەخۆی دەنێ: لە سەر مەنهەجی سەلەف، بۆ ئەوەی خۆی لەو سوننییانە جیابکاتەوە، کە تووشی بیدعەت بوون} ئنجا دواییش بانگەشەکەرانی سەلەفییەتیش لە

سەلەفییەتەکەیاندا پەرتەوازە دەبن و یەکێکی سێیەم دێ، دەڵێ: ئەوەندەت بەس نیە، ناو لە خۆت بنێی سەلەفیی {چونکە لە نێو سەلەفییانیشدا، سەلەفیی ئەلبانیی هەیە، بن بازیی هەیە، هی یەمەنیی هەیە، هی عێراقیی هەیە، سەلەفیی حیزبیی هەیە، هی ناحزبیی هەیە، هەرخوایان یەکە}، بۆیە دەبێ بڵێی: لە سەر مەنهەجی فلانکەس و فلانکەسم و ناوی شێخەکانی دێنێ! قسەکەی زۆر جوانە بەڕاستیی، ئەوە هەرگیز تەواو نابێ، دەبێ مسوڵمانان وەك (ئەمیبا)[1] هەر خەریکی دابەش بوون و پەرتەوازە بوون بن.

کەواتە: چارەسەر هەر ئەوەیە، کە ئێمە ئەو ناوەی خوا لێی ناوین، هەر ئەو ناوە بەکاربێنین، ئێمە مسوڵمانین: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، تۆ چیی؟ منیش مسوڵمانم، ئنجا هەیە مسوڵمانی باشە و، هەیە مسوڵمانی خراپ.

وەك خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴿٣٢﴾﴾.

واتە: دوایی کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو کەسانەی هەڵمان بژاردبوون لە بەندەکانمان، هەیانە ستەمیان لە خۆی کردووە، هەیانە میانجییەو، هەیانە پێشکەوتۆتەوە لە چاکەکارییدا بە مۆڵەتی خوا.

دوایی دەگونجێ پۆلێن بکرێن، بەڵام دەبێ یەك ناو بەکار بهێندرێ، کە ناوی مسوڵمانەتییە، وەك خۆناساندن، ئەمما دوایی لە نێو بازنەی مسوڵمانەتییدا، ئەوە کۆمەڵی ئیسلامییە، ئەوە یەکگرتووە، ئەوە فلان تەریقەتە، ئەوە فلان مەزهەبە، ئەوە خەڵکی فلان شارە، ئەوە فلان هۆز و عەشیرەتە، هیچ کێشە نیە؟ گرنگ ئەوەیە دەمارگیریی بۆی نەبێ و، نەیکاتە بناغەیەك دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی لەسەر بکات، ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی، ئایا هەرچی کۆمەڵی ئیسلامیی بێ، هەمووی چاکە و، ئەوەی دەرەوەی کۆمەڵی ئیسلامیی

---

(١) (ئەمیبا) ژیانداریکی یەك خانەیی (وحیدة الخلیة)یەو دەبێتە دووان وچوارو هەشت و ...هتد.

خراپە؟! ئەگەر بڵێین: بەڵێ، ئەوە ئەو دەمارگیرییەیە کە لێی دەترسێین و بێگومان هەڵەیە.

هەروەها لە بازنەیەکی بەرینتردا: ئایا هەرچی گوتی: مسوڵمانم، هەمووی چاکەو هەرچی سیفەتی باشە، لە مسوڵمانانندا کۆبۆتەوەو، هەرچی سیفەتی خراپیشە، لە نامسوڵمانانندا کۆبۆتەوە؟ بێگومان: نەخێر، ئەوەش وانیەو، هەیە نامسوڵمانیشە، بەڵام سیفەتی باشی هەن و، هەیە مسوڵمانیشە، بەڵام سیفەتی خراپی هەن، بەڵێ ئەگەر مسوڵمان ئەگەر بەڕاستیی مسوڵمانی باش بێ، هەموو سیفەتەکانی باش دەبن، بەڵام مسوڵمانەکان هەموویان مسوڵمانی ڕاست و ساغ نین، چونکە هەرچی عەلمانیی و خەڵکی دیکەش هەیە، لە وڵاتی ئێمە و وڵاتانی دیکەشدا، ئەوانیش هەموویان لەسەر ئیسلام حیسابن، ئنجا ئایا دەبێ ئەوانە بکرێنە پێوەر بۆ مسوڵمانەتیی؟ نەخێر، چونکە ئیسلام لەسەریان قەرزار بۆتەوە!

**زاراوەی (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) و نازناوی سەلەفیی:**

(عبدالله بن یوسف الجدیع) لە بارەی زاراوەی {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}، کە ئایا لە چییەوە هاتوە، ئایا زاراوەیەکی شەرعییە، یان بیدعییە؟ هەروەها لەبارەی لەقەبی سەلەفییەتەوە، هەندێ قسەی دیکە دەکات، دەڵێ:

{ أ- حول نسبة (أهل السنة والجماعة):

ما أصل هذا التركيب؟ وهل هو مصطلح شرعي أم بِدعيٌّ؟ هذا التركيب لا يُعْرَفُ وروده في الكتاب والسنة، كاسمٍ عَلَمٍ لطائفة من الناس، ويُروى في تفسير قوله تعالى ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ آل عمران، (تبيضُّ وجوه أهل السنة، وتسودُّ وجوه أهل البِدَع)، وروي في حديث مرفوع وموقوف، ولايصحُّ، بل الأشبه أن يكون موضوعاً، ولو صحَّ، فليس فيه أنه أريد به لقبٌ لطائفةٍ مخصوصة، إنما عَنِيَ به عامة أهل الإسلام، الذين لم يزالوا على المتابعة للنبيّ والبقاء مع جماعة المسلمين.

ب- حول لقب السلفية:

أصل هذا اللقب: النسبة إلى (السّلف)، ولم يُعْرَفْ في تأريخ المسلمين كلقبٍ تتميّز به طائفةٌ من الناس إلى عصرنا الحاضر، وإنما استعمل في كلام العلماء على غير سبيل النسبة، وأريد به منهاج الجماعة الأولى، واتّباعها العاصِمِ من التفرق، ويقصره كثير من العلماء على قرون الخيرية التي قال فيها النبي (صلى الله عليه وسلم): {خَيْرُ أُمَّتِي الْقَرْنُ الَّذِينَ يَلُونِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ } أخرجه مسلم برقم (٢١٠)، وهي جيل الصحابة والتابعين، وأتباع التابعين.

مع أن لفظ (السلف) أعم في معناه من ذلك، لكنهم حين أرادوا به معنى مخصوصاً، قصروه عليه، ولا يفترق في معناه عن المعنى الذي استخدم له لفظ (الجماعة)، والإعتقاد والمنهج والهدْيُ الذي كانوا عليه، هو الحق الذي لا تُسْعَد الأمة إلاّ به، وهذا المعنى ليس من حق طائفة أوأخرى أن تستقلّ به، إنه معنى ومضمون، وليس زَيّاً أو شكلاً، وأنت تَعْجِز أن تصنع من المعاني تماثيل، مهما تصوّرتها، ومن ثمّ فَتَعْجِزُ أن تجعل ذلك المعنى العظيم قابلاً للتجسُّد في بدنك لتقول: (أنا سلفيٌّ)}![1].

واتە: ئەم زاراوەیە: (أهل السنة والجماعة) نە لەقوڕئان و نە لەسوننەتدا نەهاتوە[2]، ئەم تەرکیبە لە قوڕئان سوننەتدا نەهاتوە، وەك ناوێکی عەلەم بۆ کۆمەڵێك لە خەڵك کە پێی بناسرێن.

لەمانا لێدانەوەی قسەی خوای بەرزدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾ ئەمە گێڕدراوەتەوە، کە هەندێك دەیبەنەوە بۆ (إبن عباس) لە تەفسیرەکاندا، کە گوایە گوتوویەتی: {(تَبْيَضُّ وُجُوهٌ ) أهل السنة، (وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ) أهل البدعة}، ڕووی ئەهلی سوننەت سپی و ڕۆشن دەبێ و، ئەوانەی ئەهلی بیدعەتن، ڕوویان ڕەش دەبێ، ئەم قسەیە هەم بە مەرفووعی گێڕدراوەتەوە، {(مرفوع) واتە: پاڵدراوەتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)}، هەم بەمەوقووفی، {واتە: گەیەندراوەتە هاوەڵ و بەرز نەکراوەتەوە بۆلای پێغەمبەر

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ١١٤- ١١٩.

(٢) یەکێکتان نەڵێ: ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ (٣٨) ﴾ الأحزاب، هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {علیکم بسنتي} واتە: (علیکم بطریقتي)، چونکە مەبەست لە هیچ کامیان، ئەم واتایە نیە.

(صلى الله عليه وسلم)} بەڵام نە بەمەوقووفیی و نە بەمەرفووعیی، ڕاستە {واتە: نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، نە هاوەڵ}، بەڵکو زیاتر وا پێدەچێ هەڵبەستراو بێ[1]، ئنجا ئەگەر ڕاستیش بێ، بەڵگەی تێدا نیە لەسەر ئەوە کە ببێتە نازناو بۆ خەڵکێك کە پێوەی بناسرێن، کۆمەڵێکی دیاریی کراو، بەڵکو بەگشتیی مەبەست پێی ئەهلی ئیسلام بووە، ئەوانەی کە بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەوتوون و، لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵماناندا ماونەوە.

{ئەوە بەنسبەت ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە، بۆیەش من لەسەرەتای دەرسەکانمەوە، قسەی ئیمام ئەحمەدو هەموو ئیمامەکانم هێنا کە دەڵێن: جەماوەری مسوڵمانان، ئەوانەن کە هیچ نازناوێکیان نیە، هەر مسوڵمان و تەواو، بەڵام ئەهلی بیدعەت ناویان لە خۆیان ناوە: شیعە و خەواریج و مورجیئە و قەدەرییە و ئەوانە، ئەمما زۆربەی مسوڵمانان ناوێکی دیکەیان لە خۆیان نەناوە}.

بەنسبەت نازناوی سەلەفییەتەوە: بناغەی ئەم نازناوە، پاڵدانە بۆلای وشەی سەلەف، سەلەف یانی: پێشین، ئەوەی کە لەپێشەوە بووەو، لە مێژووی مسوڵماناندا هیچ کۆمەڵێك لە مسوڵمانان، هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە، بەم نازناوە نەناسراوە. {بۆ زانیارییتان بزووتنەوەی وەهابیی وەك دوایی باسی دەکەم، دەزانن ناویان چی بووە؟ (أهل التوحيد) بەڵام خەڵك پێی گوتوون: وەهابیی، بۆخۆشیان نەیان گوتوە: سەلەفیی، بەس گوتوویانە: ئێمە لە سەر ڕێبازی سەلەفین، بەڵێ ئەم وشەیە بەکارهاتوە: لەسەر ڕێبازی سەلەفی باش (على منهاج السلف الصالح)، بەڵام کەس نەیگوتوە من سەلەفییم، لەوە عاقڵتر بوون، بێن خۆیان لەو هەموو مسوڵمانانە جیا بکەنەوەو بڵێن: بەس ئێمە بەدوای سەلەفی صالح

---

(١) هەرواشە، چونکە ئەهلی سوننەت و بیدعەت، کەی پەیدابوون؟ دوو سێ سەدە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەدی چۆن خوای پەروەردگار باسی ئەهلی بیدعەت دەکات لەوێدا؟! ئایەتەکە مەبەست پێی گشتییە، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئەهلی ئیمان ڕوویان سپیی و نوورانیی دەبێ و، ئەهلی کوفر ڕوویان ڕەش دەبێ، ئیدی بۆچی دەیبەیە سەر موعتەزیلەو مورجیئە و ئەوانە، خوای پەروەردگار باسی ئەو وردە بابەتانەی نەکردوە!!

کەوتووین، بۆچی خەڵکی دیکە بەدوای هەڵلای مام کوێخا کەوتوە؟! ئەدی ئێمە بەدوای سەلەفی صالح ناکەوین؟ ئەو سەلەفی صاڵحەت بۆچی لەسەر خۆت تاپۆکردوە، ئنجا تۆ تا چ ڕاددەیەك ڕاست دەکەی؟ ئنجا چۆن دەبێ ئینسان هێندە مەدحی خۆی بکا، بڵێ: هەر من دوای پێشینی چاك کەوتووم؟ بێگومان هیچ زانایەکی موعتەبەر و، عاقڵی پێشێ، شتی وای نەگوتوە، هی دواییش، ئەوە شتێکی دیکەیە!}[1]

ئنجا کە لەقسەی زانایاندا بەکارهاتوە، بۆ پاڵدران (نسبة) بەکار نەهاتوە {بۆ کۆمەڵێکی دیاریی کراو}، بەڵکو بەکارهێنراوە بۆ بەرنامەی کۆمەڵی یەکەم، {کۆمەڵی سەرەتای ئیسلام گوتوویانە: ئەوان پێشین بوون}، ئەوانەی کە بەدوای ئەو ڕێبازە کەوتوون، کە پارێزەر بووە لە پەرتەوازەیی، زۆریش لە زانایان ئەو نازناوەیان کورت هەڵێناوە لەسەر {سێ} سەدە چاکەکان، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: باشترینی ئۆممەتم ئەو سەدەیەن، کە لە دوای من دێن، دوایی، ئەوانی دوای ئەوان، پاشان ئەوانی دوای وان {کە بەپێی ئەوە جیلی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و، شوێنکەوتووان (تابعين) و شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، (أتباع التابعين) دەگرێتەوە}، هەرچەندە وشەی (سلف) مانایەکەی گشتیی ترە {ئێستا بەنسبەت ئێمەوە: جیلی پێش ئێمە، سەلەفی ئێمەن و، جیلی پێش وان، سەلەفی وان بوون}، بەڵام ئەگەر بە مانایەکی تایبەت بەکار بهێندرێ {واتە: ئەو سێ سەدەیە}، ئەو کاتە وشەی (سلف) لەگەڵ وشەی (جماعة)و ئەو ئیعتیقاد و ڕێبازو بەرنامەیەی لە سەری بوون، هەموویان یەك واتا دەگەیەنن، ئەویش ئەو هەقەیە کە: ئۆممەت تەنیا بەوە بەختەوەر دەبێ {واتە: ئەو ڕێباز و ڕێو شوێنە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گرتوویەتە بەر، هاوەڵانیش بەدوایداو شوێن کەوتووان و شوێنکەوتووانیشیان بەدوایاندا، ئەو سێ سەدەیە}، ئەم مانایەش {واتە: گرتنی ڕێبازی پێشینی چاك} هیچ کۆمەڵێك لە مسوڵمانان بۆی نیە بڵێ: من پێی

---

(١) ئەوەی نێوان کەوانەکان {} زیادەی خۆمە.

تایبەتمەندترم و بڵێ: ئەو ناوە تەنها بۆمن بەکاردێ، چونکە ئەوە مانایەکەو نێوەڕۆکێکە، نەك شێوە و دیمەنێك، ئنجا تۆ هەرچەندە هەوڵ بدەی، ناتوانی مانایەکان بکەی بەپەیکەرێك، یاخود بیانکەی بەپۆشاکێك و بەبەر خۆتیاندا بکەی، بۆیە ناگونجێ ئەو مانایە مەزنە لە خۆتدا بجەستێنی و بڵێی: من سەلەفییم. {واتە: من بەدوای پێشینی چاك کەوتووم}.

بەندەش ئەوەی دەخەمە پاڵ، دەڵێم:

١)- هەرکەسێك بڵێ: من سەلەفییم، بەو واتایە کە بەدوای پێشینی چاك دەکەوم، ئەوە مەدحی خۆی دەکات، خواش دەفەرموێ:

﴿ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾ النجم.

خۆتان پێ چاك نەبێ، خوا دەزانێ کێ پارێز لەخوا دەکات، زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: ئەگەر پێت گوترا: ئایا تۆ بڕواداری؟ دەبێ بڵێی: (إن شاء الله) ئەگەر خوا حەز بکات ئیماندارم، بەڵام ئەگەر پێت گوترا: ئایا تۆ مسوڵمانی؟ دەبێ بڵێی: بەڵێ، چونکە مسوڵمانەتیی: شایەتمانە، هێناوتە و، نوێژە، دەیکەی و، ڕۆژووی ڕەمەزانە، دەیگری و، زەکاتە، دەیدەی و، حەجە دەیکەی، بەڵام کە گوتت: بڕوادار (مؤمن)م یانی: لە لای خوا پەروەردگار بەهەشتم بۆ دانراوە، ئنجا ئایا ئەوە: ناکاتە مەدحی خۆکردن و، ناکاتە ئەوەی کە تۆ بانگەشەی غەیب دەکەی، کە خاتیمەت بەخێر دەبێ؟!

٢)- ئنجا بابای سەلەفیی کە دەڵێ: من لەسەر ڕێی سەلەفی صاڵحم! ئایا ڕاست دەکات؟! سەلەفی صاڵح هەڵوێستیان، ئەخلاقیان، هەڵسوکەوتیان، عیبادەتیان، تاعەتیان، تێگەشتنیان، برایەتییان لەگەڵ خەڵکدا چۆن بووە؟! پێشینی چاك خۆیان پاراستوە لەوەی کە مسوڵمانێك ببوغزێنن، یان مسوڵمانێك بەکەم تەماشا بکەن، بەڵام زۆر لەوانەی کە خۆیان ناو دەنێنن سەلەفیی، خۆیان بەزل دەگرن و بەچاوی کەمتر تەماشای خەڵکی دیکە دەکەن!

٣)- ئنجا وێڕای خۆ پەسندیی: ئەم جۆرە ناو لەخۆنانە، خۆ جیاکردنەوەشە لە مسوڵمانان.

بەڵام ئەگەر سبەینێ حیزبێکی سەلەفیی لەم هەرێمی کوردستانە لە عیراق، لەهەر جێیەکی دیکەی دنیادا، دروست بێ، ئەو کاتە هیچ گرفتی نیە، چونکە حزبێکی سیاسییە، بەڵام ئێستا کە دەڵێ: من سەلەفییم و وەك دینداریی و مسوڵمانەتییش دەیڵێ، نەك وەك کارو چالاکی حیزبیی و سیاسیی، یانی: تەنیا من شوێن سەلەفی صالح کەوتووم و، خەڵکی دیکە بەدوای سەلەفی صالح ناکەوێ!

بەڕێز گیان! دەگونجێ بەدوای سەلەفی صالح بکەوی و، ناوەکەش لە خۆت نەنێی، هەروەك دەشگونجێ ناویش لە خۆت بنێی و بەدواشیان نەکەوتبی، پاکەتێکی خوێ لە سەری بنووسە: هەنگوین، کە لێت تامکرد، هەر سوێر نیە؟! زانایان گوتوویانە: (العبرة بالمحتويات والمضامين، وليست بالأسماء والعناوين).

# هەشتەم

## خۆپاك و چاككردنی بەردەوام
## ( تزكية النفس )

ئەمیش یەکی دیکەیە لە سیفەتەکانی {زۆربەی مسوڵمانان} کە هەمیشە لەگەڵ نەفسی خۆیاندا خەریکن و، لە شەڕی نەفسیان دڵنیانین.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم ئایەت و فەرموودانە بدەین:

١- خوا سبحانه وتعالى دەربارەی تەزکیەی نەفس، ئاوا دەفەرموێ:

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ الشمس.

واتە: سوێند بە نەفس و بەوەی کە هێناویەتە دی {یان پێکی هێناوەو ڕێکی خستوە}، خراپەکاریی و پارێزکاریی فێرکردوە، بەدڵنیایی ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك و چاك کردوە، سەرفرازە، ئەو کەسەی نەفسی خۆی خستۆتە بن چڵك و چەپەرو زبڵی گوناح و تاوان، پەشێمانە.

٢- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {اللهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا} أخرجه مسلم برقم (٧٣).

واتە: ئەی خوایە! تەقوا بە نەفسم ببەخشە، تۆپاکی بکەو چاکی بکە، تۆ باشترین کەسێکی کە پاك و چاکی بکەی، تۆ سەرپەرشتیار و پشتیوانی نەفسەکەمی.

٣- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ} أخرجه الترمذي برقم (١٩٧٨)، وأحمد برقم (٢١٣٥٤).

واتە: لە هەرشوێنێك و لە هەرحاڵێکدا هەی، پارێز لە خوا بکەو، بەدوای خراپەدا چاکە بکە دەیسڕێتەوەو، بەڕەوشتی جوان مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا بکە.

برا و خوشکە خۆشەویستەکان! {تەزکیەی نەفس} وەك پێشتر ئاماژەم پێدا: هەم لە کتێبی: {ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون} و، هەم لە کتێبی {گیانی ژیان} و، هەم لەو مەوسوعەیەشدا کە بەعەرەبیی نووسیومە[1]، ئەندازەیەکی باشم لەو بارەوە قسەکردوە، ئەو بابەتە بابەتێکی زۆر قووڵەو، بەڕاستی زۆر زۆریش شتێکی بنەڕەتییە، بۆ هەموو مسوڵمانێك، بەتایبەتیی بۆ ئێمەمانان کە دەمانەوێ ئیسلام ببووژێنینەوە، ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگرین و، خەڵك بخەینە سەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، زۆر زۆر گرنگە ئاگامان لەخۆمان بێ، واتە: ئاگامان لەنەفسی خۆمان بێ، چونکە خوا سبحانە وتعالى نەفسی بەشەری وادروست کردوە، دەتوانێ زۆر زۆر بەرز بچێ، جگە لەپلەی پێغەمبەرایەتیی، کە بەخشراو (وهبي)یە و وەدەستهێنراو (کسبي) نیەو، بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرایەتیی کۆتایی پێ هاتوە، جگە لەوە، مرۆڤ هەموو شتێکی لە تواناد هەیە.

---

(١) بڕوانە: (الكتاب العاشر...) الطبعة الثانية.

هەروەها بەرەو خوارێش: مرۆڤـ دەتوانێ زۆر زۆر شۆڕبێتەوەو زۆر خراپ بێ، تەنیا مرۆڤـ ئەو توانایەی هەیە، زۆر جار ئەم وێنەیەم هێناوەتەوە: بەلای چاکەو بەرزییدا: فریشتە بەس دەتوانێ فریشتە بێ، بەلای خراپەو نزمییشدا: (حاشای مەقام) گوێدرێژ هەر دەتوانێ گوێدرێژ بێ، سەگ هەر دەتوانێ سەگ بێ، پشیلە هەر دەتوانێ پشیلەبێ، ئنجا هەرگیز سەگێکت دەست ناکەوێ مقابیلی هەزار سەگ بێ، ئەسپێك نیە بەرامبەری هەزار ئەسپ بێ، بەڵام ئایا مرۆڤـ نیە بەرامبەری هەزار مرۆڤـ؟ بگرە مرۆڤـ هەیە یەك ئۆممەتە:

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ النحل.

هەروەها ئایا مرۆڤـ نیە لەخراپەدا، بتوانێ بەقەدەر هەزار نەفەر خراپ بێ؟ با، مرۆڤی خراپ دەتوانێ لە زۆر دڕندان خراپتربێ، مرۆڤ دەتوانێ لەیەك کاتدا وەك سەگ بێ، سیفەتی خراپی سەگی تێدابێ، وەك گورگ بێ، وەك مەیموون بێ، وەك بەراز بێ، دەتوانێ کۆمەڵێك سیفەتی خراپی کە لە دڕندەکاندا بڵاوکراونەوە، لە خۆیدا کۆیان بکاتەوە.

هەروەك دەشتوانێ لە یەك کاتدا کۆمەڵێك سیفەتی زۆر بەرز و جوان کە هی فریشتانن، لە خۆیدا کۆیان بکاتەوە، بەچی؟ بە حەقیقەت هەربەوە لەگەڵ نەفسی خۆیدا خەریك بێ.

ئنجا وشەی (تزكية) سێ واتان دەگەیەنێ: هەم گەشە کردن و نەش و نما دەگەیەنێ، هەم بژار کردن و پاك بوون، هەم بە پێز بوون و چاك بوون (النموّ، والطّهارة، والصّلاح)، (تزكية) هەرسێکیان دەگرێتەوە[1]، بۆیەش من وشەی {پاکیی و چاکیی}یم، بۆ بەکار هێناوە.

---

(١) المعجم الوسيط، لفظ: (زكى)، ص ٣٩٦.

نۆیەم

## دنیا بەکەمگرتن و دوارِۆژ هەڵبژاردن
## ( الزهد في الدنيا وإيثار الآخرة )

ئەمیش سیفەتێکی دیکەی جەماوەری مسوڵمانانە، کە هەمیشە دنیایان بەکەم گرتووە، دوا ڕۆژیان بەسەر دنیادا هەڵبژاردووە.

دنیا بەکەمگرتن یانی چی؟ زۆر کەس وشەی (زُهد)ی بەهەڵە لێکداوەتەوە، وەك لە هەندێك کتێباندا هاتووە، مامۆستایان زۆرجار دەڵێن: (زهد): دنیا نەویستیی!! بەڵام لەئیسلامدا {دنیا نەویستیی} نیە، ناگونجێ دنیات نەوێ، بەڵام دەبێ دنیا بەکەم بگری، ئنجا ئایا: دنیا بەکەم گرتن، لە گەڵ هەژارییدا پێکەوەن؟ نا، دەگونجێ ئینسان زۆر دەوڵەمەند بێ و، دنیا بەکەمگر (زاهد) بێ و، دەشگونجێ زۆر هەژاربێ و دنیا پەرستیش بێ، بۆیە یەکێك لە زانایان پێناسەیەکی زۆر جوانی زوهد دەکات، دەڵێ: (ليس الزهد أن لا تملك شيئاً، وإنما الزّهد أن لا يملكك شيء) زوهد ئەوەنیە تۆ هیچت نەبێ، زوهد ئەوەیە هیچ شتێك تۆی نەبێ، زوهد ئەوەنیە تۆ خاوەنی هیچ شتێ نەبی، زوهد ئەوەیە هیچ شتێك خاوەنی تۆ نەبێ، تۆ نەبی بە کۆیلەی شتەکان، ئەگەرنا باشتت هەبێ، ئایا دەتوانین بڵێین: پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کە بەیەك جار

هەزار (١٠٠٠) سەر مەڕی بەخشیوە، سەد (١٠٠) حوشتری بەخشیوە، دەتوانین بڵێین: زاهید نەبووە؟! بەڵکو ئەو سەروەری زاهیدان بووە، ئایا دەتوانین بڵێین: داود و سولەیمان سەلامی خوایان لێبێ، کە پادشا بوون، زاهید نەبوون؟ نەخێر زاهید بوون، بەڵێ زۆر دەوڵەمەند بوون، زۆر خاوەن ئیمکانیەت بوون، بەڵام دنیایان پێ کەم بووە، کەسی وا هەیە دنیای هەرنیە، بەڵام دنیای زۆر لەلا گەورەیە، هی واش هەیە دنیاشی زۆر هەیە، بەڵام لە لای بچووکە، ئەگەر دنیایەکەت لە گیرفانتدا بێ و نەیخەیە نێو دڵت، ئەوە مانای وایە ئەگەر زۆریش بێ، هەر لەلات بچووکە، بەڵام ئەگەر خستتە نێو دڵتەوە، ئەگەر زۆر کەمیشت هەبێ، دنیات هەر لەلا گەورەیە، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە دوعایەکدا دەفەرموێ: {وَلَا تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلَا مَبْلَغَ عِلْمِنَا} رواه الترمذي برقم (٣٥٠٢).

واتە: خوایە! دنیا مەکە بەگەورەترین خەفەتمان و، مەیکە بە ئەو پەڕی زانیارییمان، عەقڵمان با تەنیا هەتا ئەوپەڕی سنووری دنیا بڕنەکا، با دنیا وەك خۆی ببینین.

بەڵام بێگومان دنیا نەویستیی لە ئیسلامدا نیە، دنیا نەویستیی واتە: تۆ دنیا ڕەفز بکەی و پشتی تێ بکەی، کە لە ئیسلامدا شتی وانیە، هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، هاتوون دنیا چاك بکەن، هاتوون دنیا ڕێك بخەن، کەواتە: دنیا زۆر گرنگە لەڕووە مەعنەوییەکەیەوە، ئەدی ئەو ئایەتانەی کە دەفەرموون:

﴿ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ محمد.

﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنعام.

مەبەستی پێیان چییە؟! ئەمە لەڕووە ماددییەکەیەوەو، بە بەراورد لەگەڵ ناز و نیعمەتی بەهەشتدا، دنیا هیچ نیە، دەبێ لێمان تێك نەچێ، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {مَا الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَذِهِ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ تَرْجِعُ} أخرجه مسلم برقم (٥٥).

واتە: دنیا لە چاو دوا ڕۆژ، هەر وەك ئەوە وایە یەکێکتان ئەم پەنجەیەی بکا بەئاوی دەریادا، با تەماشا بکات، چی بە پەنجەوە هاتوە؟

ئەوەندە ئاوە تەڕەی کە بەپەنجەیەوە دێ، لەچاو ئاوی دەریادا چەندە، نازو نیعمەتی دنیاش، لەچاو نازو نیعمەتی بەهەشت، ئەوەندەیە.

واتە: وەك بەراورد لەگەڵ بەهەشتدا، دنیا کەم و کورتەو، لەڕووە ماددییەکەیەوە، دنیا کەم و کورتە، بەڵام لەڕووی مەعنەوییەوە، کە دەتوانی خوای تێدا لەخۆت ڕازی بکەی و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەی و، دەتوانی شەریعەتی خوای تێدا جێبەجی بکەی، لەو ڕووەوە: دنیا زۆر گرنگ و گەورەیە، لەبەر ئەوە ناگونجێ وشەی زوهد بە مانای {دنیا نەویستیی} بەکار بهێندرێ و، بەسیفەتێکی مسوڵمانان لەقەڵەم بدرێ و، ئەگەر بویسترێ وەك سیفەتی مسوڵمانان لە قەڵەم بدرێ، دەبێ بە: {دنیا بە کەمگرتن} لێك بدرێتەوەو، ئنجا ڕستەی:

﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ یوسف.

واتە: یوسفیان بە نرخێکی ناتەواو چەند درەمێکی کەم فرۆشت و، لەو بارەیەوە لەبەکەمگران بوون.

هەر ئەو مانایەی ئێمەی هەڵمانبژارد بۆ (زهد) پشتڕاست دەکاتەوە، چونکە ئەوانەی یوسفیان سەلامی خوای لێبێ، وەك کۆیلەیەك فرۆشتوە، خوا خوایان بووە زوو لەکۆڵیان بێتەوە، بەر لەوەی خاوەنی پەیدابێ و لێیان وەربگرێتەوە، بۆیە بەنرخێکی کەم فرۆشتوویانە.

دەیەم

## گرنگیی دان بە کۆمەڵگاو،
## سوور بوون لەسەر دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی

یەکی دیکە لە سیفەت و ئاکارە بەرزەکانی {جەماوەری مسوڵمانان} ئەوە بووە کە گرنگییان بە کۆمەڵگا و دەورو بەری خۆیان داوەو، سووربوون لەسەر ئەوەی بەرژەوەندییەکانی بۆ بێننە دی، بەرژەوەندیی (مصلحة)یش بریتیە لە: (دفع المضرة وجلب المنفعة) لابردنی زیان و وەدەست هێنانی سوود.

با لەو بارەوە سەرنجی ئەم ئایەت و فەرمایشتانە بدەین:

١- خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٧١)دا، ئاوا پێناسەی ئیمانداران دەکات:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾.

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، دۆست و پشتیوانی یەکدین، فەرمان بەشتی پەسند دەکەن و، ڕێگریی لە شتی ناپەسند دەکەن...

یانی: لەگەڵ دەورو بەری خۆیاندا، سەرگەرمی پاكسازیی و چاكسازیین.

٢- لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: ئێوە كۆمەڵێك بن {یان با لە نێو ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن} كە: بانگەواز دەكەن بۆ چاكە، فەرمان بە پەسند دەكەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەكەن و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ} أخرجه أحمد برقم (٤٤٩٥)، والبخاري برقم (٢٢٧٨)، ومسلم برقم (١٨٢٩)، وأبو داود برقم (٢٩٢٨)، والترمذي برقم (١٧٠٥)، وقال: حسن صحيح.

واتە: هەركامێك لە ئێوە چاودێرەو، بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە كۆمەڵگاو دەوروبەرەكەی خۆی.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِالجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الوَاحِدِ، وَهُوَ مِنَ الاِثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الجَنَّةِ فَلْيَلْزَمُ الجَمَاعَةَ} أخرجه الشافعي (٢٤٤/١)، والطيالسي برقم (٣١)، وأحمد برقم (١١٤)، والترمذي برقم (٢١٦٥) وقال: حسن صحيح غريب، وأبو يعلى برقم (١٤١)، وابن حبان برقم (٧٢٥٤)، والدارقطني في العلل برقم (١١١)، والحاكم برقم (٣٨٧) وقال: صحيح على شرط الشيخين. والبيهقي برقم (١٣٢٩٩)، قال الألباني: صحيح، وقال شعيب الأرنؤوط: صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: لە گەڵ كۆمەڵ دابن {لەگەڵ كۆمەڵی مسوڵمانان، جەماوەری مسوڵمانان} و خۆتان لە دابڕان و پەرتەوازەیی بپارێزن، شەیتان لەگەڵ یەك نەفەردا هەیەو لە دووان دوورترە، {واتە: ئەگەر كەسێك بەتەنێ بێ، شەیتان زیاتر زەفەری پێدەباو، ئەگەر دووان بن كەمتر} و

هەرکەسێك نێوەڕاستی بەهەشتی دەوێ، با لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانان و لەگەڵ ئاپۆرای موسوڵمانان دابێ {پەڕیدەو ڕیزپەڕ نەبێ و، خۆی لەوان جیانەکاتەوە}.

**بیروڕای زانایەکی فەرموودەناس لەبارەی کۆبوونەوەی موسوڵمانان لە بازنەی حیزب و ڕێکخراوێکدا:**

(عبدالله بن يوسف الجديع) دەربارەی کۆمەڵ بوونی موسوڵمانان و خۆ ڕێکخستنیان لە ڕێکخراوێدا، لەحزبێکدا، لە کۆمەڵێکدا، دەڵێ:

{الإجتماع مقصودٌ لذاته في دين الإسلام، وفي الوحدة تسليطٌ للشيطان على النفس، والعمل لإعادة بناء الصَّرح أو ترميمه يحتاج إلى مجموعات عمل، فالعمل لهذه الغاية على هذا المعنى مطلوبٌ من عامة أهل الإسلام، وحيث لاتوجد للمسلمين الجماعة الكبرى التي يندرج تحتها عامَّةُ المسلمين، ولاتوجد القيادة الواحدة، فلا بد من العمل على تحقيق ذالك...

فما كان من عمل في حركة إصلاحية، أو جماعة معيَّنةٍ، أو جمعية خيرية، أو منظمة، لتحقيق هذا الغرض فهو مطلوب بشرطين:

١- أن يكون منهاج تلك الحركة، قائماً على الكتاب والسنة، ومنهاج جماعة الأولى.

٢- وأن يَسْلَم من العصبيّة لتلك الحركة أو الجماعة، وذلك بحفظ الولاء والنصيحة لجميع المسلمين وسلامة الصَّدر لهم، والحذر من سحر الرئاسة وحب الصَّدارة، فتلك آفة مفرِّقة أعظم تفريق...}[١].

واتە: کۆبوونەوە ئامانجێکی ویستراوە لەخودی خۆیدا لەدینی ئیسلامداو، ئەگەر ئینسان بەتەنێ بێ، ئەوە شەیتان بەسەر خۆیدا زاڵ دەکات، بۆیە کارکردن بۆ بنیات نانەوەی بینای ئیسلام، پێویستیی بەکۆمەڵێ خەڵك دەکات، کە کاری هەرەوەزیی بکەن، بۆیە کارکردن بۆ ئەم مەبەستەو بەم مانایە، لە کۆی موسوڵمانان داواکراوە { کۆی موسوڵمانان دەبێ کاربکەن بۆ هێنانەوەی ئیسلام }، ئنجا مادام

---

(١) أضواء على حديث افتراق الأمة، ١٣١-١٣٢.

ئێستا مسوڵمانان کۆمەڵە گەورەکەیان نیە، { ئۆممەت بەمانا سیاسییەکەی نیە، بەمانا فیکرییەکەی هەیە، بەڵام بەمانا سیاسییەکەی نیە، کە قەوارەیەکیان هەبێ: هەموو مسوڵمانان بێنە ژێر سایەیەوە }[1]، هەروەها یەك قیادەشیان نیە، بۆیە پێویستە کار بکرێ بۆ هێنانەدی ئەوە { کە هەم ئەو قەوارە سیاسییە دروست بکرێتەوەو، هەم مسوڵمانان بچنەوە ژێر سایەی یەك فەرماندەیی }، ئنجا هەرکارێك بکرێ لە جووڵانەوەیەکی چاك سازیی، یان کۆمەڵێکی دیاریی کراو، یاخود ڕێکخراوێکی خێرخوازیی، یاخود ڕێکخراوێکی سیاسیی، بۆ هێنانەدی ئەو ئامەنجە، ئەوە شتێکی داواکراوە لە ڕووی شەرعییەوە، بەڵام بەدوو مەرج:

١- بەرنامەی ئەو جموجۆڵە، ئەو کۆمەڵە، ئەو ڕێکخراوە، لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت داندرابێ و، لەسەر بەرنامەی کۆمەڵی ئیسلامیی یەکەم { واتە: سەرەتای ئیسلام }.

٢- هەروەها ئەو خەڵکە سەلامەتیش بن لە دەمارگیریی {بۆ کۆمەڵ و حیزبەکەیان} ئەویش بەوە کە دۆستایەتیی خۆیان و، دڵسۆزیی خۆیان، بۆ هەموو مسوڵمانان بەرجەستە بکەن، دڵیشیان لەگەڵ هەمویاندا ساف و ساغ بێ و، خۆشیان بپارێزن لە جادووی سەرۆکایەتیی و خۆشویستنی لە پێشەوە بوون، چونکە ئەوە دەردێکە زۆر دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی.



---

(١) نێوان کەوانەکان { } زیادەی خۆمە.

# یازدەیەم

## تەبایی و گونجاویی
## ( الألفة والإنسجام )

{جەماوەری موسوڵمانان} هەمیشە ئەم سیفەتەیان لەخۆیاندا هێناوەتە دی، بە درێژایی مێژووو ئێستاش: ئەوانەی کە چاك بەڕێی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشتوون، تەبا و گونجاو بوون لەگەڵ خۆیاندا و، لەگەڵ دەورو بەریاندا.

با سەرنجی ئەم ئایەت و فەرموودانە بدەین لەو بارەوە:

١- خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتەکانی (٦٢و٦٣)دا، دەفەرمویٚ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە تۆی بەهێز کردوە (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) بەهۆی یارمەتیی خۆی و، بەهۆی بڕوادارانەوەو، دڵی بەیەکەوە

جۆش داون، کە ئەگەر هەرچی سەروەت و سامان لە دنیادا هەیە، بەخشیباتایە، بۆ ئەوەی دڵیان ئاوا پێکەوە گرێ بدەی، نەتدەتوانی دڵیان ئاوا پێکەوە گرێ بدەی، بەڵام خوا دڵی بەیەکەوە بەستوون {واتە: بەهۆی ئیمانەوە}، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا، لەو بارەوە دەفەرموێ: {إِنَّ أَحَبَّكُمْ إِلَيَّ: أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا, الْمُوَطَّئُونَ أَكْنَافًا, الَّذِينَ يَأْلَفُونَ وَيُؤْلَفُونَ, وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ: الْمَشَّاءُونَ بِالنَّمِيمَةِ, الْمُفَرِّقُونَ بَيْنَ الْأَحِبَّةِ, الْمُلْتَمِسُونَ لِلْبُرَآءِ الْعَنَتَ (الْعَيْبَ)} أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٧٦٩٧)، وفي الصغير برقم (٨٣٥)، وقال الألباني حسن لغيره.

واتە: خۆشەویستترتان لەلای من: ڕەوشت جوانترینتانە، ئەوانەی کە شانیان نەرمە {(كَنَف) بەمانای شان دێ، یانی: لەگەڵ خەڵك خۆ بەرزناکەنەوە، خۆیان پێ لەوان زلتر نیە، نەرمن ئارامن، هێمنن}، ئەوانەی کە خەڵك لەگەڵ خۆدا دەگونجێنن و، لەگەڵ خەڵکیشدا دەگونجێن {کەسی وا هەیە دەتوانێ خەڵك لەگەڵ خۆی بگونجێنێ، بەڵام ناتوانێ لەگەڵ خەڵکیدا بگونجێ! دەبێ هەردووك سیفەتەکە هەبن}، هەروەها بوغزێندراوترتان لە لای من: ئەوانەن کە قسە لەبەینی خەڵکدا دێنن و دەبەن، ئەوانەی کە خۆشەویستان لێك دەکەن، ئەوانەی کە عەیب بۆ خەڵکی بێ عەیب دەدۆزنەوە.

٣- لە فەرماییشتێکی دیکەدا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْمُؤْمِنُ مُؤَلِّفٌ، وَلَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يَأْلَفُ، وَلَا يُؤْلَفُ} رواه أحمد برقم (٩١٨٩)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٧٦٥٨). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

واتە: ئیماندار گونجێنەرەو، خێر لەکەسێکدا نیە، کە نەدەتوانێ خەڵك لەگەڵ خۆیدا بگونجێنێ و، نە دەتوانێ خۆی لەگەڵ خەڵکدا بگونجێنێ.

لێرەوەش دەڵێم: بەڕاستی ئینسانی ئیماندار، دەبێ تەباو گونجاو بێ، بەتایبەتیی هەر کۆمەڵێك لەنێو خۆداو، لەگەڵ خەڵکی دیکەشدا دەبێ هەروابن، مسوڵمان نابێ وەك داری چاك نەکراو وابێ، نابێ وەك بەردی سێ چوار سووچ وابێ، تەسبیحێك دەنکەکانی بۆچی پێکەوە ڕیز دەبن؟ چونکە هەموویان وەك یەکن، ئەو بینایانە کە دروست دەکرێن، چونکە بلۆکەکان، یان خشتەکان، بەیەك قاڵبن، بۆیە پێکەوە گونجاون، بەڵام ئەگەر هەریەکەیان ڕووی لەلایەك بێ، پێکەوە ناگونجێن!

براو خوشکەکانم! هەتا بۆتان دەکرێ، لەگەڵ ئەهلی ئیماندا گونجاو بن، با بەزەخت لەخۆکردنیش بێ، با بەچاو پۆشیی کردن لە هەندێ تایبەتمەندیی خۆشت بێ، جاری وا تۆ دەچی بۆ شوێنێك لەگەڵ هاوەڵەکانتی، ئەوان کەیفیان لەجۆرە خواردنێکە، تۆش کەیفت لەجۆرە خواردنێکی دیکەیە، کەیفەکەی خۆت لابدە، مادام زۆربەیان حەزیان لەو جۆرە خواردنەیە، لەوەی ئەوان بخۆ، نەك هەریەکەتان بە میزاجی خۆی کار بکات، ئەوەش هەمووی بەچی دەکرێ؟ بەوە دەکرێ کە ئینسان کار لەسەر خۆی بکات و، خۆی والێ بکات بگونجێ.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر لەوبارەوە دەفەرموێ: {أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ يَحْرُمُ عَلَى النَّارِ أَوْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ؟ تَحرُمُ عَلَى كُلِّ قَرِيبٍ هَيِّنٍ لَيِّنٍ سَهْلٍ} أخرجه الترمذي برقم (٢٤٨٨)، والطبراني برقم (١٠٥٦٢) و إبن حبان برقم (٤٧٠) وقال الألباني صحيح.

واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم، کێ قەدەغەیە لەئاگر، یان کێ ئاگری لێ قەدەغەیە {ئاگری دۆزەخ}؟ ئاگری دۆزەخ قەدەغەیە لەسەر هەر کەسێکی: نیزیکی، ئارامی، نەرمی، ئاسان، مسوڵمان دەبێ نیزیك بێ لەخەڵك، ئارام بێ، نەرم بێ، ئاسان بێ، ئنجا پێچەوانەی ئەوانە تەماشا بکە: خۆی دوور بگرێ، شڕ و دڕبێ، زبر و ڕەق بێ، قورس و بەزەحمەت بێ، ئەوە پێچەوانەکەیە.

دوازدەیەم

## هەڵبژاردنی ئاسانیی لەبازنەی شەریعەتداو، خۆ و خەڵك سەغڵەت نەکردن

ئەمیش سیفەتێکی دیکەی گرنگی ئەهلی ئیمان و جەماوەری مسوڵمانانە، کە پێی ناسراون و، هەمیشە لەبازنەی شەریعەتدا کامەی ئاسانترە، ئەوە هەڵدەبژێرن، هەڵبەتە نەك تەنیا وەك شوێنکەوتنی مۆڵەت، بەڵام لای ئاسانیی بگیرێ باشە.

ئەمەش چەند ئایەتێکی قورئان و فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە:

١- خوا سبحانه و تعالى لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾.

واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و زەحمەتی بۆتان ناوێ.

٢- لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا، خوا عز وجل دەفەرموێ: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ ﴿٧٨﴾ ﴾.

واتە: خوا لەدینی خۆیدا سەغڵەتی نەکردوون.

٣- دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: {مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَ أَمْرَيْنِ قَطُّ، إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ فِيهِ إِثْمٌ، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ} أخرجه البخاري برقم (٣٥٦٠) ومسلم برقم (٢٣٢٧).

دایکمان عائیشە کە زۆر شارەزا بووە لە ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چونکە هیچ کەس هێندەی ژن مێردی خۆی ناناسێ، هەروەك هیچ کەسیش بەقەدەر مێرد، ژنی خۆی ناناسێ و شارەزای هەڵسو کەوتی نیە، ئنجا دایکمان عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز سەرپشك نەکراوە لە نێوان دوو کاراندا، مەگەر ئاسانەکەی هەڵبژاردوە، ئەگەر گوناح نەبووبێ، ئەگەر گوناه بووبێ، لە هەموو کەس لێی دوورتر بووە.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا، وَلاَ تُنَفِّرُوا} أخرجه البخاري برقم (٦٩)، ومسلم برقم (١٧٣٤)، وأحمد برقم (١٢٣٣٣)، وأبو داود برقم (٤٨٣٥).

واتە: ئاسانکەربن و وە زەحمەت خەر مەبن و، موژدەدەر بن و، سڵەمێنەرەوە مەبن.

کەچی هەندێك مسوڵمان هەن، ڕێك پێچەوانەی ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کار دەکەن!! بۆ وێنە: ئافرەت ئەگەر بۆ خۆی مەترسیی هەبوو، لەوەی نەزەری حەرامی لێبکرێ، دەتوانێ نیقاب بکات و، دەشتوانێ نەیکات، بەڵام ئەوان دەڵێن: دەبێ هەر نیقاب بکات! هەروەها لە هەرشتێکی دیکەدا هەر لایەنە قورسەکەی دەگرن!

بەڕێز! ئەگەر میزاجت تێك نەچووبێ: بۆچی هەر بەدوای قورسەکاندا دەگەڕێی! نەخوا عز وجل وایفەرمووە، نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وایفەرمووە؟! ئەوەتا دایکمان عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتێك کە هەردووك لای بووبن، کامەی ئاسان بووە، ئەوەی هەڵبژاردوە، جاری وابووە بۆخۆی کامەی قورس بووە، ئەوەی کردوە، بەڵام بۆ خەڵك کامەی ئاسان بووە، ئەوەی هەڵبژاردوە.

سبحان الله! ئەو جۆرە کەسانەی کە هەمیشە خەڵك لەقوللەی قاف دەکێشن و، دەیانەوێ دایم سەغڵەتیان بکەن، کەچی بۆ خۆیان نەك هەر ئاسان هەڵدەبژێرن، بەڵکو تووشی حەڕامیش دەبن و، دەربەستیش نین! ئینسان دەبێ بۆ خۆی ئیش بە عەزیمەت بکات، بەڵام بۆ خەڵك ئاسانکاریی بکات، ئەگەر ڕاست دەکەی دینداری چاکی، بۆخۆت کامە عەزیمەتە، ئیش بەوە بکە، شەو نوێژ بکە، ڕۆژووی سوننەت چاك بگرە، خۆت لە هەموو شتێکی گوناهبارکەرو عەیبدارکەر بپارێزە، بەڵام خەڵك لە قوللەی قاف مەکێشەو سەغڵەتیان مەکە!

٥- لەو بارەوە با ئەم دەقەش بێنین: {عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: {إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا}! فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) غَضِبَ فِي مَوْعِظَةٍ قَطُّ أَشَدَّ مِمَّا غَضِبَ يَوْمَئِذٍ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ، فَلْيُوجِزْ فَإِنَّ مِنْ وَرَائِهِ الْكَبِيرَ، وَالضَّعِيفَ، وَذَا الْحَاجَةِ)} أخرجه البخاري برقم (٧٠٢) ومسلم برقم (٤٦٦).

ئەبو مسعود دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من لە نوێژی بەیانیی دوا دەکەوم، بەهۆی فڵان کەسەوە {واتە: ئیمامێك بووە ئەو وەك لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، ناوی هێناوە، بەڵام لێرە ناویان نەبردوە، بۆ ئەوەی نەبێتە غەیبەت}، لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانیمان زۆر بۆ درێژ دەکاتەوە {هەڵبەتە لەم ڕۆژگارەدا، زۆربەی ئیمامەکان، نوێژەکان هەڵدەپرووزکێنن! بەڵام بۆ وێنە: ڕەنگە سووڕەتی {بەقەرە}ی هەمووی لە نوێژی بەیانییدا خوێندبێ} دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاریی کردین، هیچ کاتێك نەمبینیوە لەکاتی ئامۆژگارییدا ئاوا تووڕە بووبێ، وەك ئەو ڕۆژە بینیم، دوایی فەرمووی: خەڵکینە! هەتانە خەڵك دەسڵەمێنیتەوەو دووری دەخاتەوە، هەر کامێك لەئێوە پێشنوێژیی بۆ خەڵك کرد، با نوێژەکەی بەکورتیی و پوختیی بکات، چونکە لە پشتیەوە پیاوی بەتەمەن هەیەو، هی کەم تەمەن هەیەو، هی خاوەن کاریش هەیە.

# سێزدەیەم

## ڕوو خۆشیی و زمان شیرینیی و نەرم و نیانیی

ئەمەش یەکی دیکەیە لە ڕەوشتەکانی ئەو مسوڵمانانەی کە بەدوای پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کەوتوون و، بەدوای هاوەڵانی بەڕێز و خزمانی دڵسۆزی و خەلیفە ڕاشیدەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، کەوتوون.

با لەو بارەوە ئەم دەقانە بکەینە جێی سەرنج و ڕامانمان:

١- خوا سبحانه وتعالى لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٥٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم)) تۆ بەهۆی بەزەیی خواوە، بۆیان نەرم بووی (بۆ هاوەڵانت) و ئەگەر هاتبا و قسە ڕەق و دڵ ڕەق بووای، لە دەورت دەپڕژان.

٢- لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٨٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾ ﴾.

واتە: قسەی چاك لەگەڵ خەڵك بکەن.

٣- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ} أخرجه البخاري برقم (٢٨٢٧)، ومسلم برقم (١١١).

واتە: قسەی خۆش خێرە و پاداشتی هەیە.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِطَعَّانٍ، وَلَا بِلَعَّانٍ، وَلَا الْفَاحِشِ الْبَذِيءِ}، أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم (٣١٢) وأحمد برقم (١٩٧٧)، والترمذي برقم (٣٨٣٩)، والترمذي برقم (١٩٧٧) والطبراني برقم (١٠٤٨٣)، وصححه الألباني.

واتە: ئیماندار تانەدەر و، لەعنەت کەر و، زمان شڕی جنێو فرۆش نیە.

براو خوشکانم! با هەتا بۆمان دەکرێ، هەموومان خۆمان ڕابێنین لەسەر قسەو وشەی جوان، تەعبیری بە نەزاکەت، دەبێ ئینسان خۆی بپارێزێ لە لەعنەت کردن و، زۆر خۆی بپارێزێ لە تانە لێدانی خەڵك، ئیماندار دەبێ دەم پاك بێ.

٥- دیسان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: {إِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ} رواه مسلم برقم (٢٥٩٤).

واتە: نەرم و نیانیی لە هیچ شتێکدا نابێ، مەگەر جوانی دەکات و، لە هیچ شتێکیش دوور ناخرێتەوە، مەگەر ناشیرینی دەکات.

نەرم و نیانیی و هێدیی و مەندیی، ئەوە نیە تۆ ناحەق بۆ خەڵك بکەیە حەق و، حەقیان بۆ بکەی بەناحەق، نا! یان حەڵاڵیان بۆ حەرام بکەی و، حەرامیان بۆ حەڵاڵ بکەی! بەڵکو نەرم و نیانیی ئەوەیە کە حەقیان پێ بڵێی، بەڵام بە شێوەیەکی جوان، هەڵەیەکیش کە لەسەرنی، بۆیان ڕوون بکەیەوە، بەڵام بەشێوەیەکی جوان، نەك بەشێوەیەکی سڵەمێنەرەوە.

٦- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ} رواه مسلم برقم (٢٦٢٦).

واتە: هیچ شتێك لە چاكە بەكەم مەگرە، ئەگەر ئەوەندەش بێ كە بەڕووی خۆشەوە بگەیە برایەكەی خۆت.

هەڵبەتە بۆ خوشكەكەی خۆشت هەروایە، بەڵام لێرەدا دیارە مەجلیس مەجلیسی پیاوان بووە، ئەوەتان لێ تێك نەچێ! زۆر لە فەرمایشتەكان كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی پیاو دەكات، باسی برا دەكات، لەبەر ئەوەیە كە مەجلیسەكە مەجلیسی پیاوان بووە، ئەگەر نا جاری واش هەیە، باسی ئافرەتانیشی كردوە، كە كۆڕو مەجلیسەكە گشتیی بووە.

بەڵێ ڕوو خۆشیی و قسە خۆشیی و گەش و گوڵیی لەگەڵ خەڵكدا، یەكێكە لەسیفەتە بنەڕەتییەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، ئێمەش كە شوێنكەوتووی ئەوین و، ئۆممەتی ئەوین، دەبێ وابین.

# چواردەیەم

## پۆشینی عەیب و عاری خەڵك و، مشور لێ خواردنیان و جێبەجێ کردنی پێداویستییەکانیان

ئەم ئاکاری چوار دەیەم و کۆتاییە: دەگونجێ چەند ڕەوشت و خەسڵەتێکی بەرزو پەسند لە خۆیدا کۆبکاتەوە، گرنگ ئەوەیە مسوڵمان دەبێ هەوڵ بدات عەیب و عاری خەڵك، نەك دەرنەخات، بەڵکو ئەگەر هەشیان بێ، بیپۆشێ، مادام حەقی خەڵکێکی دیکەی تێدا زایە نابێ و، مادام یاسایەك یان سزایەکی شەرعیی تێدا زایە نابێ، هەروەها هەوڵ بدات: مشووریان لێ بخواو، ئەگەر پێداویستییەکیان هەبوو، پێی جێبەجێ بکرێ، بۆیان جێبەجێ بکات.

با تەماشایەکی ئەم دەقە موبارەکانە بکەین:

١- خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٧)دا، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٧٧﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕکووع بەرن و، سەجدە بەرن و، پەروەردگارتان بپەرستن و، چاکە بکەن، بەڵکو سەرفراز بن.

دیارە چاکە بکەن (وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ) هەموو جۆرەکانی سوود بەخەڵك گەیاندن، دەگرێتەوە.

٢- لەو بارەوە فەرمایشتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) زۆر زۆرن، یەکێك لەوانە دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ، كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً، فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} أخرجه البخاري برقم (٢٤٤٢)، ومسلم برقم(٢٥٨٠).

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە {هەروەك مسوڵمان خوشکی مسوڵمانە}، ستەمی لێ ناکات و تەسلیمیشی ناکات {نەبۆخۆی ستەمی لێدەکات، نە تەسلیمی زاڵمێکیشی دەکات، کە پشتی بەربدات: زاڵمەکە ستەمی لێ بکات}، هەرکەسێك پێویستیی برایەکی مسوڵمانی جێبەجێ بکات، خواش پێویستیی ئەو جێ بەجێ دەکات و، هەرکەسێك خەمێك لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ، خوا خەمێك لە خەمەکانی ڕۆژی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ و، هەر کەسێك مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا لەڕۆژی دواییدا عەیبی دەپۆشێ.

چەند موژدەیەکی خۆشە! کەسمان نیە عەیبمان نەبێ، ئەگەر خوا عەیبمان بپۆشێ، بەوەی کە عەیبی مسوڵمان دەپۆشین، ئەوە نیعمەتێکی گەورەیە.

٣- لە فەرمایشتێکی دیکەدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ، قِيلَ مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ، إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ} أخرجه مسلم برقم (٢١٦٢).

واتە: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان، شەشن {لێرەدا باسی شەشیانی کردوە، لە شوێنی دیکەدا باسی پێنج دەکات، لە شوێنی دیکەدا باسی زیاتر دەکات، بە پێی مەقام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی کردوە، ئەگەرنا مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان زیاتریشە، بەڵام بەهەر حاڵ لێرەدا شەشی باس کردوون}.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا کامانەن؟
فەرمووی:

١- ئەگەر پێی گەیشتی سڵاوی لێ بکە {هەوڵبدە تۆ دەست پێشخەربە}.

٢- ئەگەر بانگی کردی وەڵامی بدەوە {نەك هەر بۆ بانگێشت و نان خواردن، هەرکە بانگی کردی، ئیشێکی بەتۆ بوو، وەڵامی بدەوە بە پێی توانای خۆت}.

٣- ئەگەر ڕاوێژی پێ کردی، دڵسۆزیی بۆ بنوێنە {ئەگەر داوای ڕای تۆی کردو ڕاوێژی پێ کردی، چی بۆ ئەو دڵسۆزییە، ئەوەی پێشانبدە}.

٤- ئەگەر پژمی و ستایشی خوای کرد، تۆش بڵێ: (یرحمك الله). {ئەوە (تشمیت)ی پێ دەڵێن}.

٥- ئەگەر نەخۆش بوو سەردانی بکە.

٦- ئەگەر مردیش، شوێن جەنازەکەی بکەوە.

٤- کۆتا فەرمایشت کە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەیهێنین لەو بارەوە، ئەم فەرموودەیە: {مَنْ لاَ یَرْحَمِ النَّاسَ، لاَ یَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ} أخرجه البخاري برقم (٧٣٧٦)، ومسلم برقم (٢٣١٩).

واتە: هەرکەسێ بەزەیی بەخەڵکدا نەیەت، خواش بەزەیی پێیدا نایەت.

**برا و خوشکە بەڕێزەکان!**

لێرە کۆتاییمان هێنا بەتەوەری دووەمی کۆی ئەوبابەتەی کە بریتیە لە (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) ئنجا بەڕێزان! ئەم زانینە بۆ توانینە، دەبێ ئەم حاڵی بوونە، بکەینە حاڵ، خوا یارمەتییمان بدات، هەوڵ بدەین: هەرچی دەیزانین بیتوانین، هەرچی کە وەك هێڵە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانان: بنەما فیکرییەکان، بنەما ئیمانیی و عەقیدەییەکان، بنەما ئاکاریی و ڕەوشتییەکانی زۆرینەی مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر

(صلى الله عليه وسلم)، خوێندوومانە و گوێ بیستی دەبین و دەیزانین، هەوڵبدەین جێبەجێی بکەین، خوا پشتیوان بێ، ئەوجار مانای وایە ئێمە لەسەر ئەم زانیارییەو بەم زانیارییە بەهرەمەندین، ئەگەرنا بەخوا هەرزانیارییەك کاری پێنەکەی، لەسەری قەرزدار دەبیەوەو، هەر زانستێك کاری پێنەکرێ، بەرەکەتیشی نابێ، تەجرەبەی بکەن! مەسەلەیەك فێرببە، وەرە فێری خەڵکی دیکەی بکە، لەمێشکتدا دەچەسپێ، بەڵام کە کارت پێ نەکردو، کارلێکت لەگەڵدا نەکرد، وردە وردە لەمێشکتدا نامێنێ و لە بیرت دەچێتەوە، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هەرچی دەیزانین، کاری پێبکەین و، خۆمانی پێ لە خوا نزیك بخەینەوە، پێشێ خۆمانی پێ چاك بکەین، ئنجا کۆمەڵگا و دەورو بەرمانی پێ چاك بکەین.

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٤ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| ١٥ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٦ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٧ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٨ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ١٩ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٠ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢١ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٣ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٤ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٥ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیرەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٦ | ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٢٧ | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٢٨ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٩ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٠ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣١ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٢ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتیساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | | |
| ٣٣ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٥ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٣٦ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٣٧ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٨ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٣٩ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤٠ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤١ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٤٢ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار** | | |
| ٤٣ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٤ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەڕەبی و فارسییش |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٥ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٦ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٧ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٨ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٩ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٠ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٥١ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٢ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٣ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٤ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥٥ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٦ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٧ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٨ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٩ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦٠ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٢ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٣ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٤ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٧ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٦٨ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٦٩ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٧٠ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧١ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٢ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٧٣ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٤ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٥ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| ٧٦ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٧ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٨ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | | |
| ٧٩ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨٠ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨١ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٢ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سیاسەت و حوکمڕانیی** | | |
| ٨٣ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٤ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٥ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٦ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ٨٧ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٨ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٨٩ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٠ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ٩١ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٩٢ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٣ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ٩٤ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩٥ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زینـدانی داگیرکـەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٦ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ٩٧ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ٩٨ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٩ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٠ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٢ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٣ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٤ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٥ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٦ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٧ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٨ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٠٩ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٠ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١١١ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٢ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٣ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٤ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٥ | خاتوون مەلازن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٦ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٧ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| ١١٨ | موسوعة : الإسـلام كما يتجلى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١١٩ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٠ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢١ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٢ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٣ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٤ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٥ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٦ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٧ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |
| ١٢٨ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٢٩ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٠ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣١ | نقض فكـرة التطـرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٢ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٣ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٤ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٣٥ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٧ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٨ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٩ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٠ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤١ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٢ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٣ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٤ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | **ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن** | | |
| ١٤٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | | |
| | **مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا** | | |
| ١٤٦ | کتێبی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٤٧ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | | |
| ١٤٨ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | | |
| ١٤٩ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | |

# نێوەڕۆك




# هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگار و، واقیعێکدا کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و، بەزیندوویێتی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: لێك دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لە تێوەڕامانی وەحیی و، چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەیبینین.

بەڵێ ئەم واقیعەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، واقیعیکە کە مسوڵمانان - بەشێوەیەکی گشتی- باش نەیانتانیوە کە عەقڵ و هۆشی خۆیانی تێدا بخەنەکار بۆ تێوەڕامانی وەحیی و، سەرنجدانی واقیع...

هیواداریشم ئەم مەوسووعەیە بەهەر پێنچ تەوەرەکەیەوەو، هەوڵ و هەنگاوێکی کاریگەربێ، بۆ گێڕانەوەی مسوڵمانان بەرەو ئەو حاڵەتە پەسندە سروشتییەی، کە نەقڵ و عەقڵ لێیان دەخوازن، بەڵکو لەدەردی وەستان و بە جێماویی دەربازیان بێ.

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice